# فەقێ و فەقێیەتی
## لە کوردستان

سەید مستەفا مەحموودیان (زمزیرانی)





محمودیان، مصطفی، ۱۳۴۱ -
فه قی و فه قیـه تی له کوردستان/ نووسینی مسته فا مه حموودیان (زمزیرانی).. تهران: احسـان، ۱۳۸۱.
۲۴۴، پنجاه ص.: مصور، عکس.
ISBN 964-356-121-6
فهرستنویسی براساس اطلاعات فیپا.
ص.ع. به فرانسه: Mostafa Mahmuodyan
(Zamzirani). Fage u fageyati la kurdistan.
کردی.
کتابنامه به صورت زیرنویس.
۱. حوزه‌های علمیه -- ایران -- کردستان. ۲.طلاب -- ایران -- کردستان.
۳.فقیهان اهل سنت -- سرگذشتنامه. الف.عنوان.
۹ف۳م/BP ۷/۴ ۲۹۷/۰۷۱/۵۵۴۲
کتابخانه ملی ایران ۲۷۷۶۰-۸۱م



نشر احسان

ناوه‌ندی بلاوکردنه‌وه: تاران - نه‌شری ئیحسان ته‌له‌فون ۳۹۰۲۷۵۰

---

نێوی کتێب : فه‌قێ و فه قێیه‌تی له کوردستان
نووسه‌ر : سه‌ید مسته‌فا مه‌حموودیان
پیت چن :پیت چنی کامپیوته‌ری خوسره‌وی ـ بۆکان
بلاکه‌ره‌وه : نه‌شری ئیحسان
هه‌ژمار : ۳۰۰۰ دانه
چاپخانه : چاپخانه‌ی مه‌هاره‌ت له تاران
چاپی یه‌که‌م : سالی (۱۳۸۲) کۆچی، هه‌تاوی.
ژماره‌ی نێوگه‌لانی : ۹۶۴-۳۵۶-۱۲۱-۶ ISBN: 964-356-121-6

# ناوەرۆک

## 

**پاشکۆ**

## پێشەکی

بە نێو و یارمەتی خوای بێوێنە. سپاس و ستایش هەر بۆ ئەوە؛ پاشان: ئەم کتێبەم لە نێوان ساڵەکانی ١٣٦٣ کۆچی هەتاوی تا ١٣٦٥ لە دێی سیسێری ناوچەی سەردەشت نووسیوە، بەڵام لە بەر نەڕەخسانی هەل و دەستەنگی هەر مایەوە. ئێستاش کە بڕیارم‌داوە بە ئەرکی خەڵکیش بێ بیخەمە ئاراوە، پێشکەشی دەکەم بە تێکڕای فەقێ ئازیزەکانی کوردستان.[1] و کوڕی خۆشەویستم عەبدوسسەلام کە تازە چۆتە فەقێیەتی.

سەید مستەفا مەحموودیان زمزیرانی
دانیشتووی حەمامیانبۆکان
١١/١٠/١٣٧٨ کۆچی هەتاوی
١/١/٢٠٠٠ زایینی
١١/ی بەفرانباری (٢٦١٢)ی کوردی

---

١ - جێی باسە کە لە پێداهاتنەوەدا تا ئامادەی چاپ بووەزۆر جێگام گۆڕیوە، هەیە پێمەوە ناوە و هەیە بێ فڕێداوە.



به ناوی خودای به هێز

## «فەقێ و فەقێیەتی»

نوسراو، به قەڵەمی، دەم و دوو زێڕینی مامۆستای فرەزان، جەنابی مەلا سەید موستەفای مەحموودیان، دەرس‌وێژ و خۆش‌وێژی ئێستای گوندی حەمامیان سەر بە شاری بۆکان، رۆژی ۱۳۷۹/۱۲/۲۷ گەیشتە دەستم. بە گەشەوە موتالاّم کرد. لامێردانی دەورانی لە دەس چووم، پێ گوڵباران کرد. یا خوا هەستی و بیری رۆشن و کر و کرداری جوانی بۆ هەمیشە زیندوو بێت. ئامین!

نوسراو لە مەرکەشم و نەشمی نوسەریەوە، پاراو، لە بارەی ناوەرۆکەوە کۆکە و فرە ئاماژەی گرینگم تێیدا هاتە بەرچاو.

«بلبل کـه در حـریم چـمن آشـیانه سـاخت

مقصود او گـل بـود، چـمن را بـهانه سـاخت»

نووسەری بەسەرەدەر، بە بەهانەی حوجرەی قورینە و یاسای ئەو سەردەمی فەقێیەتی‌وە توانیویەتی پێ‌هەڵگەڕێ، هۆی سەرەکی پیلان و گەڕان وەدۆزێ و باڵی گەرچی بگرێ و بە ئێمە و هەموو دۆستانی خۆناس و خوداناسی بناسێنێ. گەشتر بێژم نووسەر ویستوویەتی، قەرەمەشقەڵێک وەرازێنێ، گیانی هۆمید و لەشی هیوای تێدا وەبووژێ و ئەو زرەبایەی کە دین و ژینی تاقمی هەژار و رەش و رووتانی، وەبەر خۆداوە، بە هەموو بابایانی بناسێنێ. تەنانەت، هۆمەنیشی بۆ مامۆستای ناوەستاو فەقێلەی وەستاو و زانای خۆ بە زل‌زان و نەزانی خۆ بە زانازان بردووە. ئۆباڵی گەلی بێ‌پەڕ و باڵ و فەقێلەی ناحاڵی، لە ئەستۆ بەستوون. هۆی زۆربەی خوێندەواری بێ‌رەگ و خوێنی لە کۆڵ شەتەک داون.

نووسەر بەوەشەوە رانەوەستاوە و زۆربەی جێگە پلان و گلان و هەڵدێرەکانی، کە نەیار، بنەڕەتی ئەو دینە پاکەی تێدا هەڵداشتوون، نەترسانە پەنجەی هێرشی بۆ راداشتون و بێ شکۆ، بەکۆمەڵی بە جێ ماوی نیشان داون. ناباری باری فێرگە و زانکۆ و جودایی لە نێوانی خوێندنی دینی و تەکنۆلۆژی و فەننی‌دا خستۆتە سەر ئەستۆی میران و دنەی میرانیشی داوە کە هەستی کە مایەسی خۆیان لە خواوە نەزانن و دەستی خۆیان لە بن سەری ناهومێدی‌دا نەکەنە سەرین و سەربەرزانە مەرزی دین و ژیانی خۆیان بپارێزن. خوێنگە و بنکەی ئایینە پیرۆزەکەیان، بارتەقای تاق و قاتی خوێنگە و زانستگەی میران بەرنەسەر و جیاوازی مووچە و مزەی گزی کاران، لە نێوان هەموو زانست و بار هێنانێکدا هەڵگرن.

گرینگتر لە هەموانی ئەو کەل و پەل و کەرەسەی کە لە مێژووی گەلی کورد هەڵبڕاون و نووسەرێک ئاوڕی لێ نەداونەوە و ئەو داب و نەریت و رێچکانەی کە فەقێ و مەلا و قوتابی ئەو سەردەمی دەمیان پێ شیرن و شەکراوی کردووە بە شاڕچەی دین و ژین و تەقوا و کەرامەتی کۆمەڵی مرۆڤیان دیاری کراوە، نووسەری بە سەرەدەر دلسۆزانە لای لێکردۆتەوە و ورد و درشت و خاو و گشتی گیانێکی نوێی بە بەردا کردوون، بە سەنەدی زەق و زیندوو بە بنەماڵەی مێژووی گەلی کوردی ناساندوون، لە مەرگ نەجاتی داون و گەل و نیشتمان و خودای لە خۆی رازی کردوون.

لە پێنا و زەحمەت و وریایی ئەو نووسەرەدا وا بەش بە حاڵی خۆم سەری ئافەرینی بۆنەوەی دەکەم و داوای تۆفیق و جەزای بە خێر و بێری لە خودا داواکارم.

(راوچی) سارده کۆسانی (عەزیزنژاد) / ١٣٨٠/١/١٠



به نیوی یەزدانی مەزن

## پەسنێک بۆ کتێبی فەقێ و فەقێیەتی

سوپاس بۆ ئەو خوایە کە پەسندی ئەو لە دڵی ڕووناکەوە، وەک ڕۆژی بەتیریژ، زەوی و عاسمان دەتەنێتەوە. ئەو خاوەن شکۆیەی هەموو پایەبەرز و سەربڵێندێک لە سەر شیپانەی دەرگانەی ئەودا بە لارەملی و سەرکزی سەردەنێتەوە.

هەزاران دروود و ئافەرین بۆ ڕابەری شۆڕشی مەزنی جیهانی، حەزرەتی محمد المصطفی (د) و هەروەها بۆ بنەماڵە و یارانی و شوێنکەوتوانی.

بێگومان فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستاندا کەلەپوورێکی مێژوویی لەمێژینەی گەلی مسوڵمانی کوردە کە بەداخەوە تا ئێستا کەس لە سەری بە تەسەلی نەدواوە و نەهاتۆتە سەر پەڕەی قاقەزەوە. ئاشکراشە کە جەستەی ئەم گەلە مسوڵمانە، مانەوەی بە خودناسی و عیرفان و زمان و ئەدەب و جل و بەرگ و ڕامیاری و شۆڕشگێڕیەوەیە.

ڕاستی‌یەکی حاشاهەڵنەگرە کە بەردی بناغەی خودناسی و عیرفان و ئەدەبی کوردی و شۆڕشگێڕی لەو چوار دیوارە دووکەڵاوییە، قورماوە قوڕینەدا کە بە حوجرە ناودەبرێ دامەزراوە و لەوێوە هاتۆتە دنیای ژینەوە و فرچکی گرتووە و کەوتۆتە گڕوگاڵ و لە خەم ڕەخسیوە و هەتا دوا ڕۆژی ژیانی ئەم گەلە لە عاسمانی کوردەواری‌دا وەک ئەستێرەیێکی پڕشنگدار دەدرەوشێتەوە و بێ ئاوابوون لە کەلی ئاسۆی گەلی کورددا شۆق دەداتەوە. ئەگەر وا هەڵکەوتبێ ئەدەبی کوردی لە دەم زاری نەخوێندەواری دوور لە شارستانییەت هاتبێتە دەر، یان بە دەم بەیت‌بێژانەوە گوترابێ، ئەو کەسانەی ڕەنگاندوویانە و بە جل و بەرگو بەرموور و خشڵ ڕازاندوویانەتەوە، ئەو ماموستا و نووسەر و ئەدیبانە بوون کە لە حوجرەی فەقێیان سەریان هەڵداوە و لەوێرا تێشوویان

پێم بەجێیە وەک سەنەدێکی مێژوویی ئەو چەند دێرە لە خودالێخۆشبوو، مامۆستا علاءالدین سەججادی لە مێژووی ئەدەبی کورد لاپەڕەی (۴۰۱) بگوێزمەوە: «لە ناو چواردیواری شڕرو دووکەلاوی حوجرەی مزگەوتی شارستان و لادێیەکانا بە ژیانێکی زۆر سادە و کۆلەمەرگی بەخێو ئەکران؛ علما و ئودەبا و شاعیری زۆر گەورە گەورەیان لێدەرچووە. وە ئەگەر عالەمی کوردی تا سەرەتای سەدەی بیستەم لە ئاسمانی خوێندەواریدا، لە عالەمەکانی‌ترەوە دیار بێ ئەستێرەی گەشی ئەو ئاسمانە تەنها ئەم تیرەیە بوون. جا بەم بۆنەوە هەموو پیاوێکی گەورە و بەگزادە لە کوردەواریدا شانازی بەوەوە کردووە کە تێکەلاوی ئەم تیرەیە ببێ وە بە پێی دەسەلاّت خۆی و کوڕەکەی فێری ئەو خوێندنە بکات....»

دەمهەوێ بە ئینسافەوە رایبگەیەنم کە نووسەری ئەم بەرهەمە، باری زانست و کۆمەلاّیەتی، تێر و تەسەل و پاراوە و لە شت ورد بۆتەوە؛ بۆ بنج و بناوانەکەی گەڕاوە و لە چاوگەی روانیوە و لە لێلاّیی تۆراوە و ئاوی لە سەرچاوە هەلێنجاوە و لێی خواردۆتەوە. لە زۆر نوسراو و چاپکراوەکانیدا ئەو راستیە وەبەرچاو دەکەوێ.

کتێبی «فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان»ی لەبەر هەر هۆیێک بووبێ، بۆ ناردووم؛ منیش بە سەرنجەوە لێم روانی. ئەو کتێبە لەباری ئەدەبی کوردی‌دا کەلێنێکی گەورەی پڕکردۆتەوە و لەباری ناوەرۆک و مەوزووعیشەوە زۆر پڕ و پاراو و تەسەل و بەسوودە. بە متمانەوە خوێنەری کورد بەگشتی و مامۆستا و فەقێکان بەتایبەتی دلّنیا دەکەم کە نووسەر خزمەتێکی گەورەی بەو کەلەپوورە، لەمێژینەی کورد کردووە و لە هەموو بوارێکەوە شتی بەکەلّکی گوتووە و بوخچەی نەکراوەیە و سفرەییێکی پڕ لە خواردەمەنی.

ناشلێم کاکە مەلا سەیید مستەفا بە تەواوی ئەو کەلەپوورەی هێناوەتە سەر پەڕەی قاقەزەوە، چونکە تا ئێستە هیچ سەرچاوەیێک‌لەم بارەوە نەدواوە و نەنوسراوە. بەلاّم گومان لەوەدا نییە کە ئەوکارە لەو بوارەدا تاقانەیە و بە شاکارێکی گەورە حیساب دەکرێ. لە باری رەخنەگرتن لە زۆر کەس، بەتایبەت لەوانەی کە لە بەرگی مەلایەتیدان و لە ئایینیش بەلّەدن، بەلاّم لە راستیدا زیانیان زۆرە و دینیان بە دونیا داوە و ئایینیان وەلا ناوە و تا ئێرە، کەمتر هەلّکەوتووە روو کرابن و رووی دزێویان بۆ خەلّک دەرخرابێ، بە

راشکاوی رەخنەی لێگرتوون و دەردێکی گەورەی لە قاو داوە و ئاشکرای کردووە. هەر دەبێ واش بێ، چونکە تا دەرد، نەدۆزرێتەوە دەرمان نابێ و تا رەخنەگرتن نەبێ هەڵدان نابێ و هەقیش دەبێ بگوترێ بە زیانی هەرکەس تەواو بێ.

ماڵم هەقە، دڵسۆزانە دواوە و پێگە و شوێنی دەردەکانی نیشان داوە و نوسخە دەوای نووسیوە و ڕێی ریشەبڕکردنی ناسۆرەکانی دەستنیشان کردووە. کەوابوو پێویستە هەرکوردێکی مسوڵمان بۆ ناسینی ئەو چینە لە کۆمەڵ و هەر مامۆستا و فەقێیەک بۆ چارەکردنی دەردەکان، بە وەبەرچاوگرتنی خاڵ و پێشنیارەکانی و هەروەها بە دامەزراندنی بناغەی فەقێیەتی و مەلایەتی لە سەر شێوەیێکی دروست و بەکەڵک، ئەو کتێبە بخوێنێتەوە.

ئیمامو خوتبەخوێنی گوندی قەباغکەندی لە مەڵبەندی چۆمی مەجیدخان
محمد ثباتی / سەرماوەزی ١٣٧٩



## لێدوانێک لە لایەن بەڕێز مامۆستا مەلا محمد عزیزی بەردەڕەشی یەوە

بە نێوی خودای تاک و تەنیا، بەدیهێنەری دەشت و چیا، درووود و سلاو لە گیانی پێغەمبەری مەزنی ئیسلام و یارانی، وە شوێنکەوتووانی بە پەیمانی، هەتاهەتایە، تا بوونەوەر لە گۆڕدایە.

با وەکوو لە مێژە راستەوخۆ و دوڕووانە، نەوس و هەوەسپەرستان لە دژی ئایینی پیرۆزی ئیسلام وەستاون و ویستویانە وەستایانە بە زەبوونکردن و لە ناوبردنی رێبەرانی بە ئاکام بگەن، بەلام بە پێی بەڵێنی خودا ئەو ئایینە پیرۆزە هەر ماوەتەوە و گەلێک پسپۆڕ و زانای ناودار و بێ نێوی پێ گەیاندووە و هەرواش دەبێ تا دنیا دنیابێ. ئەوانیش نەک هەر ئەوەندە نەیانهێشتووە یاسای خودا لە ناوچێ و ئایینی ئیسلام لە پەرە ستاندن بکەوێ، زمانە بێگانەکانیان پارچڤە[1] کردووە و پەرتووکەکانیان راڤە[2] کردووە و لێیان کۆڵیوەتەوە و چەوت و هەڵەکانیان بەرچاوخستوون، وێڕای بەدیهێنانی زۆر زانستی بەکەڵک، کە لەمانەدا هەمووی مێژوو گەواهە.

هەر لە پیتی[3] ئیسلامی پیرۆز و تێکۆشانی مەلاکانە دەبینین لە مێژوودا لە خولانی نێوەراستدا (رۆژی رەشی ئوروپا) چەند فێرگەو زانکۆلە ناوچەکانی ئیسلامیدا بوون، بەتایبەتی لە ئێران و عێراق و تورکیە و ئەسپانیا و سووریەدا بێجگە لەو هەموو حوجرانەی لە تەنیشت هەر مزگەوتێکدا بوون، جگە لە مزگەوتەکان لە شار و دێ و ئاوەدانیاندا کە هەزاران هەزار شاگرد و فەقێی لە هەمووجۆرە زانستێکدا بارهێناوە و چین لە دوای چین بوونە مەلا و مامۆستای گەل و خەڵکیان بە تێکرا بەرە و زانست و مروڤایەتی راکێشاوە.....

---

١ - پارچڤە: تەرجەمە (هەنبانە بۆرینە)

٢ - راڤە: شەرح

ئەمجا دیارە بە سەدان پێتۆڵ و پسپۆڕی وەک شافعی و غزالی و ابوعلی و ابن‌رشد و رازی و ابن خلکان و ابن الحاج ئالانی و بێتوشی و هەزارانی‌تر هەروا لە خۆڕا پێ‌نەگەیون و دەبێ وێڕای گەل میریەکانیش هەرچەندە زۆربەیان فریو خواردووی جیهانی مایەیی بوون پشتیوانیان بووبن.

دیارە زانکۆکانی بەغدا و نەیشابوور و ئەستەنبۆل و ئەندەلۆس و جێگاکانی‌تر گەواهن بێجگە لە شوێنەواری ئەو هەموو چاکە و مەوقوفانە لە هەموو ناوچەکانی ئیسلامی‌دا.

ئەو رۆژانە لە پیتی یاسای پیرۆزی ئیسلامەوە رەنگ و زمان کاری‌نەدەکرد، ئاو و خاک نەدەبۆ بە هۆی لێک پچڕان و دوبەرەکێ، تەنانەت لەو سەردەمەدا کوردستان بە دوو بەشی گەرمێن و کوێستان هاتووچۆی تێدادەکرا، بە کورتی مەرز و سنوور نەبوو!!

بەڵام دواکەرت و پەرتکردنی[1] نارەوای ولاتانی ئیسلامی لە لایەن خوێن‌مژانی بەناو پارێزەرانی مافی مروڤەوە فەرهەنگ و شارستانیەتەکەی لێ‌ونکرا و بە بێ‌ماف زانستەکەیان لێ‌کردە دوو بەشی جیهانی و پەسلانی[2] و گوتیان دین و سیاسەت لێک جوێیە و دین و حکوومەت دژبەیەکن و تەنانەت ئایین و زانست یەک‌ناکەون...!!

دیارە کوردستانیش بەشێکی پان‌وپۆڕی هەرێمی[3] ئیسلامییە و زیاتر لە بەشەکانی‌تر تالاوی ئەو سیاسەتە چەپەڵەی بە گەرووداکراوە و چاتر لە بەر هۆگەلی جۆراوجۆر لە پاراستنی ئایینەکەیدا تووش چەرمەسەرێ و دووبەرەکێ بووە.

ئالێرەوە ئەرکی ژینی مەلا و فەقێکان کە پشتیوانی راستەقینەی مافی مروڤ‌بوون و هەن، کەوتە سەرشانی گەل و گەلیش پەرتەوازەکراو، چەوسێندراوە و بێ‌سەرەندەر...!!

جا تا رۆژێک پاراستن و رێز و بژیوی تیپی مەلا و فەقێ وێڕای گەل لە سەر شانی میر و مەزنێک بووە کە دیارە میر نوێنەری خەڵکە تا لەگەڵ گەلا بێ‌کارە کە بە برەوتر و پێش‌کەوتووتر بووە بەڵام کە ئەمانیش کێش‌کرانە ناو زەلکاوی نەزانییەوە و خودایان

---

١ - کەرت و پەرتکردن: لەت‌وپەت و پارچەپارچەکردن(نووسەر)

٢ - پەسلانی: قیامەتی.

٣ - هەرێم: ناوچە (فەرهەنگی خاڵ)

وەلاناو لکان بە مایە پەرستییەوە، ئەوان چەوسێندرانەوە و زۆریان بـۆهێنان و لە گـەشە کەوتن!! ئەمجا گەلی هەژار بەتەنێ دەکەوێتە مەودا بۆ پاراستنی ئایینەکـەی و جـیهانی مایەپەرستی هەڵیناخەڵەتێنێ و خودای لەیادناچێ.

ئالێرەوەیە زانکۆکان دەبنە حوجرەی چکۆلە و شارەکـان لە فـەقێ چـۆڵدەبن و پسپۆڕ و بلیمەتەکان دەبنەمەلای کەمزان و کاربەڕێوەبردن دەکەوێتە دەست ئەم و ئەو و فەقێکان دەبێ خۆیان بچنە ئەملاولا و بژیوەکەیان کۆوەکەن و کەرەسەی خوێندن دەست خەن و نەشەیان بشکێ و گیانیان بۆ هەتاهەتایە زەبوون...!

چەندە خۆشە کە ئەمنیش یەکێک لەو بێناز و چەوسێندراوانە بووم دەردەدڵێک بڵێم بۆ کەمتربوونەوەی زامی دەروونم: کاتێک دەچوومە ناو دێ و دەمگـوت «نـان یـا پێخۆری فەقێیان، بچنە بەهەشتی» بێجگە لەوەی بە دەنگێکی نووزەڵە هاوارمدەکـرد لە شەرمان خۆم بن لاشیپانی دەرگا دەدا و ئارەقی شەرمەزاری دایدەگرتم و یـەکـێک بـە رووخۆشییەوە لێی دەڕوانیم لە دڵی خۆمدا هەزاران سوپاسم دەکرد و هەرکە دەچوومەوە ماڵ گەورەترین ئامۆژگاریم بۆ دایکی خوالێخۆشبووم چاکە لەگەڵ فەقێیان بوو....

بە سەدان جار پڕ و پیرێژنە پیلانیان پێدەگرتم: چییە هەر ماڵی ئێمە دەزانی یان قاپەکەمان گۆڕاوە و....

چاکم لە یادە لەکاتی جومعانەی ناو دێ و دەرەوە بێجگە لە سەگ پێوەڕین و دەرکا و دەرک و سەرما و سۆڵ و تانە و تەشەری نەیار[1] و کوڕە سەرمایەدار و خـوێندکارە میرییەکان و دەستقونجاوە بە ناو مسوڵمانەکان، نەخۆشی دەروونی بۆماوەیەکی زۆر دای دەگرتم.

دەردی هێندێک مـوستەعید (مسـتعدّ) و هـاوەڵی مـلهوڕ و نـەزان و لە ئـایین بێهەواڵیش بەجێی خۆی!!

چوونە لای مەلای کەمزان و نەزان و وەڵاتگەڕان و جێنەبوونیش سەرباقی.

دیارە پەرتووکەکانیش بێجگە لەوەی بە زمانی بێگانە بوون زۆربەیان وەک مەتەڵ و

چیستان وابوون، ئای لە تەسریفی زەنجانی و عەوامیل بە تەرکیبەوە، ئای لە قـزلْجی و عصام‌الدین و پێنجوێنی و پەراوێزەکانی‌تر، ئای لە جمع‌الجوامع و تحفە و بەیزاوی.

پێنووس و لێ‌نووس بۆ کێ بوو تا بۆ من بێ؟ زۆرجار لە تاوان لە قەڵەمدانەکەی باوکم پێنووسم دەردێنا بە مەرەکە بەدەست‌کردەبێ رەنگەکەی رێشکـەوپێشکەیێکم لە پەراوێزی کۆنە پەرتووکە دووکەلاوییەکانی دەنووسی، ئای ئەگەر بـیزانـیایە دەبـوو چ پەت‌پەتپەتییەکەم بەسەربێنێ؟!

بەوحاڵەش پەرتووک نەبوو دەرسی تێدا بخوێنم، دەبوو لە جێیەک پەیدای‌کەم و وەی‌نووسم.

ئەوە تەنیا دەردی من نەبوو، زۆربەی هاواڵەکانم وابوون!!

سەرەرای ئەوانە بیرکردنەوە لە داهاتوو، بوون بە مەلا، کەوتنە بەرچاوی هەر ملهوڕ و دین‌دوژمنێک کە مەلا ئیشەکەی کۆمەلایەتییە و دەبێ لەگەڵ هەموو کـەس و چـین و توێژێکدا بێ و چونکە بە هەست و زانایە هەمووکەس حیسابی لەسەر دەکا و هەر بەو دوو بەڵگانەشە دوژمنانی خودا و ئیسلام و مروڤایەتی دەیچەوسێننەوە...!!

ئا لەبەر ئەوانەیە ترگزە پەیدادەبێت‌و ئیشەکە حەستەم!

بەڵێ فەقێ لاوە، تازە پێگەیشتووە، ئێستە باش لە ئایین نەگەیوە، بەردی سارد و گەرمی بەرپێ نەهاتووە، نازانێ مەلایەتی خەباتە و تێکۆشان، بەربەرەکانێیە لەگەڵ هەر بیر و بڕوا و کردەوە و ئاکارێکی چـەوت و چـەوێڵدا، راکـێشانی گـەلە بـەرەو لووتکـەی بەختەوەری، خەباتکار و تێکۆشەرانی هەر سەردەمێکیش بێ کەند و کۆسپ نەبوون. ئا لەبەر ئەوە بوو زۆر لەوانەی کە دەگونجا ببنە مروڤی رۆژی خۆی وەک لەبەر دێـوەزمە هەڵێن بە رق و قینێکی بێ‌وێنەوە تەنانەت دوای بوون بە مەلاش، بە ناچاری پەنایان‌دەبردە بەر دیواخانی ئاغا و دەبوونە کوێخا و میرزا، یـان دەچـوونە یـانەی مـیریـیەکـان و بـە پێش‌خزمەتیش رازی‌دەبوون، بە قەولی گوتووان لە کاکلانیش دەبوون و لە توێکلانیش!

بەداخەوە ئێستەش نە لا و نە پیر، نە مامۆستا و نـەفەقێ‌مەگـەر بـەدەگـمەن[١] لە

دەربڕینی دەردەدڵ تێنەپەڕیون و قوڵیان هەڵنەماڵیوە، یا لە برسا یا لە ترسا، یـا لە بـەر نەزانی و ناهومێدی تا تاو دەنە دەستی یەک و ئەو ڕێوڕەسمە نەگریسە بگۆڕن، جا یا ببنە خانی خانان یا ببنە تۆزی بانان!

بەڵێ ئێستەش زۆرن لەوانەی قسە لە قسە ناگیرێ دەڵێن: دەبێ خودا روحم کا، واتا نابێ ئێمە وەجووڵێین، یان دەست بە کلاوی خۆتداگرە با نەیبا، واتا حیزی و سەلامەتی، یان کوا خەڵک بەمە چادەبێ؟ یان لە پیر و پێشوونیانەوە هەروا هاتووە، ناکرێ دەستی لێدرێ، کە وەلامی هەمووان تێنەگەیشتن لە ئایینە؟!

بەڵێ ئێستەش زۆرن لەوانەبۆت تێناگەن کە ئـەو ڕێ و شـوێنە شـوێنەوارێکـی نەویستە و بێدەسەلاتی و نەزانی بەدیهێناوە و بۆت حاڵی‌نابن کە جیهانی ئـەوڕۆ بـە سەدان پلە گۆڕاوە... تا دوێنێ بـوو، زۆربـەی گـەل فـەقێی پـێ فـریشتە و مـەلای پـێ جێنوشینی پێغەمبەر(ص) بوو، ئەوڕۆکە نەیار بە مفتەخۆر و سەرباری گەل و نەزان و کۆنەپەرست و ئەنگەلی ناساندووە و دۆستی نەزانیش وەک ئەشکەوت دەیلێتەوە.

ئەوڕۆ دوژمنانی خودا و ئایین بە سـەدان تـیر و تـوانـجیان ئـاراسـتەدەکـەن و دەیانهەوێ بە هەر درۆ و بوختانێک بێ لەگەڵ خەڵکا بیانکەنە دوژمن و لە پێش چاوانیان بخەن تا زەبوون و زەبوونتر بن و تەنانەت ڕەشەکوژیان[1] دەکەن تا نە خۆیان بن و نە بیروبڕوایان بەلام دوا بۆ هەڵبەستنی بوختان....

بەڵێ ئەوڕۆ ڕۆژێک نییە کە هەموو کەس لەبەر خوداکوڕی خۆی دەبەر خوێندنێ بنێ بۆ مەلایەتی و مەلا بپارێزێ و بە ڕێزەوە لێی بڕوانێ و بە بـوونی فـەقێ شـاد و بـە چاوپێکەوتنی مەلا بە نەشە بێ و بەقسەی بکا و بۆ بوونی تێبکۆشێ و بە دەست و زمان و ماڵ یارمەتی بدات، چاوی لەوە نەبێ چی لەبەرە و چی لەسەرە....

ئەوڕۆکە من لەوانەی تێبگەن: نەمانی مەلا نەمانی ئایینە و ئایین لە ماڵ و گـیان بەرزتر و بەڕێزترە کە دەبێ بە هەر دوو لا بپارێزرێ.

کەوابوو دەبێ ئەوڕۆ باری پەرەپێدانی خوێندنی ئایینی بگۆڕێ و بیچمی ژین و

خوێندنی فەقێ سەرکەوێ و مەلاکان لە مووچە و بەراتی شیا و کەڵک وەرگرن و دەبێ هەوڵدرێ هەردوولا لە دڵاندا بن تا لە هەموو چین و توێژێکەوە خۆی بۆ بکوتن و هەموو بنە پشتیوانی خودا و ئایین نەتەنیا هەژار و نەدار و چەوساوە و بێسەرەندەر و لادێیی.

ئەمجارەش ئاورێکی تر دەدەینەوە و بەتایبەتی رووودەکەینە هێندێک لە مامۆستاکان کە بەداخەوە ئێستەش باش بیرناکەنەوە و دەپرسین: تاکەی دۆستی نەزان دەبێ ببێتە داردەست و بڵیندگۆی دوژمنی فێڵباز و تەشوێ هەڵگرێ بۆ رەگەبڕکردنی ئایینی خودا و بێجگە لە گوتنەوەی توانج و تەشەری نەیاران پێیخۆشبێ تێپی خوێندەوارانی ئایینی هەر بە سەرکزی و لارەملی بژین و چاوەڕوانی دەستی هەرکەس و ناکەسێک بن و لە قوژبنی مزگەوت نەیەنە دەر و ئاگایان لە مەحموودی بێزەواد نەبێ و لە هەموو مافێکی رەوای گەل بێبەشکرێن، تا ئەگەر جارێک یەکێک هاتە دەر بە هەمووان چەپڵەی لێبتەقێنن و لە ترسی توانج و تەشەر بچێتەوە ژوور یان ئاڵای گاوری بۆ هەڵگرێ و خەڵکی لێوەتەکێندرێ.

تۆی مەلا دەگونجێ بیر و بڕوات پتەوبێ و بتوانی بە هیچ بایەک نەلازێی و خۆگری هەموو دەرد و بەلایەکبی، بەڵام ئەی بەناو مسوڵمانەکانی تریش وان؟!

بەڵام ئەی تازە فەقێکان، ئەی ئەوانەی دەیانەوێ ببنە رێبەری سبەینێ؟!

ئالێرەدایە دەبێ بە فریای سبەینێی ئایین و هاوبیرەکانییەوە بێ و خەریکی چارەسەر بێ.

بە هیوای چ دانیشتووی؟

پێت وایە نەزان کارت بۆ دەکا یان نەیار...؟!!

پێت وایە هەل بە بیرتەوە دێ یا دەبێ خۆت هەل بخوڵقێنی؟!

بۆ مەگەر نەیار کەمتەرخەمە؟!

وەک ئەوە زۆر دەمێک بوو چاوەڕوانی ئەوە بووم دڵسۆزەکانی خودایی بەتایبەتی مامۆستاکان تاو دەنە دەستی یەک و باری نالەباری ژیان و خوێندنی فەقێ لە کوردستاندا بگۆڕن بە یارمەتی خودا، لەمێژیش بوو پێمخۆشبوو ئەو لایەنە بخرێتە بەرچاو کە چۆن زانا ئایینییەکانی کوردستان دەخوێنن و پێدەگەن و چ دەرد و بەلا و کەند و کۆسپێکیان لە

هەر لانێکەوە لە سەر رێدایە تا وانەیەک بێ بۆ برایانی مسوڵمان و هۆیەک بێ بۆ ئاڵ و گوڕی پڕبایەخ و روپەڕەیەکی تریش بێ لە شوێنەواری تاڵی کوردەواری...!!

تادیم سوپاس بۆ خودا برایەکی تازە پێگەیشتووی تێگەیشتوو لە ئیسلام حاڵی بووی دەرد و دوی فەقێیەتی چێشتوو، کاک مەلاسەید مستەفا زمزیرانی (سید مصطفی زمزیری) هەلی پربایەخی تەرخانکردووە و ماوٚستایانە ئەو ئەرکەی خستۆتە سەرشانی و ئەو راژەی بە گەل و هاوکارەکانی کردووە.

خۆم پێنەگیرا و پەڕتووکەکەیم[1] بە پەلە خوێندەوە! تێیفکریم و لێی وردبوومەوە، دیم بەراستیراستی زانیوە و چەپی ناسیوە و دەردی دیوەتەوە و دەرمانی دەرخستووە، مروڤی هەڵسەنگاندووە و چاک و خراپی لێک هەڵاواردووە، کە خۆی کوردە و کوردستانی، نەمامی باخ و بێستانی، دیویە و سەرنجیداوە، کەمتەرخەمی وەلاناوە، خۆزگە هەموان وادەبوون، ئەوینداری ئایین دەبوون، بۆ هاوبیران بە پەڕوش دەبون، دەست لە دەست و قەوەت لە خوا بەرەو مەبەست دەکەوتنە مەودا...!

نامەوێ کون بە کون و قوژبن بە قوژبن شوێن پێڕست و مەبەستەکانی کەوم، لە هۆندراوە و وێژامەکانی بدوێم، یان چیرۆک و پەندەکانی بخەمەروو، کە نوسەرەکە کوردە و بەرهەمەکەی کوردی، راست و رەوانە و کوردیەکی پەتی، میسک بۆنی دەڕوا، رۆژ شەوق دەداتەوە. تەنیا ئەوەندەمان لەسەرە سوپاسی کەین و لە ناخی دەروونەوە وەلالێین کە خودا ئەو ماوٚستا بەڕێزەمان لێنەستێنێ و یارمەتیدەری بێ بۆ هەموو رێبازێکی چاک و جار لەگەڵ جار زیاتر و چاتر بتوانێ بە ئاکام بگا و خودا وێنەی ئەویمان بۆ زۆر و زۆرتر کا...

و صلی‌الله علی سیدالمرسلین و علی آله و اصحابه اجمعین والحمدلله رب‌العالیمن.

موحەممەدی بەردەرەشی بانە ١٣٦٥/٢/٢٠ ه. ش

## پێشەکی

تاو دەدەیە دیوانی هەرکام لە شاعیرەکانمان، ژیان و بەسەرهاتی هەریەک لە هۆنەر و ئەدیب و نووسەران دەخوێنیەوە بێگومان تووشی ناوی فـەقێ و حـوجرە و ئـەوانـە هەردەبی و کەم شاعیر و نووسەر هەن کە زۆربەی ژیانیان لە حوجرەی فەقێیاندا بەسەر نەبردبێ و ئەگەر نەبوبنە مەلای تەواویش هێندێک لە ژیانی خۆیان لە حوجرەدا تـێپەڕ نەکردبێ.

چ شاعیر و نوسەرێک هەیە خەڵک بیناسێ و بـۆ مـاوەیەک سـەری دە حـوجرە هەڵنەکردبێ و بوخچەی فەقێیەتی بە شانیدا نەدابێ و دێ بەدێ نەگەڕابێ و بە راتبە و جومعانە ئاشنا نەبێ؟

کێ دەتوانێ ژیان و بەسەرهاتی مەلای جزیری، حـاجی قـادری کـۆیی، نـاڵی، مەحوی، کوردی، مەولەوی و هەژار و هێمن و دەیان شاعیری دیش کە مێژووی ئەدەبی کوردیان رەنگاندووە، بخوێنێتەوە و لە وشەی فەقێ و فەقێیەتی و حوجرە هەڵنەنگوێ؟

بۆ نمونە:

علاءالدین سجادی لە کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردیدا لە باسی ژیان و بەسەرهاتی شاعیری لێهاتوو، ناڵی شارەزووریدا دەنووسێ:

«ئەستێرە گەشەکەی ئاسمانی ئەدەبی کوردی (ناڵی) ناوی خدر (خضر) و کوڕی ئەحمەدی شاوەیسی (ئاڵیبەگی) مکاییلییە، لە ساڵی ١٧٩٧ی میلادی لە گوندی خاک و خۆڵ لە دەشتی شارەزوور هاتۆتە دنیاوە. بەوجۆرە ژیانە کە لە پێش (١٥٥) ساڵدا لە شارەزوور هەبووە ئەویش گەورە بووە. پـایەی بـەرزی خـوێندەواری لەو سـەردەمەدا خوێندن و تەواوکردنی علومی ئیسلامی بووە، بناغەی ئەمانەش لەپـێشەوە خـوێندنی قورئان و هەندێ کتێبی وردەڵەی فارسی بووە. ناڵی ئەمانەیان لە قوتابخانە پێ خوێندووە ئینجا چۆتە فەقێیەتی، لەم شار بۆ ئەو شار و لەم دێی بۆ ئەو دێی گەڕاوە، ئەو شوێنانەی کە

قەرەداخ لە لای...»

ئەدی ئەو مەلا باش‌باشانەی کە هەر لە سەر بێژینگ را تا گۆڕ، دەگەڵ خەڵک بوون و هەرچۆنێک و لە هەر هەل و مەرجێکدا بووبێ ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان‌با بە تەواویش نەیان‌توانیبێ‌راگرتووە و لە مەترسی دەستلێدان و شوێنە ونکردنی نەیاران و لەناوچوون پاراستوویانە و هەر بە نانەڕەقەی خەڵکی دوای چوارده سەده هێشتوویانەتەوە لە کوێ پێ گەیون و کێ توانیویەتی بێ‌چوونی حوجرە و تێپەڕکردنی دەورانی فەقێیەتی ببێتە مەلا؟ یان شاعیر و نووسەر؟ کەسێک بڕوای بەمە نییە با چاوێک بە مێژووی ئەدەبی کوردیدا بخشێنێ بۆی لە بنی کڕلەکەی دەدا.

جا دەگەڵ ئەوەشدا کە دایکی حوجرە رۆڵەی ئاوا بە ئەمر و گوێی پەروەردە کردوون و ئەو پیاوە گەورە گەورانەی پێشکەش بە ئایین و گەل کردوون مەگەر لە نێو ژیاننامەی کوڕەکانیدا و بۆ ناساندنی ئەوان دەنا تا ئێستا نەمدیوە باسێکی بەتایبەتی لێ کرابێ و ئەگەر کرابێتیش بەکەڵک‌هاتبێ.

بەش بە حاڵی خۆم زۆرم کتێب و نوسراوە پەڕپووت[1] کردوون و ئەم‌دیو ئەودیوم کردوون و زۆر پەڕاو هەن ئەگەر نەشم‌خوێندبنەوە هەر نەبێ چاوێکم بە ناو ئاخنەکانیاندا خشاندووە، یان ناوەکەیانم لە رووی بەرگەکانیان چاوپێ کەوتووە، بەڵام لە نێو ئەو هەموو نوسراوانەدا یەکێکم وەبەرچاو نەهات کە بڕێک لە باری فەقێ و فەقێیەتی و ژیانی پڕ لە مەینەت[2] و تاڵی فەقێ خۆشەویستەکانمان دوابێ و تۆسکاڵێک[3] حوجرە ئەو مەڵبەندە[4] دەوڵەمەندە پڕ پیت و پیروزەی پێ‌ناساندبین، بۆیە منیش تاومدا پێ‌نووس و سەرم بەسەر لاپەڕی دەفتەردا خوارکردەوە و بە کەڵک‌وەرگرتن لە رووداو و بیسراو و بینرا و قەڵەم و دەفتەر و دەرفەت[5] و بە پشت‌بەستن بە یەزدانی مەزن، دەستم‌کرد بە

---

١ ـ پەڕپووت: لەبەر یەک هەڵوەشاو. (هەنبانە)

٢ ـ مەینەت: تاڵاو و دەردی سەریی. (خاڵ)

٣ ـ توسکاڵ: تۆزقاڵ، کەمترین ئەندازە، تۆزولکە، نەختۆکە. (هەنبانە)

۴ ـ مەڵبەند: ناوچە (خاڵ)

بیرکردنەوە و لێکدانەوە و نووسینی کورتە مەبەستێک لەبارەی حوجرە و رۆڵەکانیدا و نێویشمنا: (فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان)

بەو هیوایە کە خوای بە هاوارەوەهاتوو هەلم بۆ هەڵخا و بیخەمە بەردەستی خوێندەوارانی خۆشەویست، ئیتر یارمەتیش هەر بە خوایە و پیاو پاڵ وەویدا بەسیەتی.

## چوونە ناو باسەوە

هەروەکی لە پێشەکیەکە باسمکرد هیچ نوسراوێکم لەبارەی ئەو مەبەستەدا کە دەمهەوێ خۆی لێبکەم بە وەستا نەخوێندۆتەوە، بەلام چونکوو بۆ خۆم یەکێکبووم لەو کەسانەکە ماوەیەکی زۆر دەگەڵ فەقێ ئازیزەکان ژیانم بردۆتە سەرو، سەروکەللەم دەگەڵ لێکداون و دانووم لە دیزەیدا کولاندوون و کۆڵم دە ژێر کۆڵێ ناون و نانم دەگەڵ لەتکردوون و کردەوەم رەچاو کردوون، بۆیە زاتدەکەم[1] لە گژ ئەو کارەدا رابچم و بچمە نێو گێژی بیرو بەرە و ناساندنی ئەو توێژە لە کۆمەڵەکەمان چەند هەنگاوێک هەڵبێنمەوە بۆ ئەوەی ئەگەر ئەو ئیشەم بێ کەڵکیش بێ لانیکەم رقی نوسەران هەڵبستێنی و هانیانبدا بۆ هەڵنانەوەی هەنگاوی باشتر بۆ ئەو مەبەستە.

ئەم کورتە باسەش لە (هەشت توێ)دا دەخەمە روو و بە دوا و تەو پەیامێک کۆتایی پێدێنم و مالاوایی دەکەم جا ئەوی گوێی بۆ گرتم ماڵی ئاوابێ و ئەوەش لوت لەوجۆرە شتانە بادەدا خوا بکا هەر ئاوا نەبێ.

## توێی یەکەم: فەقێ و ژانی ژین

ئەگەر کەمێک لە ژێواری[١] نالەباری پڕ لە تەنگ و چەڵەمەی[٢] فەقێیان بکۆڵینەوە و سەرنجێکبدەینە جێگا و ڕێگا و چۆنیەتی بەڕێچوونی وان لە کوردستاندا بۆماندەردەکەوێ کە ژیانیان گەلێک تاڵە و تێکەڵە دەگەڵ خەم و خەفەت و چەرمەسەرێ[٣] و بێبەشی و ڕۆژڕەشی[٤] بەتایبەت کەسێک نانێکی دەگەڵ لەتکردبن و لە نزیکەوە بیانناسێ یان بۆ ماوەیەکی فەقێ بووبێ وادەزانێ کە هەرچی کۆسپ و ئێش و ژانە لە خەڵک نەبان و لەوان میوانە.

یەکەم هۆی ئەو بێبەشییە ئەوەیە کە لەبەر لەسەرکارنەبوونی میری[٥] ئیسلامی تا ئەمڕۆ هیچکامێک لە میرییەکان تا ئێستا بایەخێکیان بۆوان دانەناوە و ئەرکی گوزەران و بەڕێوەبردنی ژیانیان وە ئەستۆی خۆنەگرتووە؛ بۆیە کەل و پەلی ژیانیان ڕاستەوخۆ لە خەڵک وەرگرتووە و بەشێوەی چاولەدەستی و دەست پانکردنەوە بۆ ئەم و ئەو بەڕێوەچوون و چوونە بەردەرکی هەموو کەس و ناکەسێک.[٦] جاکێهەیە بڵێ ژینی بە

١ - ژێوار: ڕابواردنی تەمەن، باری ژیان، چونیەتی ژین، بژیو. (هەنبانە)

٢ - تەنگ و چەڵەمە: دژواری، ناخۆشی، تەنگانە. (هەنبانە)

٣ - چەرمەسەرێ: چەرمەسەرە، دەرد و ئازار و ڕەنجی زۆر (هەنبانە)

٤ - ڕۆژەڕەشی: بەدبەختی. (هەنبانە)

٥ - میری: حکومەت. (خاڵ)

٦ - وەک دەزانین لە زۆربەی زۆری وڵاتە ئیسلامییەکاندا ڕێکخراوەی ئەوقاف گوزەران و باری ژیانی مەلا و فەقێیانی گرتۆتە ئەستۆ و چاک یا خەراپ پێیان ڕادەگا و پێویستییان بە وەرگرتنی ڕاستەوخۆی بژیو لە خەڵک نییە. بەڵام بەداخەوە، وەک ڕەخنەیەک دەبێ بڵێم: کە لە وڵاتی ئێمە ئەو کارە تا ئێستا نەکراوە و ئەو هەل و مەرجە نەڕەخساوە و دەست پانراکردن و چاوەڕوانی لە خەڵک بۆ ئێمە هەرماوە. کە ئەوجۆرە ژیانەش هەزاران گیروگرفتی پێکهێناوە و ڕەوتی کارەکەمانی خستۆتە دواوە.

هەڵبەتە نابێ ئەوەش وەشارین کە ڕێکخراوەی ئەوقافی ئێمەش لەوبارەوە هەنگاوی هەڵێناوەتەوە بەڵام شتێکیوا نییە حیسابی لەسەربکرێ. چونکی زۆرترین ڕادەی موچەکە ئێستا دەدرێ بە هەندێک لەو مەلایانەی

چاو لە دەستی خۆشی و گوزەرانێکی ئابڕوومەندانەیە؟ هەرکەس رای‌وابێ یان دوورە لە دادپەروەری و مرۆڤایەتی‌یان قەتی ئەو ژیانە نەدیوە و نازانێ چیە و چۆنە، یاخوا قەت هەر چاوی‌پێی‌نەکەوێ و نەکەوێتە رۆژرەشی.

ژیانی چاو لەدەستی و دەرکا و دەرک‌کردن بۆ نانێکی رەقی شکاو یـا سـوتاو و جامێک شۆرباوی سوێریان بێ خوێ و هەڵوەستان لەبەر دەرگا و لە ژێر هێرشی کرێوە و باکوتە و رەهێڵەی[1] باران و چۆڕاوکەی سوانان[2] تـا کـابانی مـاڵ وە جـواب بـێ و ئەسکوێ[3] دەبنی دیزێ بگێڕێ و بەشی فـەقێی بـێچارە و کـلۆڵی لێ‌دەرێـنێ ـ وەک لەمــــەبەدواوە بــــاسی‌دەکــــەین ـ و زۆر کــــەند و کــوسپ و لەمــپەری دیش وەک غەریبایەتی‌چێشتن و دووری لە وڵات و بەجێ‌هێشتنی دایک و باب و خۆشک و برا و خزم وکەس وکار و بێ‌بەرگ و پووڵ و پێڵاوبوون و زۆر شتی دیش لە دەورانی خوێندن‌دا بەرۆکی فەقێ دەگرن و دەبنە بەرهەڵستی. ئەوە هەر فەقێیە بە ورە و باوەڕی بەرزی و دڵی پتەو نەبەزی تاودەداتە کارەکەی و بە خۆڕاگری خۆی و پشت‌بەستن بە خودای، هەموو بەرهەڵستێکی سەر رێگای هەپرون بە هەپرون[4] دەکا و لەمپەرەکانی دەپەڕێنێ و چاڵ و چۆڵەکانی پڕدەکاتەوە[5] و تاترۆپکی رزگاری لە چەنگی نەخوێندەواری، بێ‌پشوودان دەچێتە پێش و پاشەکشە بە هەموو ناحەزێک[6] دەکا.

لێرەدا نامهەوێ لاوەکانمان لە فەقێیەتی بترسێنم و پـێیان‌بڵێم: نـەچن رووبکـەنە

---

⇦ لە حەوت خانی روستەم تێپەریون و ئاخیرین پلەی مەلایەتی‌یان هەیە (٨٠٠٠) هەشت هـەزار تـمەنە و ئەویش ناراستەوخۆ لە لایەن مەرکەزی بزورگی ئیسلامی‌یەوە دەگا و گەیشتنیشی بەم‌شێوە بۆتە هۆی دردۆنگی خەڵک لە مەلاکان.

شایانی باسە کە من لە برێک سەرچاوە بیستومە، ئەو دراوە هی رێکخراوەی ئەوقاف بێ، دەنا وا بڵاو بۆتەوە کە هی ئەوێ نەبێ!!!

١ ـ رەهێڵە: بارانی لێزمە و بە خور. (خاڵ)

٢ ـسوانە: گوێـسوانە. (خاڵ). سوانە: سواندە، یاسارە (هەنبانە)

٣ ـ ئەسکوێ: کەوچکێکی گەورەی دەم زلی کلک درێژە چێشتی شلەی لە مەنجڵ پێ تێ ئەکرێ (خاڵ).

٤ ـهەپرون بە هەپرون: شتێکە کە لە بەرزی‌یەوە کەوتبێتە خوارەوە و ورد و خاش بووبێ. (خاڵ)

٥ ـ ترۆپک: دوندی کێو، بڵندترین شوێن لە دار. (هەنبانە)

ئەوکارە نالەبارە و ئابڕووی خۆتان بەرن و خۆتان بخەنە نێو خانووی خەم و خەفەت و برسیەتی و رووتی و بێ‌ئەنوایی[١] و تووشی تووش[٢] بێن، نەء، هەرگیز چونکە پیاو پیاوی تەنگانانە و سواریش تانە گلێ نابێ بە سوار، یان وەکی هەژار لە (خەیام بە کوردی)دا دەڵێ:

«گەنجت دەوێ رەنجی دەوێ واهات و واچوو
کێ گوڵ دەچنێ درکی لە دەستی راچوو»
«تا شانە نەبوو لەت‌لەت و جەرگی پارە
کەی دەستی بە کاکۆڵی جوانێک داچوو»

ئەمن مەبەستم ئەوەیە ئێمەی مسوڵمان بزانین کە برایانی فەقێ تا خوێندن تەواو دەکەن و بە ئامانج دەگەن و دەبنە مامۆستای ئایینی، چەندە رەنج و کوێرەوەری دەکێشن و تا چ رادەیەک بە چەتوونی ژیان دەبەنە سەرێ و لە ماوەی ژیانی فەقێیەتی‌دا دەگەڵ چەند ناهومێدی و بێ‌بەشی رووبەروو دەبن و بەوحاڵەش قۆڵی، پیاوەتی هەڵدەماڵن و دەگەڵ هەموو گیروگرفتێک بەربەرەکانی دەکەن و ئامادەن هەموو کەند و کۆسپێک وەخۆ بگرن و هەر چەشنە ساردی و گەرمی‌یەک بچێژن بۆ ئەوەی بتوانن لە دواڕۆژدا ببنە مرۆڤێکی ئایین‌ناس و گەلەکەیان لەباری ئایینەوە رێنوێنی بکەن و وریایان بکەنەوە، کە فریوی زۆر دارەکان و خوانەناسەکان نەخۆن و خۆیان بناسن و خۆ بە دوژمن بناسێنن و دوژمنی خۆ بتاسێنن.[٣] هەروەها بۆ ئەوەی ئێمە - کە دەبینین تەنیا بە ئامانجی خزمەتکردن بە ئایین وگەڵ ئەو هەموو رەنج و ئازارە وەخۆدەگرن و بێ‌بڕوبیانو وگازندە تا تەواوبوون درێژە بە خوێندن دەدەن - شانازی‌یان پێوە بکەین و هەروەکی تا ئێستا شانمان وەبەرداوە و ئەرکی بەڕێوەبردنی ژیانی وانمان وە ئەستۆی خۆگرتووە ئەوکارە هەر درێژە پێ‌بدەین و بەڵکوو

---

١ - ئەنوا: پەناو پەسێو، جێ‌حەوانەوەی شەو. (هەنبانە)

٢ - تووش: رووبەروو بە یەک گەیشتن، هەوای زۆر سارد و بارانی، چارەوای گازگر و لەقە هاوێژ، مرۆڤی بەدفەڕ و بێ‌ئاکار. (هەنبانە)

٣ - تاساندن: خنکاندن، خنقاندن، گێژکردن. (هەنبانە)

باشتریش خزمەتیان پێبکەین و هەوڵبدەین بۆ ئەوەی بە پێی توانا باری نالەباری ژیانیان بگۆڕین و لانیکەم لە کۆڵ دەرکا و دەرکیان بکەینەوە.

چونکە ئەگەر بەراستی کەمێک وردبینەوە دەزانین کە فەقێ لە نان و ئاویش بۆ ئێمە پێویستترە، لەبەر ئەوە ئەگەر فەقێ نەبێ ماموستای ئایینیشمان بۆ سازنابێ و ئەگەر ماموستاش نەبێ کێهەیە لە دینمان حاڵی بکا؟ مەگەردین شتێکی وایە کە لە هەردێ هەڵبقولێ، یان وەک کەل و پەلێک دەتوانین لە بازاردا بۆی بگەڕێین و ئەگەر نەشبێت لە دەرەوەڕا بۆمانبێت و لە هەندەران داوای بکەین؟ قسەشمان دەگەڵ ئەوانە نییە کە دیندوست و ئایینپەرست نین و چاویان بە مەلا و فەقێ هەڵنایە و هەڵوێستیان لە هەڵوێستی موسوڵمانان جیایە!

گیر و گرفت لەمپەرەکانی جۆراجۆری سەر ڕێگای ژیانی بە ژانی فەقێیەتی لە داهاتوودا زیاتر دەخەینە ڕوو.



چەند فەقێی حوجرەکانی شاری بانە لە حەوشەی مزگەوتی (محمدی) کە مجێوری مزگەوتیش لە ناویاندا دەبینرێ.

## تونی دووهەم: شی کردنەوەی وشەی فەقێ و حوجرە

دیارە وشەی «فەقێ» لە «فقیە»ی عەرەبی یەوە کە بە مانای زانا، زۆر تێ گەیشتوو و زیرەک و زانا بە شەریعەتە، کورت کراوەتەوە و لەبەر ئەوەی لە زمانی عەرەبی دا بەوکەسانە کە لە دەستوراتی دین و شەریعەتی ئیسلامدا شارەزایی یان بووبێ گوتراوە (فقیە) لە زمانی کوردیش دا بەوجۆرە کەسانە هەروا گوتراوە. ئەوەندە هەیە لەبەر زۆر بەکارهێنان[1] پیتی «ە»ی لێکراوەتەوە و «ی»یەکەش لە هێندێک ناوچەدا کراوەتە «ێ»ی والاَ و بۆتە «فەقێ» و بەجۆرێک دەگەڵ فەرهەنگی کوردی تێکەڵ بووە کە هەرکەسێک گوێی لە وشەی (فەقێ) بێ کوتوپڕ شانۆی فەقێ و فەقێیەتی بەزەین دادێ.

«حوجرە»ش هەروەها وشەیەکی عەرەبی یە و بە مانای خانوو و دیو هاتووە لەبەر ئەوەی ئەوجۆرە خوێندنە لە پێش هەموو ولاَتێکدا لە نێو عەرەبەکاندا بووە و ئەوان وەک هەموو دیوێک بەودیوەشیان گوتوە «حجرە» هەروا دوای هاتنی ئەو خوێندنە بۆ نێو کوردەواری ئەو نێوە ماوەتەوە و دەستی لێ نەدراوە، مەگەر بە کزکردنەوەی ڕێیەکەی.

ئەمە باسێک بوو لە ناوی حوجرە بەلاَم بزانین ناوەرۆکی حوجرە چی یە و چی تێدایە و چ بەرهەمێکی خستۆتە دەرێ و چ پەرێز و پاشەکەوتێکی لەدوایە.

### بەرهەمی حوجرە

مێژو شاهیدە و خەڵک دیویەتی و دەبینێ کە حوجرەکانی کوردستان بە درێژایی چەند سەدە هەروەکو فێرگەی دین و سەنگەری پارێزگاری لە ئایین بوون کە بەنەرخترین و باشترین دەسکەوتی ژیانی مرۆڤەکانە، هەر ئاواش جێداری قوتابخانە و زانکو و تاقە سەرچاوەی زانست و زانیاری و مەکۆی پەروەردەکردن و بارهێنانی زانایان و روناکبیرانی ولاَتبوون.

روڵەکانی حوجرە تەنیا و تەنیا پاراستن و گەشەپێدانی ئایینیان بە پیشە و ئەرکی خۆیان نەزانیوە. بەڵکوو لە هەموو بوار و بارێکەوە ئەگەر لە دەستیان هاتبێ و ڕێگەیان

لێنەگیرابێ، خزمەتیان بە خەڵک کردووە. ئاستی زانستی‌یان لەباری کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابوری و لەش‌ساغی‌یەوە، بردونە سەرێ. کێشە و دوبەرکێ و نێوان ناخۆشی‌یان لە نێو هەڵگرتون و ئاوی ئاشتی‌یان بۆ بە ئاوری شەڕداکردون. بەرە و یەکیەتی و یەکڕیزی هانیانداون، بۆیان لە قازانجی پێکەوەبون و زیانی لێکەوە بون دواون. دوشمنیان پێناساندون و بۆ دژایەتی کردنیان هانیانداون. بۆ خۆشیان لەو ڕێیانەدا پێشەنگ بوون و رچەیان بۆ شکاندون و تەمی ترس و نابەڵەدی‌یان لە سەر ڕێگا ڕەواندوون.

خوێندکاران و دەرچوانی زانکۆی حوجرە بناغە دارێژەر و پێکهێنەر و درێژەدەری مێژوی ئەدەبی و سیاسی، وەک دووپایەی هەرە گرینکی بوون و مانو قەوارەی هەر نەتەوەیەک بوون و لەو ڕێیەش‌دا هەموو شتێکیان تا دەگاتە دەرکران و گیران و بەخشینی گیان لە خۆگرتوە.

ڕێبەران، شورشگیران، نوسەران، شاعیران و... هەموویان تا نیو سەدە لەمەوبەر هەر لە حوجرە سەریان هەڵداوە و بۆ بەجێ‌گەیاندنی ئەرکی سەرشانیشیان هەموو ڕەنج و ئازارێکیان لە خۆیان گرتووە زۆرێک لە خۆشی و مافی خۆیان وە لاناوە.

جا ئەگەر ئەم پەڕاوە سەر لەبەر بخوێنییەوە و لێی وردبیەوە، دەبینی کە ئەم ڕێگایە چەند زەحمەت و کوێرەوەری و کەند و کلۆی لە نێودایە، بەوحاڵەش ڕێبوارەکانی، شورەسوارە چاونەترس و بوێر و بەکارەکانی بۆ خەڵکی خۆ چییانکردووە. بۆ سەلماندنی داواشم ژێنامەی پڕ لە شانازی شاعیر و نوسەرانی رابردوومان، هەروەها مێژوی سیاسی و ئەدەبی گەلەکەمان، بە پاڵپشت و شاهید دەگرم.



حوجرەی «صلاح‌الدین ایوبی» لە ناوچەی شنۆ

گوندی ئاسناوێ

## تویی سێهەم: قوناغەکانی فەقێیەتی :

ماوەی خوێندن لە پێوەندی دەگەڵ خوێندنەکەدا بە دوو سەردەم دابەش دەکرێ:

## یەکەم سەردەم، سوختایەتی:

فەقێ لەوکاتەوە بە رەسمی دەست‌دەکا بە خوێندن و دێتە نێو فەقییانە وە لانیکەم تا دەگاتە کتێبی (جامی) کە کتێبێکە لە زانستی (نحو) دەدوێت و نوسراوی مەلاعبدالرحمانی جامی‌یە و راڤەی کتێبی «کافیە» نوسراوی ماموستا «ابن الحاجب»ی کوردی دەکا پێی دەگوترێ «سوختە».

بەلام سوختە یانی چی و بۆ لەو ماوە خوێندنەدا بە فەقێ دەڵێن سوختە و لە کەنگێوە ئەو نێوەی بۆ داتاشراوە؟ نازانم بڵێم‌چی و زۆر لە مێژە کۆڵم بەوەوە هەڵگرتووە کە وەڵامی ئەو پرسیارەم بۆ دەربکەوێ بەلام بۆ هەرکەس و هەرچی پەنام‌بردووە وەڵامێکی وام وەدەست نەکەوتووە قنیاتم[1] پێ‌بدات.

فەرهەنگی خاڵ دەڵێ: (سوختە) کەسێکە کە تازە دەستی کردبێ بە خوێندن لە مزگەوتا و کار بکا بۆ ماموستای و «هەروەها ماموستا هەژاریش لە (هەنبانەبۆرینە)دا دەڵێت: «سوختە یانی دەرس‌خوێنی سەرەتایی، تازە فەقێ» وە وەک دەبینین نە ماموستای خاڵ و نە ماموستا هەژاریش هەرچەند هەردوکیان سوختایەتی‌یان کردوە بەلام چونکوو باسی ئەوەکە سوختە بۆ پێی دەڵێن سوختە پێوەندیەکی راستەوخۆی بە فەرهەنگەوە نییە، وەڵامی ئەو پرسیارەیان نەنوسیوە. جا مەگەر (سوختە) هەر بە مانای فارسی‌یەکەی یانی سووتاو و ئاورگرتوو بێ و مەبەست سوتان بە عیشق و ئەوینی خوێندنەوە بێ و یان برێتی[2] بێ لە ماندویی و پڕکاری و لەبەرئەوە کە فەقێ لەو سەردەمەدا زۆر پڕکار و

---

١ ـقنیات: داکەوتن بە بەشی کەم (خاڵ)

ماندووە، ئەو نێوەی بۆداتاشرابێ. ئەگەر واش بێ هیچ دوور نیە و تەنانەت ناوێکە پڕ بە پێستی و لێی دەوەشێتەوە. چونکە بەڕاستی ئەو ڕەنج و کوێرەوەریەی فەقێ لەو ماوەدا دەیبینێ و ئەو گیر و گرفتانەی دێنە بەری و ئەو زەحمەت و زۆرییەی کە لە سەریەتی، ڕێگا بۆوەی خۆش دەکا ئەو نێوەی لێبندرێ و ئەوکەسەی بۆ هەوەڵین جار ئەو نێوەی لێناوە نێوی خۆی دەرکردووە و بە کردەوە نیشانیداوە کە زانایە.

**سوختە و ماندوویی**

سوختە جگە لە ئیشی تایبەتی خۆی وەک: دەرس‌خوێندن و دەرس ڕەوان کردن و دەورکردنەوە و شیو و کوڵ بۆ خۆی و مامۆستاکانی[1] و دروومان و ئەوجۆرە ئیشانە کە دەبێ جێبەجێیان بکات، ئیش و کاری ناو حوجرەش زۆری لە سەرشانی ئەوقورسایی دەکات وەک:

## ١ـ ڕاتبە یان ڕاتوو

ڕاتبە خۆی وشەیەکی عەرەبییە و بەمانای جێ‌گرتوو، بەردەوام و ڕاوەستاو هاتووە. هەروەها بە مانای کرێ و موچە و مانگانە بەکارهێنراوە.

فەرهەنگی خاڵ نووسیویەتی: (ڕاتوو) یانی ڕۆژانە لە خەرجی، یان نان، کە ئەدرێ بە هەژار و هەروەها مامۆستا هەژار لە هەنبانە بۆرینەدا دەنووسێ: (ڕاتو، ڕاتوە و ڕاتبە یانی خێری نان و شتی‌تر کە بە فەقێ دەدرێ).

---

١ ـ ئیستا شوشتنی جل و بەرگ و پێخەفی هەر فەقێیەک بە ئەستوی خۆیەوەیە، بەڵام تا ماوەیەک لەمەوبەر زۆربەی موستەعیدەکان، هەروەک زۆربەی هەرەزۆری ئیشەکانی حوجرەیان لە بەرانبەر دەرس پێ‌گوتن‌دا هاویشتۆتە سەرشانی سوختە، بەرگ و لیباسیشیان پێ‌شوشتووە دوای ئیشک بوونەوە لەباتی لە ئوتودان پێشان لەقەدکردووە و پێیان لە بوخچێ ناوەتەوە. یان بۆ ئیشکە شیو یارمەتیان لێ وەرگرتووە.

**ئیشکەشیو:**

فەقێکان واهەیە مێزەری سپی لە جیاتی شوشتن بە ئاوو شوار، «ئیشکەشیو» دەکەن. ئیشکەشیو بەم‌شێوەیە کە یان هەر ئاوە ژوو دەکرێتەوە یان ئەولفکەی کە تائێستا بەردراوەتەوە هەڵدەپێچرێ و بەم‌شێوە روی چڵکنی مێزەرەکە لە بەرچاوان وون دەکرێ و بێ‌شوشتن کەڵکی لێ وەردەگیرێ

بەڵی بە زاراوەی[1] نێو فەقێیان بەو خواردەمەنی و نان و پێخۆرەی دەگوترێ کە فەقێکان لەناو دێ یان گەڕەکی شار کۆیدەکەنەوە و بۆ خۆیان کەڵکی لێوەردەگرن، کە ئەوەش کارێکە بە ئەستۆی سوختەوەیە. واتە سوختە دەبێ سێژەمە نێو ئاوەدانی راو بکات و هەر ئەندازەیەک پێویستی‌یان پێ‌بێت، نان و پێخۆر کۆبکاتەوە.

لە هێندێ شوێن سوختە تەنیا دووژەمان واتە بەیانی و ئێوارێ، وەراتبە دەکەوێ و بۆ نیوەرۆژیش یان لە پاشماوەی نان و پێخۆری بەیانی کەڵک وەردەگرن یان ئەوەتە ئەگەر نان هەبێ پێخۆرێکی بۆ نیوەڕۆیە بۆ خۆیان سازدەکەن جا هەرچی هەبوو لە پەتاتە و تەماتەوە بگرە تا دۆ و ماستاو و پیواز و چای‌شیرین.

لە بڕێک شوێنان کە فەقێکان بزانن نانی تەواویان دەگەڵ چنینەوەی پێخۆر بۆ پەیدا نابێ نانی بە جیا دەچننەوە و پێخۆریش بە جیا، بەو شێوە کە دوای نوێژی ئێوارێ کەسێک یان دوو کەس وە نێو ئاوەدانی دەکەون و بە پێی پێویستی شەو و رۆژێک یان بۆ چەند شەو و رۆژان نانی کۆدەکەنەوە کە لەو شێوەدا دەگەڵ چنینەوەی پێخۆر نان وەرناگرن ئەگەر وەریش بگرن، لە کاتی نانچنینەوەدا ناچنە ئەو ماڵانەی پێخۆریان لێوەدێنن.

فەقێکان لە راتبەکردندا لە نێوان نەدار و دەوڵەمەندا جیاوازی دادەنێن و بۆ ئەو ماڵانەی کە پێیان‌وایە دەست کورتن، یان هەر ناچن یان ئەگەریش بیشچن بۆ پێخۆر ناچن و نانیشیان بەکەمی لێ‌وەردەگرن. تەنانەت ئەگەر ماڵێک هەتیوبار بێ هەر رووی تێ‌ناکەن، با دەوڵەمەندیش بێ.

**راتبە رەحمەتتان لێ بێت!**

رستەیەک کە فەقێ لە کاتی راتبەکردندا بەکاری دێنێ رستەی «راتبە رەحمەتو لێ‌بێ»یە. بەو شێوە کە وەختێک فەقێ گەیشتە بەردەرگای ئەو ماڵە کە دەیهەوێ راتبەی لێ‌وەربگرێت ئەو رستەی بە دەنگێکی بەرز، بەجۆرێک کە بزانی کابان حاڵی دەبێت، دەڵێ و چاوەڕوانی راتبە دەکات. کابانیش ماڵم هەقە هەر کە گوێی لەو دەنگە بوو بە گورجی هەر ئیشێکی لە بەردەستی دابێ وەلای دەنێت و تەنانەت ئەگەر مەمکیشی لە

**زاری کۆرپەی شیرینی نابێ لە سەری هەڵدەستێ و چ شتێک شک بەرێ بەشی فەقێی لێدەدا و ئەگەر هیچی ئامادەشی نەبێ لانی کەم دێتە لای فەقێی سوتاو و داوای لێبوردنی لێدەکات.[١] لە بڕێک جێگایانیش بەجێی «راتبە رەحمەتو لێ بێ» رستەی «پێخۆری فەقێیان بچنە بەهەشتێ» و ئەگەر نان بە جوێ بچندرێتەوە «نانی فەقێیان بچنە بەهەشتێ» دەگوترێ.**



**سوختەکان راتبە دەکەن**

١ ـ مامۆستا مەلا محەمەدی خاڵ لە نێو باسی ژیان و بەسەرهاتی «شێخ معروف نۆدێیی»دا کە یەکێک لە هەرە زانا پایەبەرزەکانی کوردستان بووە و نوسراوەگەلێکی زۆری لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە دەڵێت:
«...شێخ مەعرووف لە مەدرەسەی (هەزار مەرد) دەژیا، دەگەڵ قۆڵێک لە رەفیقە فەقێیەکانی، لە حوجرەیێکی تەنگ و تاریکدا؛ کە چاوت بە ژوورەکەی بکەوتایە دەتبینی کە کۆنە حەسیرێکی لێ راخراوە. دیوارەکەشی پڕ بوو لە رەفە و سینگی زۆری لێ داکوترابوو. هەر فەقێیەک سینگێکی تایبەت بە خۆی هەبوو کە لیباسەکانی پێوە هەڵدەواسی و رەفەیەکیشی بوو کتێبەکانی لە سەر دادەنان. ئازووخەیان بەیانان و ئێواران، لە لایەن خەڵکی دێوە بۆ دەهات، کە بریتی بوو لە نانی ویشک و کولێرەی رەق. مەگەر شەوانی جومعە کە بڕێکیان شۆرباو بۆ دەهات. کولێرەکانیان، بە سەر خۆیاندا دابەش دەکرد، کە هەرکامێکیان بۆ شەو و رۆژێک سێ کولێرەی بەردەکەوت.
بازەوەختێکان، لە لایەن خێرخوازانی ئاوایەوە بڕێک گۆشتیان بۆ دەهات و لێیان دەنا و بەو هۆیەشەوە ژوورەکەیان پڕ دەبوو لە دووکەڵ.
جاری وا هەبوو، داریان دەست نەدەکەوت و چێشتەکەیان، بە گەڵا و پووش و پەڵاش، دەکوڵاند.
دوای ئامادەبوونی چێشت، پاش ئەوەی بە ئاڵقە دادەنیشن، گۆشتەکەیان بە پێی سەری نەفەرەکان بەشبەش دەکرد و بە کەڵکوەرگرتن لە پشکی تایبەت بە خۆیان (دەو) هەر یەکە بەشێکیان هەڵدەگرت و بە ئیشتیا و تەمایەکی زۆرەوە دەیانخوارد و...»

علمائنا فی خدمة العلم و الدین
عبدالکریم محمد المدرس
لاپەڕەی ٥٧٤ ، ٥٧٥.

## ٢ـ جومعانە:

جومعانە ئەوەیە کە فەقێکان لە ڕۆژانی هەینی[١]دا وە نێو ئـاوەدانـی دەکـەون و هێندێ کەل و پەلی ژیان وەک قەند، چا، ڕۆن، هێلکە و برێ شتی تریش خڕ دەکەنەوە و بۆ خۆیان کەلکی لێوەردەگرن. بەوشێوە کە فەقێکان پـێکەوە چـەند تـورەکـە و دەفـر[٢] دەستدەدەنێ و وەنێو ئاوەدانی دەکەون و گەیشتنە بەردەرگای هەر ماڵێک کە بیانهەوێ جومعانەی لێوەربگرن یەکێکیان بە دەنگی بەرز هاوار دەکا: «جومعانەی فەقێیان بچنە بە هەشتێ» بە دواویشدا ئەوانی دیکە تێکڕا دەڵێن: «خواو لێڕازیبـێ» یـان «ڕەحـمەتی خوداو لێبێ»

ئەو شتومەکەش کە کۆیدەکەنەوە وا هەیە لێیان زیاد دەبێ. ئەوەش کە زیاد دەبێ وەکی هێلکە و قەند و چایی، وە سەریەکی دەنێن تا زۆر دەبێ و پـاشان دەیـفرۆشن و دراوەکەشی دەدەنەوە بە شتومەکی پێویستی حوجرێ وەک سفرە، چرا، پیالە و ژێرپیالەی چایی و هەور و هۆڵ و شتیئاوا و هەروەها بەو دراوە، لە شوێنێکدا کە نیوەڕۆیان ڕاتبە ناکرێ نیوەڕۆژەیشی پێئامادە دەکرێ و ئەگەر دەستیش بڕوات هێندێکی بۆ شەوچەلە[٣] تەرخان دەکرێ.

پێویستە ئەوەش بڵێم کە فەقێکان هەروەکو لە ڕاتبەکردندا لە نێوان دارا و نەداردا جیاوازی دادەنێن لە جومعانەشدا تۆفیر[٤] هەر دادەنێن.

---

١ ـ هەینی: ڕۆژی جومعە.

٢ ـ دەفر: جێگەی شت تێکردن. (هەنبانە)

٣ ـ شەوچەلە: خواردەمەنییەکە لە شەوگاری زستانا دوای نـانخواردن ئـەخورێ لە مـیوەی وشک و تـەڕ. (خاڵ)



**فەقێیەکان جومعانە دەکەن**

لە جومعانەکردندا موستەعیدەکانیش وەک سوختەکان بەشداری دەکەن بەڵام هیچ شتومەکێک هەڵناگرن و ئەو شتەی وەری‌دەگرن دەبێ هەتا تەواوبونی جومعانە هەر سوختەی بەخت سوتاو هەڵی‌بگرێ.(١)

جومعانە جۆرێکی دیشی هەیە ئەویش ئەوەیە کە هەرکاتێک فەقێی دێیەک لەو دێیەی کە لێنی، ژیانیان بەرێوە نەچوو بە کۆمەڵ یان چەند کەسێکیان دەچن بۆ دێیەکی دیکەکە فەقێی تێدا نەبیت و بەو شێوەی کە باسمان‌کرد جومعانەی لێ‌دەکەن وکەل‌و پەلی پێویست بۆ خۆیان دەچننەوە.(٢)

واش هەیە فەقێکان لەو شێوە جومعانە بۆ پوڵی گیرفانی خۆیان کەڵک وەردەگرن. لەبەر ئەوەی کە بەداخەوە زۆربەی زۆری فەقێکان کورە هەژارن و بەدەگمەن رێ‌دەکەوێت

---

١-هەڵبەت لەو دوایی‌یانەدا هاوکاری موستەعیدەکان بۆ سوختەکان زیاتربووە و بەشێکی زۆر لە موستەعیدەکان بە ئەندازەی سوختەکان بگرە زیاتریش کاردەکەن جا بەو پێیە لە جومعانەش‌دا هاوکاری‌یان هەردەکەن.

کوڕە دەوڵەمەندێک بێتە فەقێ و یان ئەگەر وەبەر خوێندنێشی بنێن تا سەربخوێنیت. جا بۆیە بەشی هەرە زۆری فەقێکان ناتوانن یارمەتی پێویست لە ماڵی خۆیانرا بێنن و ناچار دەبن بۆ کڕینی هێندێک شتی پێویست وەک بەرگ و پۆشاک و کتێب و پێنووس و لێنووس و ئەوجورە شتومەکانە داوای یارمەتی لە خەڵک بکەن.

شایانی باسە کە ئەوجۆرە جومعانە ماوەیێکە وەلانراوە و زۆربەکەمی دەبیندرێت و ئەو ماوەیەش کە بۆ دراوی نێو گیرفان لەو شێوە جومعانە کەڵک وەرگیراوە وانەبووە کە بە تەواوی ئاتاجی[1] یان جێبەجێ بوبێت. چونکو ئەو جومعانە لە ساڵێدا جارێکی یان دوو جاران کراوە و لەو یک ـ دوو جارەشدا دەستکەوتێکی وایان نەبووە کە بە هەموو لایەکیان رابگات. جا بۆیە ئەگەر ماڵی بابی فەقێ فەقیریش بووبێ قورسایی بەشێکی زۆر لە بەڕێوەچوونی ژیانی کوڕەکەیان هەر لە سەرشان بووە.

واهەیە فەقێکان لە جومعانەی دەرەوەدا لە جیاتی کەل و پەل و وردە شتومەک جومعانەی گیسکان دەکەن و بۆ وەرگرتنی یارمەتی دەچنە لای مەڕدارەکان لە هۆ بەو هەوار و ئەوانیش بە پێی دەخۆرا دین گیسکێک ـ دوو گیسک یان پوڵی کەمتر لە نرخی گیسکێکیان دەدەنێ. دیارە ئەو دراو و گیسکەشیان لە بری زەکاتی شەرعی‌یە، یان خێر و سەدەقەیەیان بە ناوی یارمەتی‌دانی ئایینەوەیە کە فەقێکانیش جگە لە گیسکێک کە بە وردکەنان قەڵەوی دەکەن و دەیکەنە قاورمە؛ ئەوانی‌تر دەفرۆشن و دراوەکەشی لە پێویستیەکانی خۆیان و حوجرە خەرجدەکەن.[2]

## ٣ـ کارەکانی دیکەی حوجرە:

جگە لە راتبە و جومعانە تەواوی ئەو کارانەی کە دەبێ لە نێو حوجرەدا جێبەجێ بکرێن بە گشتی بە ئەستۆی سوختەوەن جا لە ئاوهێنان و ئامادەکردنی چایی بە هەموو ئیشێکەوە وەکی تێهاویتن و هەڵکردنی سەماوەر و سەرئاورنانی قەرەوانە و شوشتنی پیاڵە

١ ـ ئاتاجی: ئیحتیاجی، پێویستی.

٢ ـ هەڵبەت ئەگەر لەباتی زەکاتی شەرعی بیدەن دەبێ مەرجی پیویستی تێدابێ واتا گیسک بەکەڵک نایە بەڵکوو دەبێ یان کوور بێ یان چوێشتیر.

و ژێرپیاڵە و قەندشکاندن و چایی تێکردن و چایی گێڕان و هەروەها شتنی هەوڕ و هۆڵ و سفرەچنین و هەڵگرتنەوە و داربڕینەوە و داخستنی کوورە لە فەسڵی سەرمادا و ماڵماڵین و چێشتلێنانی نیوەڕۆ وە لەو شوێنانەی کە راتبە دووژمەیە، بگرە تا هەموو ئەو ئیشانەی کە لە نێو ماڵێکدا ئەنجامدانیان پێویستە.

## بەزمی کابان

ئەوانە بەجێی خۆی کە سوختەی بێچارە دەبێ شانیان وەبەردا و کوڵیان پێوە هەڵبگرێ؛ دەردێکی دیکە کە سەرباری هەموو دەردانە ئەوەیە کە لەبەر بەشدار نەبوونی گەلێک لە حوجرەکان لە دەفر و ئامانی پێویست، فەقێکان بۆ راتبەکردن چوونە هەر ماڵێک پێخۆریان بۆ دەدەفری خۆیان دەکەن، لەو نێوەشدا هێندێک قاپ و ماپ، یان دەگۆڕێن و یان هەرون دەبن و کابانیش تین بۆ فەقێ دێنێت کە قاپەکەی بۆ بدۆزیتەوە و تەنانەت ئەگەر بۆ خۆشی قاپێکی لێ ونبێ لەوانەیە هەر بە سەر فەقێیدا بێنێت.

سوختەی بەستەزمانیش تازە قاپێکی ونبوو لە نێو دێیەکدا چۆن و لە کوێوە وەبینێت. روو لە هەر ماڵێک بکات بە دەستی بەتاڵەوە دەگەڕێتەوە. چونکو ئەو قاپەیان هەر لە دەستی کابان خۆی ون بووە یان ئەگەر فەقێش ونیکردبێ و لە رووی نەزانینەوە دابێتی بە ماڵێکی تر ئەوە کابانی ئەو ماڵەشیان لێی دەگۆڕی و بە ئیخۆی دەزانێ و یان لەبەر ئەوەی کە بۆ خۆشی قاپی لێ ونبووەجا بە هەر هۆیەکەوە، لێی ون بووبێتدەیکا بە هی خۆی و تازە نایداتەوە بە فەقێ و دەبێ، فەقێ خۆی تاوانی بدات. لەوانەشە ئەگەر زۆر لە قاپەکە هەڵسووڕێ تاوانبارتریش ببێ و تووشی کابانێک ببێ کە لەباتی وێدانەوەی قاپ پێی بڵێ: خۆ بە خوای فەقێگیان زۆر لە مێژە قاپێکی خۆشم ونبووە، هەر داومە بە تۆش، هاها وەبیرت نایە ئەوێ رۆژێ لە پاوەکەم بۆ تێکردی؟ ئەوە هەر دەمگوت پێتدەڵێم: بۆمبێنیەوە!!

هەرچەند ئەو رێز و حورمەتەی خەڵکی مسوڵمانی کورد بۆ فەقێی دادەنێن جێی رێز و ئەو زەحمەتەی پێیەوە دەکێشن جێی شانازییە و زۆر پیاوانە ئەرکی بەڕێوەبردنی

هیچ شتیّک دریّغی ناکەن و زۆرجار لە زمانی ئەو خەڵکە مسوڵمانە دەبیسین کە دەڵێن: «هەر دێیەک فەقێی لێنەبێ چۆڵ و وێرانە و بەکەڵکی لێبوونێ نایەت» بەڵام «چەم بێ چەقەڵ نابێ» و «دنیا بیشەیە و هەموو شتێکی تێدایە» و هەڵدەکەوێ لە ئاوەدانی یەکدا ژنێک یان چەند ژنی وای تێدابێت کە قاپێکی خۆشتر بوێ لە فەقێیەک و لەبەر ئەوەی کە لێی ونبووە بەزمی پێبگێڕێ و وایلێبکات سەری لێبشێوێنێ و تەنانەت ناچار بە رۆیشتنیشی بکات!!

زۆر فەقێ کێشە و هەڵلای نێوان کابان و فەقێیان کە لەسەر ونبوونی قاپ و شتیوا رووی‌داوە، جایان بەسەر خۆیان هاتووە و یان بە چاو دیویانە و یان بۆیانگێردراوەتەوە، بە هۆنراوە نوسیوە و بەو شێوە دەردەدڵیان کردووە.

ئەمنیش لێرەدا بەسەرهاتێک دەنوسم و بۆ وەی سەرنجراکێشیش بێت لە قەدەر ئەو بەسەرهاتە و لە سەر ئیزنی هۆنەرانی بەڕێز خۆم دەکەم بە شاعیر و بەوهیوایە کە لە هەڵەکانم چاوپۆشی بکەن بە شێعر دەیگێڕمەوە:

## کێشەی نێوان فەقێ و پوورەخەج

یەک لە رۆژانی عومری بەسەرچووم
لە ترسی سەفەربەر[1]، بە سەفەر چووم
بوومە میوانی ماڵێک لە دێیەک
کە لێی جێگیربوون قوڵە فەقێیەک
ژینیان بە شێوەی راتبە و جومعانە
دەبردە سەرێ بە بێبەهانە
پێیان‌وابوو ژین ئەوان دەیزانن
خەڵک لە خۆشی نامۆ و نەبانن

١ ـ سەفەربەر: رەشبگیر (هەنبانە).

سەرەنجام بوّوان کراوە تاپۆ
خەڵکی دی دەکەن هۆهۆی بێ کۆکۆ

چوومە ژوورەوە دانیشتم تەنیا
لە سەر سەری من دەگەڕا دنیا

بە فکر و خەیاڵ ڕۆیشتم شەوێ
ئەو جێی کە دەمویست گەیشتم بەوێ

ئەو کاتەی لە نێو عاسمانی خەیاڵ
بۆم دەبزاوت شاپەڕ و شاباڵ

لەپڕ دەنگێکی بە سۆز و ناڵە
هێنامیە دەرێ لەو بیر و حاڵە

«راتبە رەحمەتو لێ بێ» ی فەقێ بوو
داوای بژیوی لە پوور خەجێ بوو

هەر هێندەم زانی پووریّ دەرەڵ بوو
زار و زمانی لەدەست بەرەڵ بوو

دیار بوو پوورە خەج لێی ون بوّە ئامان
بۆیە فەقێکەی هێنا بۆ ئامان(١)

دەیگووت فەقێلە بۆ حەیا ناکەی
تاکەی پێت بڵێم بۆو قاپە تاکەی؟

بۆم پەیداکەوە دەنا بە قورئان
لێم وەرناگری تاقە لەتێک نان

بەو پێغەمبەرەی خوا خۆشی دەوێ
رقم هەستێنی بۆت دێمە ئەوێ

سکاڵات[١] لە لای مەلا لێدەکەم
ئیشی خۆم لەوێ جێبەجێ دەکەم شە

فەقێکە دەیگوت پووری بەدینت
بە خوا و پێغەمبەر بە مەرگ و ژینت

ئەمن ئەو قاپەم ون نەکردووە
ئەوەی تۆ دەیڵێی من نەمبردووە

هەرچی بردوومە بۆم هێناویەوە
چت داوە بە من زوو وێم داویەوە

وردە، وردە شەڕ گەرمتر دەبوو
شیتە[٢]ی پوورە خەج هەر پتر دەبوو

قبووڵی نەبوو ئایین و رەدا
بێبەزەییانە دژمێنی[٣] دەدا

فەقێی لێ قەوماو لەوێ دامابوو
کوڵی گریانی لە ئەوکێ مابوو

کە دی پوورە خەج دەس هەڵناگرێ
گوێچکە بۆ قسەی کەس راناگرێ

خودا خودای بوو لە کوڵی وەبێ
لە کۆڵ بەختەکەی کڵۆڵی وەبێ

منیش کە دیتم ئەو شەڕ و کێشە
سەربەخۆ کەوتمە بیر و ئەندێشە

١ - سکاڵا: هەڵرشتنی داخ و خەفەتی دڵ لای یەکێک. (خاڵ)
٢ -شیتە: قیژە. (خاڵ)
٣ - دژمێن: جوێن، دژمان. (هەنانە)

دەگـــەڵ فـــەقێلەی بـــێبەش و بـــارە[١]
کـــەوتمە وت و وێـــژ لە مـــەڕ ئـــەوکارە
گـــوتم ئـــەی بـــرای بـــێقەدر و نـــازم
کـــارای بـــێبەش و ئـــاواتـــەخوازم
بـــۆ دەبـــێ ئـــاوا بـــێڕێزبی لامـــان
نـــەخەینە ژێـــر پـــێت گشت مـاڵ و سـامان؟
خـــۆ تـــۆ نـــەبوایـــەی ئـاوا نـــەدەبوو
گـــەلمان بـــێ زانکـــۆ و بـــێوانـــە[٢] دەبـوو
لە ســـــایەی دەرس و دەوری تـــۆوەیە
خـــاوەن مـــێژویین، هـــەر لە تـــۆوەیە:
یـــاسای شـــەریعەت کـــە مـــاوەتەوە
خـــەڵک لە ســـایەی حـــەساوەتەوە
هـــۆنراوە و پـــەخشان تـــۆ راتگـــرتووە
ئـــەدەبی کـــوردیت پـــێ رەنگـــاندووە
فـــۆلکلۆری کـــوردی لە ئـــەفسانەوە
هـــەم ســـەرگوزەشتە بـــە داســـتانەوە
پـــەندی پـــێشینیان مـــەتەڵ و مـــەسەل
بـــڕوا و روســـمەکـــانُ رەســـەن و تـــەسەل
شـــێعر و مـــۆسیقا و گـــاڵتە و گـەپ هـەمووی
چـــی قسـەی خـۆشە گشـتی مـوو بـە مـووی
هـــەر لە تـــۆوەیە کـــە ئـــێستا مـــاون
نـــاوێکیان هـــەیە و لە نـــاوا بـــاون

---

١ -بارە: بەهرە و داهات. (هەنبانە)
٢ - وانە: دەرس. (خاڵ)

زانـــــای بـــەنرخ و پســـپۆڕ[١] و هــۆزان[٢]
گـــەورە پـــیاوانـــی هـــەڵکەوتووی هـۆزان[٣]
هـــــەرچـــــی هـــــەمانە هــــۆنەر و نــوسەر
گشــــتیان لە حـــوجرە ســـەریان هـێنا دەر
مـــــەلای جـــــزیری و ئـــەحمەدی خـــانی
ســـــالم و مـــــەحوی هــــەم بــــێسارانــی
شـــێخ رەزا و زیـــوەر، ســەی یــاقۆ و مـەجدی
ئـــەحمەدی مـــوختار، حـــەریق و حـــەمدی
ســــــالمی ســـــنە و مــــەلای جــــەبباری
کـــــوردی و پـــیرەمێرد مـــەولەوی و نـــاری
نـــــالی شـــــارەزای دەشـــــتی شـــارەزوور
حــــاجی قـــــادری قــــەبر پــــڕ لە نــوور
ئـــــەو ئـــــەستێرانـــــەی کــــە گــــەشانەوە
بـــــــە ئـــــاسمانەکـــــەی ئـــــەدەبمانەوە
دەیــــــانیتریش کــــــە وەکــــــوو مــــــەردان
نــــــەخشاندیان مــێژووی ئــەدەبی کــوردان
راژەی ئـــــــــایین و گــــــــەلیان گـــــرتەبەر
مــــەرجـــی پـــیاوەتیان بـــەست و بـــردەسەر
هـــــەموو بــــە نــــانی حــوجرە پــێگــەیین
لە دیـــــن و ژیـــــن و دنـــــیا تـــێگــەیین

---

١ - پسپۆڕ: چازان و لێزانی کار. (هەنبانە)
٢ - هۆزان: هەڵکەوتوی بلیمەت. (خاڵ)
٣ - هۆزان: هۆزان لە نیوە شێعری دووهەمدا کۆ (جمع)ی هۆزە کە بەچەند ماڵێک دەڵێن بچنەوە سەر یـەک

کەسێک بە هێدی و هێمنی بڕوانێ … لە مێژووی ئەدەب زۆر چاک دەزانێ
کێ هەوڵی داوە لە بۆ رزگاری … بە بەشمەینەتی و کزی و هەژاری[1]
کوردی مسوڵمان با بیرکاتەوە … مێژوی ئەدەبی خۆی لێکداتەوە
دۆست و دوژمنی دەبێ بناسێ … بە هاوکاری دۆست لە دوژمن راسێ
هەروەک رابردوو قۆڵی هاوکاری … هەڵماڵێ دەگەڵ تۆ بە لەباری
رێزت بۆدانێ بە جوانی و پیری … قەدرت بزانێ وەکو (زمزیری)

سەرەڕای ئەوانەش بە فر و قورگێرە کردن، هەڵخلیسکانی سەرسەهۆڵ، لەبەر سەرما هەڵلەرزین و لە دەرکان سەگەل پێوەرین و لەگەرمان و لە شەرمان ئارەق سڕین، هۆ گەلێکی‌ترن بۆ سەخڵەتی و سەرگەردانی سوختە جا بۆیە دەڵێم ئەوەی نێوی لێناوە:

---

١ - بەڵێ شاعیرە هاوچاخ (معاصر)ە ناودارەکانیشمان وەک هەژار، هێدی و هێمن و... یان دەوری فەقێیەتیان بە تەواوی دیوە یان بەشێکی زۆری تەمەنی پڕبایەخیان لە حوجرە بردۆتە سەر و سەرەتای خوێندن و فێربونیان لەوێدا بووە و بناغەی کۆشکی زانست و زانیاری‌یان بە فەقێیەتی و لە حوجرەدا رشتووە کە ئێستا سوارچاکی مەیدانی راژەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردین و لەو مەیدانەدا زۆر شاکاریان وە دەرناون و گەلێک حەماسەیان خوڵقاندوون و دەگەڵ هەموو هەل و مەرجێکدا هەڵیان‌کردووە و هێدی و هێمن هاتوونە سەرێ و بە نەداری و هەژاری کتێبخانەی کوردیان لە هەژاری نەجات‌داوە و بەرەو دەوڵەمەندیان هێناوە.مامۆستا هەژاری مکوریانی لە ژێنامەی خۆی‌دا کە لە شەرەفنامەکەی داهاتووە دەڵێت: چێشتانی شەشی شابانی ١٣٣٩ی کۆچی هاتومەتە سەر دنیایە، چونکە بابم مەلا بووە و بەچکە سۆنە لە سەریەتی مەلە فێربی... بە پێنج ساڵی پێم خوێندراوە و دوای سیپارە و باغەبان و یاقیدە و سولتان جومجومە و سەنگتراش و چەند وردە کتێبی دیکە ناردراومە سوختەخانە و لەوێوە چومە مزگەوت و بومە فەقێ و گوڵستان و بۆستان و سەرف و نەحوی عارەبیشم مل‌لێناوە و بۆ دەقنە (دەقنە: پارسەک‌کردنی فەقێ، نان چنینەوە لە ماڵان.هەنبانە ) دەرگام کوتاون و بۆ راتوە گوندان گەڕاوم و زۆر مامۆستا و زۆر فێرگەم ئاڵ و گۆڕکردون و بەهیوابوم ببمە مەلا و جێی باپیران بگرمەوە.

«سوختە» نیشانی داوە کە زانایە و زۆر بە باشی بەرابەری بە نێو و خاوەن نـێو «اسـم و مسمّی» کردووە.

هەرچەند گوتویانە ساڵ بە ساڵ خۆزگە بە پار بەلاّم سوختەکان بە پێچەوانەی ئەو پەندە ئێستا لە رابردوو، حاڵیان زۆر باشترە، وەک دەگێڕنەوە تا بیست ـ سـی سـاڵێک لەمەوبەر سوختەکان زەخت و زەحمەتێکی زیاتریان لەسەر بووە و لە لایەن گـەلێک لە موستەعیدەکانەوە سەگ بە حەسار[1]یان پێ کراوە و لێرولەوێ دراون و دەگەڵ ئەوەش دا لە ئازادیەکی زۆرکەم بەهرەمەند بوون.

وەک باس دەکەن سوختە سەرەڕای ئەو ئیشانەیکە ئێستا بـە ئـەستۆی وەن زۆر ئیشی تریشی لە هێندێک شوێن و لە لایەن بازە موستەعیدێکەوە بۆ دیـاریکراوە. وەک راخستن و هەڵگرتنی جێگاوبانی موستەعید، کەوش بۆدانان و لەبەر هەستانی و هەروەها شوشتنی جل و بەرگ بۆی و ئەوجۆرە شتانە کە دەبویا هەر ئەنجامیانبدا.

لە هەمووی سەیرتر دەڵێن هەق بە سوختە نەدراوە کە بە ئیشتیای خۆی قسەبکا یان پێبکەنێ و تەنانەت رادەی قسەکردن و پێکەنینیشیان لە شەو و رۆژدا بۆ دیاریکردوە و دەستوری پێدراوە لە کاتی دانیشتن دا بە زۆری لە سەر چۆک دانیشێ.

هەرچەند پێویستە لە هەموو کۆمەڵگایەکی مرۆڤی دا نەزم و یاسا هەبێت و گەورەیی و چووکایەتی بپارێزرێت و بگرە لە ماڵێک دا کە بنکەیەکی چکۆلەیە لە کۆمەڵگای گەورەی مرۆڤ ، ئەگەر گەورەیەک و کاربەدەستێک نەبێ کە رێکخەر و رێبەری ئـەو بـنکەبێ و رێنوێنی چکۆلەکان بکات و کار و باریان بۆ دیاری بکات و ئەگەر یەکێک لە ژێر باری بەرپرسیەتی چۆ دەرێ لێی وە جواب بێت، جایان هـەموو ئـەندامـەکـان تـێکرا بـبنە کاربەدەست و کەس خەتی کەس نەخوێنێتەوە و هەرکەس بە مەیلی خۆی بجوڵێتەوە چی پێخۆش بوو ئەوە بکات، یان هەر هیچکەس خۆی بە بەرپرس نەزانێت و گوێ نەداتە هیچ کارێک، ئەوە ئەو ماڵە راناوەستێ و زۆر بە زوویی لێکهەڵدەوەشێ.

پێدا بڕۆ ئەگەر لە نیشتمانێکدا کەسێک یان لیـژنەیەک دەسـەڵات بـە دەسـتەوە

---

١ ـ سەگ بە حەسار: برێتی لە هێنان و بردنی بێفایدە. (هەنبانە)

نەگرێت و کاروباری رامیاریی[1] و ئەرکە پێویستەکانی دیکە بەڕێوە نەبات، جا، یان هیچکەس گوێ بە هیچ شتێک نەدات و یان هەرکەس بەیانی زوو لە خەوێ هەستا داوای رێبەری بکا، ئەوە چی پێناچێ کە ئەو ولاتە نەک هەر لە رێسمە دەچێت بەڵکوو خەڵکەکەشی تێک بەردەبن و دەبێتە پێگەی لاوەکیان[2] و لە هەر لایەکەوە تەماکار رووی تێدەکەن و تۆزێی بە حەوا هەڵلا دەبەن. ئەوە لە لایەکەوە بێگومان وایە و سەلمێندراوە بەڵام «هەموو شتێک بە خۆی و خوێش بە مانا».

ئەمەی گوترا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی رابوردوو و تەنانەت مامۆستاکانیشم ئەو دەورەیان بە تەواوی نەدیوە و خۆشبەختانە ئێستا بە پێی ئەو مەسەل (ضرب‌المثل)ە رەفتار دەکرێت و ئەو ئیشانەی کە بە ناهەق لە لایەن هێندێک موستەعیدەوە دەخرایە سەر سوختە لە سەری نەماون و ئێستا سوختە بە مانای راستی وشە ئازادە. جارێ، رێگای قسەکردن و پێکەنینی لێناگیرێ و لەوانە و هەروەها لە چۆنیەتی دانیشتن و هەر هەڵس و کەوتێکی دیکەی رەواش‌دا بە ئارەزوی خۆی دەکا و دەتوانم بڵێم دەگەڵ موستەعید لە مافی ژیان‌دا هیچ جیاوازیەکی نییە. ئینجا مەگەر بە پیاوەتی خۆی دەنا، نە جێوبان بۆ موستەعید رادەخا و هەڵدەگرێ و نە کەوشی بۆ دادەنێ و نە شیوی بۆ دەکا و نە لە سەریشی پێویستە کە لەبەری هەڵبستێ مەگەر بە ئیشتیای خۆی وەک رێزدانان و پارازتنی چوکە و گەورایەتی. ئەمجا موستەعیدیش هەق بە خۆی نادا لە سوختە توڕە ببێ و گلەیی لێبکا لەسەر نەکردنی ئەوکارانە.

بگرە ئێستا موستەعیدەکان لە ئەنجامدانی زۆر کاری ناو حوجرەش‌دا هاوکاری سوختەکان دەکەن و وەک برایەک چاویان لێدەکەن و موسوڵمانیش هەموو برای‌یەکن و لەوەدا منەتێک نییە.

هەڵبەت برا سوختەکانیش لەو هاوکاری‌یە کەڵکی خەراپ وەرناگرن و بۆ ئەوەی بێنەزمی و شێواوی لە حوجرەدا روونەدات و کارەکان بە لە باری بەڕێوە بچن و لەبەر ئەوەش موستەعیدەکان‌یان مامۆستای بوون و هەن، یان بە هەر حاڵ لەو پتریان خوێندووە

---

۱ - رامیاری: سیاسەت (هەنبانە)

۲ - لاوەکی: بێگانە، غەوارە (هەنبانە)

و پلەی مامۆستایەتیان بۆی هەیە و لەوانەشە رۆژێک ببنە مامۆستای و یان لەبەرئەوەی لەوی بەتەمەنترن و پلە و پایەی مامۆستاش بەرزە و رێزدانانی چکۆلە بۆ گەورە پێویستە رێز و ئیحتیرام بۆ موستەعید دادەنێت و بەگەورە و دڵسۆزی خۆی لە قەڵەم دەدات و لە زۆر ئیش‌دا پرس و رای پێدەکات. کاروباری بە قسە ئەنجام‌دەدات و تەنانەت بۆ زۆر کاریش وەک چوون بۆ سەفەر و ئەوانە ئیزنی لێ‌دەخوازێت.

ئەوەبوو مانای سوختە و ماوەی سوختایەتی و ئەرکی سەرشانی و ئەو گێرە و کێشەی لەو ماوەدا تووشی دەبێ و هەروەها جیاوازی ژیواری سوختەی ئێستا دەگەڵ سوختەی رابردوو لە ماندویی و ئازادی‌دا.

ئەوەی کە لێرەدا زۆر سەرنج‌راکێشە و نیشاندەری ورە و ئازایەتی و لەخۆبوردویی فەقێکانە و جێی شانازی هەر مرۆ ێکی موسڵمانە ئەوەیە کە دەبینین فەقێکان سەرەرای ئەو هەموو کەند و کۆسپەی کە لە رێگایان دایە و ئەو هەموو گیروگرفتەی کە لە ماوەی خوێندن‌دا یەخەیان پێ‌دەگرێت، بە ژیانێکی زۆر ساکار و کوڵەمەرگی، تەنیا بە خاتری خزمەت بە ئایین وگەل درێژەیان بەو خوێندنە هەرداوە و ئەورێیە پڕ لە کەند و کڵۆیەیان هەر پێواوە و قەتیش لێ‌ی لانادەن و مەودا بە ناحەزان نادەن:

## نەبەزین

بەڵێ بە سەت نالەباری    بە هەزاران خەفەتباری
دووری لە خزم و داک و باب    بە دڵی برژاو، وێنەی کەباب
بە بەرگ و پۆشاکی دڕاو    بە باخەڵی دوور لە دراو
سەرگەردانی و دەربەدەری    ئاوارە بوون، چەرمەسەری
هەزاران پەژارە چەشتن    بە باران فرمێسک رشتن
تەنانەت بە رۆژی جێژن    زارە خوارە لە پیرێژن
دوور لە خۆشک و برا و کەسان    ئاتاجی دەستی ناکەسان
لالانەوە و پاڕانەوە    هەڵسوڕان و چەوسانەوە
لە دێ بۆ شار لە شار بۆ دێ    پێوانی گەلێک کوێرە رێ

نوستن لە بەردەستە چیلە — نووسینەوەی بەرفتیلە
بەڕەی سەدساڵە ڕاخستن — بە لێفەی پڕ پینە نوستن
لە حوجرەی کۆنی پڕمشک — هێلانەی مار و دووپشک
سارد هەروەکوو سەری قەندیل — ناخۆش وەک جێی ئەسیر و دیل
گەلێک وڵات سووڕانەوە — بوخچەی گۆڕین بە شانەوە
چەند جاران سەگەل پێوەڕین — گرتن و داوێن هەڵدڕین
گەلێک دەرکا و دەرککردن — ئابڕو و حەیا تەرککردن
لە هاوینا تینی گەرما — چەقو چۆ و لەرزینی سەرما
کەند و کلۆی سەر ڕێ بوون — دەگەڵ فەقێ هاوڕێ بوون
بەڵام دەگەڵ ئەو حاڵەشدا — دەگەڵ ئەو ژینە تاڵەشدا
خوێندن ڕێبازی وانبووە — جێگای شانازی وانبووە



**سوختەکان کارەکان دابەش دەکەن**

## دابەش کردنی کارەکان

کاتێک سوختەی یەک حوجرە رادەیان لە کەسێک زیاتربوو بۆ ئەوەی هیچیان لە هیچیان ماندووتر نەبن و باشتریش بەکارەکانیان رابگەن، کارەکانی حوجرە بەسەرخۆیاندا، دابەش دەکەن و پاشان پشکیان لی داوێن و هەرکەس بە مەلا «هەوەڵ» دەرچوو بە ئیشتیای خۆی چ کارێکی پێ خۆش بوو هەڵی دەگرێ و لە پاش ویش نەفەری دوایی کارێک هەڵدەبژێرێ و هەر بەو شێوە تا کۆتایی بە کەس و کارەکان دێ.

ئەگەر لە نێو سوختەکاندا کەسێکی وا هەبێ کە زۆری خوێندبێ یان لەوان بە تەمەنتر بێ وەک رێزدانانێک بۆی، نایەڵن کاری دەرەوەی حوجرە ئەنجام بدات و وەنێو ئاوەدانی بکەوێ جا بۆیە زۆرتر گەسک لێدان و چایی سازکردن و تێ کردن بۆ ئەو کەسانەیە کە خەریکن لە سوختایەتی دەربچن یان بە تەمەنن و دەرکیان لێ عەیبترە.

## هۆی دواکەوتن

هۆی ئەوەش کە بازێک لە سوختەکان تەمەنیان زۆرە و هەر لە سەردەمی سوختایەتیش دان چەند شتێکە: یان ئەوە تا ئەوجۆرە کەسانە درەنگ دەست بە خوێندن دەکەن. یان لە کاتی پێویستدا دەستیان بە خوێندن کردووە و بەلام لەبەر ئەوەی زەینیان کوڵە و لێ هاتوویی خوێندنیان نییە، توانای سەرکەوتنیان کەمە و ئەگەر ببنە مەلاش چ لە چ نازانن و مەگەر لە قەدەر بەرەی خۆلاقان راکێشن دەنا لەباتی قازانج زیانیشیان دەبێ.

یان وا هەیە فەقێ زیرەکە و ئامادەیی خوێندنیشی تێدایە و بەلام هەست بە لێپرسراوی «مسئولیت» ناکا و بە پێی پێویست خەریکی دەرس و دەور نابێ و کاتی خۆی بە فێرۆ دەدات و بێ خەمە و بێ خەمخۆریشە.

هۆیەکی دیش ئەوەیە کە هەڵدەکەوێ ئەو فەقێیە تووشی مامۆستایەک دەبێ کە نەزانە و شیاوی مامۆستایەتی نییە و ئەگەر دەرسیشی پێ بڵێت بێ کەڵکە و دەبێ رۆژێک هەر بگەڕێتەوە دواوە.

وادەبێ فەقێ مامۆستاکەی زاناشە بەڵام دڵسۆز نییە و بەرژەوەندی فەقێکە ناگرێتە بەرچاو، جایان دەرسی زۆر دەچوێنی یان دەرسیشی پێبڵێت وای پێناڵێت لێی حاڵی ببێت و سودی لێوەربگرێت و فەقێی فەقیر ئەگەر لەکاتی خوێندنیشدا هەست بە خراپی دەرسەکانی نەکات، رۆژێک دێ کە تووشی مامۆستایەکی زانا و دڵسۆز ببێ و تێی بگەیەنێ کە هیچ فێرنەبووە. یان پاشماوەیەک بۆ خۆی تێبگا کە هیچ لە هیچ نازانێ و تەمەنی بە بێهوودە رۆیوە و بە ناچاری بگەڕێتەوە دواوە و سەر لە نوێ ئەو کتێبانەی کە بە نێو خوێندونی و پەڕی لێهەڵدانەوە، ئەوجار بە لەباری بیانخوێنێتەوە و سوختایەتیەکەی لە نوێوە دەست پێبکاتەوە و چەند ساڵی دیشی لە تەمەنی پڕبایەخی بۆ تەرخان بکات. با بەسەر و سمێڵیش مەلایەکی تەواو بێت.

## داخی داخانم

بەداخەوە لەبەر ئەوەی کە تاقیکردنەوەی رەسمی بۆ فەقێکان نییە و مشورخۆرێک[1] دەست ناکەوێ کوڵیان پێوە هەڵگری و چاک و خراپیان لێک هەڵاوێری و بە بێژینگی تاقیکردنەوە، سەرکۆت[2] و بن بێژینگیان لێ جیابکاتەوە، هەرچی راستبۆوە دەتوانی بە نێوی فەقێ جێی خۆی بکاتەوە، لە بەرگی پیرۆزی فەقێیەتی کەڵکی خەراپ وەربگرێ و سپەی رۆژیش بە پۆشینی بەرگی مەلایەتی خۆی بکا بە مەلا و دیلمانجی[3] بەینی خودا و خەڵک و دەمراستی ئایین، کە ئەودەم بە دانی فتوای خەڵەت و نیشاندانی ئایین بە دیوی بەراوەژوودا، زیانێکی زۆر لە ئیسلام و مسوڵمانان دەدات و قسە هەڵە و چەوتەکانیشی بە حیسابی دین دەگیرێن و ئایینیان پێ لەکەدار دەکرێت.

جا ئەوانەی کە لە رووی نەزانیەوە زیان دەگەیێنن بەجێی خۆی کە ئەوان نەزانن و زۆریشیان نازانن کە نەزانن، بەڵام دەردی سەرباری هەموودەردان کردەوەی بێدینانەی ئەو کەسانەیە کە لە ئاینیشدا بەڵەدن و تەنانەت بەرگی مەلایەتیشیان پۆشیوە بەڵام یان لە

---

١ - مشورخۆر: کەسێکە کە بە تەنگ شتێکەوە بێ و هەوڵی بۆ بدا. (خاڵ)

٢ - سەرکۆت: سەربێژنگ لە کاتی دەغڵ گێژەو کردندا. (هەنبانە)

٣ -دیلمانج: پاچڤەکار، تەرجمان. (هەنبانە)

ترسان یان لە برسان یان بۆوەی نێویان بێتە نێو باسان یان بەو مەبەستەی خەڵکیان بۆ بێتە بەردەسان زۆر کردەوەی وادەکەن فری بەسەر ئیسلامەوە نییە و تەنانەت لە ئایین‌دا پێشگریشی لێکراوە. خۆ بابای دین دوژمنیش چ نەزان بێ و چ زانا لە پەڵپێک دەگەرێ کە گروی لە سەر بگرێ و ئایینی پێبکاتە ئامانجی تیر و توانج و پلار و یەکێکی پێبکا با نەیکردبێ بە دەوار.

ئیتر ئەو چاوێک ناخشێنی بە ناوەرۆکی قورئان و حەدیس و شەرع و کردەوەی پێغەمبەر (د) و یارانی و مێژووی ژیانی مسوڵمانە راستەقینەکان.

بەڵێ ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەدەست ئەو دوو تاقمانە: «کوێری خۆ بە چاوساغ نوێن و چاوساغی کوێر خەڵەتێن» زیانی زۆر دیوە و پریشکی زۆری وێ هەڵپەریوە بۆیە برێک لە کورە کرچ و کاڵ و پێنەگەیشتو و تێنەگەیشتووەکانی پەریوەی هەندەران دەبن و دەهۆڵێ بۆ لاوەکیان، لە ئیسلامە بێ گەرد و خەوشە تۆمەت لێدراوەکەی خۆیان هەڵدەگرن و تا ماوەیەک دەچنە نێو بیری سەرلێشێواوی و بەرە و بیرۆچکە پر لە سەرگەردانیەکان هەنگاو دەنێن و بەر لە پێش کەوتنی کۆمەڵەکەیان دەگرن.

بەو پێیە دەردەکەوێ کە پێشگیری لەو دوو تاقمە زیانبارە ئەرکی سەرشانی هەموو مسوڵمانێکی دڵسۆزە و لەسەر هەر مسوڵمانێک بە گشتی و مامۆستا ئایینی‌یەکان بەتایبەتی پێویستە هەنگاوی شوین‌دانەر لەو رێیەدا هەڵگرن، تاکوو ئیسلام چی دیکە بە هۆی کردەوەی دیاری نالەباری لە ئیسلام نەبانەکانەوە خەوشدار[١] نەکرێت و لە دژ کردەوە[٢]ش‌دا مسوڵمانە نەگووراوەکان سیس و وشک نەبن و نەبنە قنگەلاشکی بەربای پروپاگەندەی نە یاران و پەرەوازەی ئێر و ئەوێ نەکرێن.

هەرچەند لەو رۆدا بەرگرتن لە چاوساغی کوێر خەڵەتێن زۆر چەتوونە و جگە لە دڵسۆزی نواندن بۆیان و خوێندنەوەی ئایەتە پر لە هەرەشەکانی خوا بەسەریاندا رێیەکی دی نییە، پێشگری لە کوێری خۆ بە چاوساغ نوێن ئاوا چەتوون نییە و چاری هاسانە ئەوەندەی دەوی زانایانی دینی پێوەندی‌یەکی پتەویان بە یەکەوە ببێ و بەرنامەی مەلا و

١ - خەوشدار: عەیبدار.

٢ - دژکردەوە: عکس‌العمل.

مەلایەتی رێک و پێک بکەن و کەسێک کە بوو بە مەلا کارێکی پێ‌بسپێرن کە لە توانای‌دا بێ و کەس نەتوانی لاقان لە بەرەی خۆی تێ‌بپەڕێنێ و هەر ئیشێکی بۆی هەڵکەوت خۆی لێ‌بکا بە وەستا و دینی خۆی و خەڵکیش لەبەین بەرێ. چونکو درۆ نییە کە کوتویانە: کوڵکە مەلادین می‌برد، کوڵکە وەستایان کوڵکە دوکتورجان می‌برد.

هەنگاوێکی کە دەتواندرێ لەو رێیەدا هەڵبێندرێتەوە ئەوەیە کە هەر لە سەرەتای خوێندن‌دا فەقێ بخرێتە ژێر چاوەدێری و هەڵسەنگاندن و تاقی‌کردنەوە و ئەوەی لە ژێر تاقی‌کاری دەرنەچێ و ئامادەی خوێندن نەبێ پێی نەخوێندرێ.

هەر بەڕاستی فەقێیەک کە لێهاتوویی خوێندنی نییە بۆچی بە خۆڕایی نانی حوجرە بخوا و رەنجی دەگەڵ بدرێ و لە ئاکامیش‌دا هیچ فێرنەبێ و رەقە پشت و دەستەوسان باربێ و لە کیس دایک و بابانیشی بچێ و دوای چەندسالان ئیروئەوێ راوکردن و ئەو هەموە تاسە و هیوای دایک و بابانی بووەی کوڕیان بۆ دەبێتە مەلا، وەک زەبەلاحێکی[1] بێکارە و بێ‌هونەر بۆیان بەڕێ بکرێتەوە و ئارەزۆکانیان بینە بڵقی سەرئاو؟

بۆیە باش وایە ئەگەرچی تاقی‌کردنەوەی رەسمی و گشتیش لە ئارادا نەبێ ماموستاکان چ مەلا و چ موستەعیدەکان شاگردەکانیان بخەنە ژێر چاوەدێری و بە هۆی دەرس پێ‌گوتن و لێ‌پرسینەوە، رادەی زەین و زیرەکی و لێ‌هاتوویی‌یان هەڵسەنگێنن و کەسانێکی کەلێ وە شاوەیی خوێندنیان نییە و هەر لە ماکا[2] کەودەن[3] و بێ‌کەڵکن، دەرسیان پێ‌نەڵێن و تێیان بگەیێنن و بە خۆشی و لە رووی بەڵگەوە حاڵییان بکەن کە خوێندنیان لەدەست نایە و تا تەمەنیان تێپەڕ نەبووە و هەڵیان لە دەست نەچووە روو بکەنە ئیشێکی دی، باشترە.

چونکو ئەوجۆرە کەسانە کە سەلیقەی خوێندنیان نییە لەوانەیە لە زۆر پیشە و ئیشی دی‌دا سەررشتەیی‌یان هەبێ و سەرکەوتنێکی زۆری تێدا وەدەست‌خەن.

من رام‌وایە ئەوجۆرە فەقییانەش کە زیرەکن و بەڵام تەمبەڵی دەکەن و مل نادەنە

---

١ - زەبەلاح: زلحۆرت، تەژەی ناقولا (هەنبانە).

٢ - ماک: ریشە و بناغەی شت. (خاڵ)

٣ - کەودەن: مەردومی نازیرەک. (خاڵ)

خوێندن، دوای ئامۆژگاری کردن و هەوڵ دەگەڵدانیان بۆ هێنانە سەر تێکۆشان و ڕەنجدان لە پێنا و خوێندن و فێربووندا، ئەگەر هەر نەهاتنە سەرباری خوێندن و هەوڵی فێربونیان نەدا دەنگ بدرێن و وەلانرێن تاکو نەبنە سەرباری خەڵک و بە خۆڕایی نانی حوجرە نەخۆن و مامۆستا ئازار نەدەن و ڕۆژی دوایش دین نەکەنە پیشەی نان پێ پەیداکردن و پێ ڕابواردن!!

یەکی دی لە هۆیەکانی دواکەوتنی فەقێ ماتڵبوون خەریکبوونیەتی بەکار و بار و گیر و گرفتی ماڵی باوکیەوە لەبەر ئەوەی زۆربەی فەقێکان کوڕە فەقیرن و بەشێکی زۆریش لەگوزەرانیان لەسەر ماڵەوەیە، بەتایبەت ئێستاکە جومعانە نەماوە، بۆیە ناچارن دە ساڵێدا ماوەیەک با بە شێوەی کاتیش بێ دەست لە خوێندن هەڵگرن و ملبدەنە کار و کاسبی کە ئاکامەکەی دواکەوتنە لە خوێندن.[١]

## مجێوری فەقێیان

زۆر وا هەیە فەقێکان لە ئاوەدانیدا ماڵێک دەگرن بە مجێور کە بڕێک لە کارەکانیان وەک شتنی هەور و هۆڵ و ئاوهێنان و ئەوجۆرە ئیشانەیان بۆ جێبەجێ دەکات و ئەوانیش لە بەرانبەردا هێندێک شتی وەک ووردکە نان و وورده قەند و ئەو پێخورانەی لێیان زیاد دەبێ و جارجاریش بڕێک قەند و وادەبێ نانی ساغ و ئەوانە دەدەن بە ماڵی مجێور و بەوشێوە بڕێک لە کارەکان لە کۆڵ سوختە دەبنەوە و سەری سوکتر دەبێت.

لە هێندێک جێگایان کە دەستکەوتی مجێور بڕێک زۆر بێ فەقێکان بەڵێنی شتنی بەرگ و لیباس و ڕایخ و پێخەف لە مجێور دەستێنن و موستەعید و سوختە و بە زۆری موستەعید جل و بەرگ و ئەوانەی پێدەشۆن، بەڵام ئامرازی شوار[٢] وەکی سابون و شتیوا لەسەر خۆیانە.

---

١ - لە تویی پێنجەمدا لە ژێر سەردێری «دیسان دەردی دڵ و پێشنیار»دا ئەو مەبەستە زیاتر درێژە پێدەدەین.

٢ - شوار: شتن. (خاڵ و هەنبانە)

## دووهەم سەردەم، موستەعیدایەتی

«مستعدّ» وشەیێکی عەرەبی‌یە و ناوی بکەر «اسم فاعل»ە و لە وشەدانی[١] عەرەبی‌دا بە مانای: ساز و ئامادە، تەیار و لێهاتوو، هاتووە. بەڵام لە زاراوەی فەقێیەتی‌دا بە فەقێیەک دەگوترێ کە لە خوێندنداگەیشتبێتە کتێبی (جامی) یان پێهەڵلاتر، جا یان لە لای مەلا دەرس‌بخوێنی یان لە لای موستەعیدێکی باڵادەست.

دیارە فەقێ تا دەگاتە دەوروبەری جامی ئامادەیی پەیدادەکات و هەم بۆ دەرس‌خوێندن راهاتوو و باشتر دەبێت، هەم لێهاتوویی ئەوەش وەدەستدێنێ کە بتوانێ دەرس بە سوختە بڵێتەوە بۆیە لەوکاتەدا پێی دەڵێن موستەعید.

بەجێیە لێرەدا ئەوەش بڵێم کە تا ماوەی چەند ساڵێک لێرەوە پێش، «جامی» و هەروەها «البهجةالمرضية» کە کتێبێکە لە دوو زانستی «نحو و صرف»دا و راڤەی «الفيه»ی «ابن المالک»ی ئەندەلۆسی دەکا و «شرح‌النظام» کە لە زانستی «صرف»دایە و برێکیش دەبارەی خەت‌دا دەدوێ و راڤەی کتێبی «الشافيه»ی «ابن الحاجب» دەکا و بگرە لەوانەش بەرەو ژورتر هەر لە لای موستەعید خوێندراون. تەنانەت بیستوومە کە لە هەندێک شوێن «موستەعید» هەر بە ئاخر مادده خوێن گوتراوە و ئیتر فەقێ تا بە ئاخر و ئوخری خوێندن گەیشتووە هەر لە لای موستەعید دەرسی خوێندووە و بە سوختەش نێوبراوە.

بەڵام ئێستا فەقێ ئەگەر بگاتە جامی‌یەش باشە و واهەیە لە پێش ئەوەی‌دا بگاتە ئەو کتێبە خۆی دەکا بە موستەعید و دەچێ لە لای مەلا دەخوێنێ. بەڵام هەر ئەوەندەیە دەرسەکەی لە لای مامۆستای گەورەیە دەنا لەبەر ئەوەی کەم واهەیە فەقێ بەر لە گەیشتنی بە جامی توانای سوختە راگرتن و دەرس‌پێ‌گوتنی ببێ یان ئەگەر توانای ئەوەشی ببێ کەم واهەیە سوختە بۆ خوێندن بچێتە لای،کارەکانی حوجرەی هەر بە ئەستۆوەیە و ئەگەر زۆر رێزی بۆ دابندرێ کاری دەرەوەی حوجرەی پێ‌ناکەن.

---

١ - وشەدان: فەرهەنگ.

سوختەعید:

شایانی باسە کە فەقێ لە ماوەی خوێندنی کتێبەکانی نێزێک لە جامی و لەوێ بەرەوژێرتر وەک «تصریف ملا عەلی» کە لە زانستی «صرف» دایە و نوسراوی مامۆستا مەلا عەلی شنۆیی یە و ریسالەی «استعارە» کە لە زانستی «بیان» دایە و ریسالەی «وضع» کە لە زانستی «وضع» دایە و هەردوکیان دانراوی مەلا ئەبوبەکری میر روستەمین، با لە لای مەلاش بخوێنی بە زاراوەی نێو فەقێیان «سوختە عید»ی پێ دەگوترێ

ئەو وشەیەش تێکەڵ کراوە لە سوختە و لە عید، کە دوو پیتی «عید» لە وتەی موستەعید پچڕاون. واتە فەقێ لەوماوە خوێندنەدا نە سوختەیە و نە موستەعیدی تەواوە، یان لە هەردوک لای پێوەیە و سوختەیەکی نێزیک لە موستەعیدایەتی یە.

## ئەرک و سپاردەی موستەعید

فەقێ دەگەڵ ئەوە لە سوختایەتی رزگاری هات و بوو بە موستەعید، یەکەم شت کە پێی خۆشحاڵ دەبێت و کەیفی پێ دەکا، ئەوەیە کە رەنج و کوێرەوەری چاخی سوختایەتی وەک فەرمانبەری موستەعید و ئەنجامدانی ئیشی ناوەوە و دەرەوەی حوجرە و وەلامدانەوەی کابانی قاپ لێ ونبوو و ئەوانەی لە کۆل دەبێتەوە. نەک هەر دەحەسێتەوە بەلکوو دەبێتە فەرماندەرێک و ئەگەر بڕێک دادپەروەر و بە بەزەیی نەبێت بە نۆبەی خۆی زۆرکاریش کە ئەرکی سەرشانی خۆنی بە سوختەیان جێبەجێ دەکات و بەم شێوە تۆڵەی خۆی دەکاتەوە.

موستەعید جگە لە دەرس خوێندن و موتالاکردن و پێداچونەوەی خۆی، دەرس پێ گوتنی سوختەشی بە ئەستۆوەیە.

هەڵبەت واش نییە کە فەقێ هەر کە بوو بە موستەعید دەرس بە سوختە بڵێت. چونکوو چ سوختە و چ موستەعید دەبێ بۆ خۆیان جێگا لە لای مامۆستا بخوازنەوە و داوای لێ بکەن دەرسیان پێ بڵێت، ئیتر نە موستەعید و نە مامۆستای گەورە، مافی ئەوەیان نییە کە داوا لە فەقێ بکەن بۆ خوێندن بێتە لایان. تەنانەت ئەگەر بە بریتی «کنایە»ش ئەو

داوایە لە فەقێ بکەن بۆیان بە شورەیی‌یەکی زل دەژمێردرێ.

تەنانەت ئەگەر سوختەیان موستەعید لە جێی خۆیان هەڵنەقەنابن نە مەلا ڕێگا بە خۆی دەدا شاگردی کەسێکی دیکە هەڵفریوێنی و بانگی بێڵێتە لای خۆی و نە موستەعید.[1]

زۆر وا هەیە موستەعید چوار تا پێنج کەس بگرە زیاتریش سوختە رادەگرێت و هەرکەسەش دوو دەرسیان پێ‌دەڵێت و ئەو موستەعیدە زۆر بە چەتوونی دەتوانێت بە دەرس و دەوری خۆی رابگات.

شتێکی دی کە دەبێتە هۆی کوێرەوەری و رەنجێکی زۆرتر لە دەرس‌گوتن‌دا چ بۆ موستەعید و چ بۆ ماموستای گەورە ئەوەیە کە: لەبەر نارێکی شێوەی خوێندن و ئەوەش کە هەرکەس لە کتێبێک‌را و هەردەمە لە لای مامۆستایەک دەرس دەخوێنی کەم وا هەڵدەکەوێ چەندکەسێک ببنە یەکدەرس و مامۆستا بە یەک کەرەت بتوانێ دەرس بە هەموانیان بڵێت بۆیە مامۆستا ناچارە هەرچەند کەسێکی لەلابێت جیاجیا بە هەرکامیان رۆژی دوو دەرس بڵێت کە ئەوەش وەختێکی زۆری دەوێ.

## شێوەی دەرس‌خوێندن و دەرس‌گوتن

فەقێکان لە حەوتوودا سێ‌شەممۆ و هەینی تەعتیلن و رۆژەکانی دیش دەرس‌دەخوێنن. لەبەر ئەوەش حوجرەکان وەک فێرگە رەسمی‌یەکان لە ئامرازی وەک تەخت و سەندەڵی و ئەوجۆرە شتومەکانە بەهرەمەند نین مامۆستا و شاگرد هەردوکیان لە تەختی عەردی دادەنیشن و جا خەریکی دەرس‌دان و دەرس‌خوێندن دەبن بەم‌جۆرە: کە سوختە هێندێک دوور و بەرەو رووی مامۆستای لەسەرچۆکان دادەنیشێ، ئەمجار

---

١ -من پێم‌وایە ئەو بیر و بۆچونە ئەگەر بە هۆی وەبەرچاوگرتنی دۆستایەتی و ئاواڵەتی و خەڵک بە زۆر زانین و خۆ بە کەم‌گرتن و گومانی باشەوە بێ کە بە زۆریش هەر لەوانە سەرچاوەی گرتووە ئەوە شتێکی زۆر بەجێ‌یە. بەڵام ئەگەر هەڵکەوێ سوختەیان موستەعید رێیان دەلای مامۆستایەک بکەوێ کە بە هەر هۆیەکەوە بێ کەڵکی بووان نەبێت و ئەوانیش هەست بەوە نەکەن زۆر جێگای خۆیەتی کەسێک ئاگاداریان بکاتەوە جا با بە بانگ‌هێشتنە لای خۆشی بێت. ئیتر ئەوە نابێتە تەفرەدان بەڵکوو دڵسۆزی نواندنە سەبارەت بە لێ‌قەوماوێک.

هەردوکیان نێوی خوا دێنن و پەسنی دەکەن و هەر[١] وەها داوای رژانــی بــەزە و پــیتی خوادەکەن بۆ سەر پێغەمبەر و یارانی (د).

ئەو ویژامە[٢] کە بە زۆری بۆو مەبەستانە بەکاردێت ئەوەیە: «بِسْـمِ اللّـهِ الرّحـمنِ الرّحيم ألحمدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمينَ وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى خَيرِ خَلقِهِ مُحَمَّدٍ و عَلىٰ آلِهِ وَ أَصحابِهِ أجمَعينَ» واتە دەستدەکەین بەو دەرسگوتن و دەرسخوێندنە بە یارمەتی ناوی خوای مێهرەبان و بخشندە، هەرچی پێهەڵگوتنە بۆ خوای پەروەردگاری هەموو ئافەریدەیێکە و سۆز و سڵاوی برژی بەسەر باشترین دروستکراوەکانیدا کە «محمد»ە و بە سەر بنەماڵە و یارەکانیدا بە تێکرایی. پاشان شاگرد روودەکاتە مامۆستا و دەڵێ: «بارَکَ اللّهُ في جَميعِ مَقاصِدِکَ»واتە خوا سەرکەوتوت بکات لە هەموو مەبەستەکانتدا. مامۆستاش لە وەڵامدا دەڵێ:«إيّانا وَ إيّاکَ» واتە: ئیمەش و تۆش.



سوختەکان دەرس دەخوێنن

ئنجا مامۆستا دەرسی رابردووی لێدەپرسێتەوە بۆ ئەوەی بزانی رەوانی کردووە،

١ - پەسن: تاریف پێهەڵگوتن، چاکە گوتن. (هەنبانە)
٢ - ویژامە: عبارت.

لە بەریەتی یان نا؟ جا ئەگەر فەقێ بە ڕەوانکردن و لەبەرکردنی دەرسەکە خۆی بۆ دەرسی تازە ئامادەکردبێ، ئەوە دەرسی پێ دەڵێت و دەنا ئەگەر مامۆستایەکی دڵسۆز و بەختەمام[1] بێ تا دەرسەکەی بە لەباری ڕەوان و لەبەر نەکا دەرسی تازەی پێ ناڵێت و هەوڵدەدا بۆ ئەوەی دەرسی رابردووی فێربکات.



موستەعید، دەرس بە سوختەکانی دەڵێت

لە کاتی دەرسگوتن‌دا مامۆستا بەرلە فەقێکە وێژامەی دەرسەکە دەخوێنێتەوە و دەگەڵ ویش‌یان بە دواویش‌دا شاگرد دەی‌خوێنێتەوە و ئەمجار بە کوردی مانای بۆلێک دەداتەوە و مەبەستەکەی بۆ شی‌دەکاتەوە و هەر بەم‌شێوە بە پێی زیرەکی و نازیرەکی شاگرد، تا لێی حاڵی دەبێ بۆی دووپاتە دەکاتەوە.

هەر کاتێکیش لە دەرسەکە بوونەوە شاگرد دەڵێ: «رَحمَةُ اللّٰهِ عَلَیکَ» واتە: سۆز و ڕەحمەتی خوا لەسەر تۆ بێت. مامۆستاش لە وەڵام‌دا دەڵێت: «عَلَینا وَ عَلَیکَ الرَّحمَة». واتە ڕەحمەت لەسەر ئێمەش و تۆش بێت.

١ ـ بەختەمام: مەردومی ئەمینی راستگۆی دڵسۆز. (خاڵ)

لەبارەی ئاداب و ڕێ و شوێنی نێوان شاگرد و ماموستادا کتێبێک بە ناوی «آداب المتعلمین» نوسراوە کە باسی گەورەیی عیلم و مەرجەکانی باشی مـاموستا و ئـاواڵ و هەروەها قازانجی تێکوشان و پشتبەستن بە خوا (التوکل) و پـاریزگاری (التـقوی) و کاتی خوێندن و تێکوشان و میهرەبانی و دڵسوزی و ئەوشتانەی دەبنە هوی بە زەینی و بیزەینی و چونیەتی دەرس خوێندن و ڕەوانکردن و ئەوانە دەکات کە ئەو کتێبە دانراوی «نصیرالدین طوسی»یە، و ڕێنوێنی یەکـی زوری لەوبـارەوە تـێدایـە، بـەڵام بـە زمـانی عەرەبی یە و سوختەکان ناتوانن کەڵکی لێ وەرگرن.

هەڵبەت موستەعیدیش هەر بـە شـێوەی سـوختە دەرس دەخـوێنی، بـەڵام بـەو جیاوازی یەوە کە، کەم وا هەیە ماموستا دەرس لە موستەعید بپرسێتەوە مەگەر جێیەک کە پێ ی وابێ زور ڕەق و چەتوونە و جێ ی بە هەڵەچوونە و ڕەوانی نەکردووە، بوی دووپاتە بکاتەوە.



ماموستا، دەرس بە موستەعیدەکان دەڵێت

حوجرەی خانەقای پیرانشار

هەروەها موستەعیدکەم وا دەبێ دەگـەڵ مـاموستایان بـە دوای وی دا وێـژامـەی

دەرسەکە بخوێنێتەوە.

جاری وا هەیە مامۆستا بۆوەی لە موستەعید حاڵی ببێت و بزانێت داخوا فێری خوێندنەوەی وێژامەی عەرەبی بووە یان نا، یا هەر لەبەر مەشقکردن و فێربوون، بەرلەوەی بۆ خۆی نوسراوە کە بخوێنێتەوە، بە موستەعیدی دەخوێنێتەوە و ئەگەر هەڵەیەکی بوو بۆی راستدەکاتەوە جا پاشان مانای بۆ لێکدەداتەوە.

جیاوازییەکی دیش ئەوەیە موستەعید وریا بێ یان ناوریا، بە زۆری، مامۆستا تەنیا هەر جارێک دەرسەکەی بۆ راڤە دەکا و لێکیدەداتەوە ئیتر مەگەر بە دەگمەن دەنا نە دەرسی رابردووی لێدەپرسێتەوە نە دەرسی تازەی لە جارێک زیاتر بۆ دەڵێتەوە.

بەڵام موستەعید بەرلەوەی دەرس بخوێنێ خۆی موتالای لەسەر دەکات، بۆ ئەوەی هەم بۆ کاتی خوێندن ئامادەیی پتر بێ و هەم تاقیکردنەوە و مەشقکردنیش بێ بۆ خۆی.



موستەعیدەکان، دەرس موتالا دەکەن

سوختە و موستەعید هەردوکیان هەم لە کاتی دەرسخوێندندا و هەم لە وەختی دیشدا مافی پرسینەوەیان هەیە و تەنانەت ئەگەر نیوەی دەرسەکەشیان تێنەگەیین یان لەبیریان چووبێتەوە و بێپرسنەوە ئیتر مامۆستا هەقیان پێدەدا و بەخۆشی جوابیان دەداتەوە. واش هەیە ئەگەر بەشی زۆری دەرسەکەیان هەر نەزاننەوە سەر لە نوێ پێیان

دەڵێتەوە کە جاری ئاوا، یان ئەوەتا دەرسی تازە ناخوێنن یا بە خوێندنی کەمێک وازدێنن.

سوختە و موستەعید لەوەش‌دا جیاوازییان نییە کە دوای ئەوەی دەرسیان خوێند لەسەری‌دا دادەنیشن و دەیلێنەوە تا رەوانی دەکەن. جا ئەگەر دوو یا چەند نەفەر دەرسیان بە یەکەوە بێ بە زۆری پێکەوە دەیلێنەوە بەوشێوە هەروەکی دەرس‌پێگوتن، یەکێکیان هەموو، یان برێک لە دەرسەکە دەخوێنێتەوە و مانای لێک‌داتەوە و ئەوانی‌دیش گوێی بۆدەگرن و بەلێ‌ی بۆ دەکەن و ئەگەر تێگیراویشی بوو یارمەتی دەدەن، و ئیتر تا دەرسەکە بە باشی رەوان‌دەکەن نۆرەی لێ‌دەکەن و دەیلێنەوە ئەگەر یەکدەرسیش نەبن ئەوە هەرکەس دەرسی خۆی دەڵێتەوە تا رەوانی دەکات.(١)

لە شێوە دەرس‌گوتنەوە، یان دەور کردنەوەی بە تەنیادا، سوختە بە دەنگ ئەو کارە دەکا، واتە هەم عیبارەتەکەی بە دەنگ دەخوێنێتەوە و هەم ماناکەشی بە دەنگ لێ‌دەداتەوە، بەڵام موستەعید بە زۆری هەر بێ‌دەنگ و لەبەرخۆیەوە ئەو کارە دەکات.



دەرس خوێندنی موستەعید (حوجرەی مزگەوتی سووری سابلاغ)

١ - بووەی دەرس زۆر بگوترێتەوە تا ئەوەی رەوان‌دەکرێت و بێ گرێ و گوڵ دەبێ پەندێکی عەرەبی‌دانراوە دەڵێ: «الدرس حرف والتكرار الف» واتە دەرس پیتێکە و گوتنەوەی هەزار جارە.

هەڵبەت ئەگەر لە دەورکردنەوەدا تەنیا وێژامە بە عەرەبیە کە لەبەر راو بە بێ مانا لێدانەوە بگوترێتەوە چ سوختە و چ موستەعید هەر بە دەنگ دەیلێنەوە و ئیتر گاڵەگاڵی فەقێیان و رێچکە هەڵبەستنیان لە کاتی پێداچونەوە و دەورکردنەوەدا شتێکی بیسراو و بە نێوبانگە.(١)

## دەرس لەبەرکردن

کارێکی دیکەی کە سوختە و موستەعید تێیدا بەشدارن لەبەرکردنی دەرسە، ئەو کتێبانەی لە ماوەی فەقێیەتی دا دەخوێندرێن بەشی هەرە زۆریان دەبێ لەبەر بکرێن جا هەر لە عیززی و عەوامیلی جورجانی‌یەوە بگرە تا دەگاتە (تلخیص و جمع‌الجوامع و تهذیب الکلام و تشریح الافلاک و سبزواری) و ئەو کتێبانەی کۆتایی خوێندنیان پێ‌دێت.

لە راستی‌دا ئەو دە ـ پازدە ـ بیست کتێبانەی لەو ماوەدا دەخوێندرێن‌کە لە دوایی‌دا ناویان دەبەین، ئی‌وایان تێدانیە لەبەرکردنی نەوێت. ئەوەندە هەیە تەنیا مەتنەکان لەبەر دەکرێن و ئیتر شەرحەکان لە بەرزۆری گوێیان پێ‌نادرێت.

وەکی دەگێرنەوە دەڵێن فەقێ‌ی واهەبووە بڕێک لە کتێبەکانی بەشەرحەوە لەبەرکردوون و تەنانەت زیاد لە شەرحەکە حاشیە و پەراوێزێکی بە سەر کتێبەکەشەوە بوون هەرلێ‌ی لەبەرکردوون. ئیمامی نەوەوی لە پێشەکی کتێبی «منهاج الطالبین» کە کورتکراوەی کتێبی «المحرر»ی ئیمامی رافیعی‌یە دەڵێت: لەبەر ئەوەی کتێبی «المحرر» قەوارەی زۆر بوو و زۆربەی خەڵکی پێیان لە بەر نەدەکرا مەگەر هێندێک کەسی وا خوا چاودێری کردبن بە چاکم زانی کورتی کەمەوە لە نێوەی قەوارەی خۆی‌دا بۆ ئەوەی لە بەرکردنی هاسان بێتەوە...»

---

١ ـ فەقێکان بۆ دەرس‌خوێندن و دەورکردنەوە دەردەکەون و دەچنە دەوروبەری ئاوەدانی و نێوموچە و مەزراکان و زۆر جێ هەیە ئەوەندە هاموشۆیان کردوتێ و لێی ماونەتەوە کە بە نێوی فەقێیان نێوبانگی دەرکردووە و تەنانەت ئەگەر نێوی دیشی لە سەر بوبێ فەراموش کراوە و بە نێوی تازەوە ناسراوە، وەك کانی‌یە فەقێیان، گەڵوی فەقێیان، گوێزی فەقێیان، شاخی فەقێیان و توێ فەقێیان و...



**فەقێیەکان بە راوێچکە دەرس لەبەر دەکەن**

**جا ئەوەی چاوی بە «منهاج الطالبین» کەوتووە دەزانـێ کـە کـتێبێکە لە هـەندێک چاپی‌دا زیاتر لە شەش‌سەد لاپەڕەی مامناوەندی‌یە.[1] جا ئەمە هیچ کـە لە بـەر کـراوە تەنانەت «المحرر»یش کە وەک لە قسەی مامۆستا دەردەکەوێ، دوو بەرانبەری «منهاج»ە هەر لە بەرکراوە.[2] جا بۆیە دەڵێم کـتێب لە بـەر کـردنی فـەقێیان ئـەویش بـەو شـێوە، ئازایەتیەکی کەم وێنە و هونەریکی گەورەیە و ئیتر لەبەرکردن و لە بیرمانەوەی ئەو کتێبە زلەزلانە بەو هەموو کوێرەوەری و دەردی سەری‌یەوە، ئەگەر پشت بـەستن بـە خـوا و**

---

١ ـ مامناوەندی: شتی ناوونجیی. (خاڵ)

٢ ـ نمونەیەکی سەیر و سەمەرەی کتێب لەبەرکردن: دەگێرنەوە کە کاتێک ماموستا مەلا عـبداللـە بێتوشی و ماموستا مەحمودی برای دوای تەواو کردنی خویندنی گونجاو لە کوردستان پێش ساڵی (١١٧٠) کۆچی مانگی بە مەبەستی وەدست هێنانی پلەی زیاتر لە نخوێندەواری‌دا روویان کردە بەغدا و شارەکانی‌تری عەراق و کەنداو و خەرجی رێگاشیان نەبو رایان هاتە سەر ئەمەیە کێکیان «تحفة‌المحتاج» و ئەوی تـریان «قـاموس‌المـحیط»ی فیروزآبادی لەبەربکا و پاشان بیانفروشن و دراوەکەیان بکەنە خەرجی رێگا کە ئەو کارەشیان کرد!!!
شایانی باسە کە تحفە لە چاپی ئیستای‌دا بە پەراوێزەوە دەبەرگی پێنسەد لاپەڕەی و قاموسیش نـێزیک بـە دوو هەزار لاپەڕەی پڕاوپڕە.

تێکۆشان و هیوای زۆر نەبێ کاری حەزرەتی فیلە و بەکەم کەس دەکرێ، بە تایبەت زۆر لەو کتێبانەکە لە بەرکراون زۆرکەس لە دەورانی مەلایەتیش‌دا هەر لە بیرخۆی نەبردونەوە و دەوری هەر لێ کردونەوە.(١)

## «سماع» گوێداری

دیاردەیەکی دیکەی نێو فەقێیان «سماع» واتە گوێ‌راگرتنە. ئەویش بەم شێوەیە کە فەقێ چ سوختە چ موستەعید کاتیک کتێبێکی خوێندبێ و باش لێی تێ نەگەیبێت یان بیهەوێ باشتر لێی حالی بێ، یان هەر بیهەوێ و دەخۆرابیینێ بە بێ خوێندنی راستەوخۆ فێری بێ «سماع»ی دەکات. واتە کاتێک ئاوالێکی دەرس دەخوێنی لە پەنای دادەنیشێ و گوێ بۆوی و ماموستای دەگرێ و دەرسەکەیان لێوە فێر دەبێت.

«سامع» واتە گوێدێر، مافی ئەوەشی هەیە ئەگەر پێسیرێکی(٢) بۆهاتە پێش پرسیار بکاو یان ئەگەر رەخنەی هەبوو دەری ببڕێت.(٣)

---

١ - ئەمە جگە لەو هەمووشێعرانەی کە لە کوردی، عەرەبی و فارسی‌دا بۆ شەرە شێعر و زێدەزانین لە بەر کراون.

سەرنج راکێش‌تر لە هەمووئەوانە دەرس گوتنی ماموستاکانە بە بێ کەڵک وەرگرتن لە کتێب. بەڵێ کومەڵێکی زۆر لە باش مەلاکانمان بێ ئەوەی کتێبیان لە پێش بێ تەدریسی کتێبانێکی وەک «تحفه»، مطول و .... یان کردوە. هوەیەکەشی ئەوە بووە کە ئەوەندەیان ئەو کتێبانە سەرە و نێوکردون و دەرسیان تێرا کوتونەوە، وێژامەکانیان هاتووتە بەر.

٢ - پێسیر: مشکڵ (فەرهەنگی بابان)

٣ - لە مەزرای حوجرەدا کە بە ئاوی سەرچاوە ئیسلامی‌یەکان ئاودێری دەکرێ خووخەدەی ئیسلامی جێ گرتویە و ئازادی و خوشەویستی و دڵسۆزیەکی تەواو حاکمە بەڵام نە هەموو دارو روەکێک لە مەزرادا پێدەگا و نە هەموو کەسێک لە ژیانگە وەدەوروو‌بەری دەرس وەر دەگرێ و تێدەگا جابۆیە برێک لە ماموستاکان چ موستەعید و چ ماموستای گەورە لە کاتی باس لە سەر شتێک یان دەرس گوتن دادەعیە و فیز دەیانگرێ و هەق وەرناگرن و نای سەلمێنن و بۆوەی قسەیان رەسەرکەوێ دەیان پینە و پەرۆ دەکەن و ئەگەر بابای تەرەفیان برێک وریانە بێ سەری لێ دەشێوێنن. و «قل»ی لێ دەکەن بە «فل»

هەڵبەت ئەگەر ئەو کارە لایەنی خۆ بە زل زانینی نەبێ و هەر بە خۆشی و شۆخی بێ و لە ئاکام‌داراستی ببێتە سەرزارو هەق بدرێتە هەقدار لەوانەیە کارێکی زۆربێ جێ نەبێ و تەنانەت کەڵکیشی بۆزیاتر بیر کردنەوە ومێشک پژان بێ، بەڵام بە داخەوە هێندێک ماموستا پێیان شوورەییە قسەی خۆیان بخۆنەوە و هی کەسێکی‌تر بقۆزنەوە و ئەگەر دەگەڵیان پێوەبچی هەقی تورەبوون و دەرکردنی فەقێش بە خۆیان دەدەن، قەت رێ ناکەوێ ⇦



**دوو فەقێ سەماعی دەرسی ئاوالیان دەکەن**

**حوجرەی ئاسناویی شنۆیە**

## مەشق و خەت خۆشی[١]

چونکە فەقێ تەنانەت لە دەورانی مەلایەتیش‌دا کەم واهەیە پێویستی بە نووسینی وێژامەی عەرەبی لەبەر رابیێت و هەروەها لە بەر ئەوەش کە فەقێ بە خوێندنی ئەو زانستگەل «علوم»ە عەرەبییانە و بە تایبەتی بە خوێندن و فێربوونی دوو زانستی «نحو و صرف» کە دەستوری زمان «رێزمان»ن زۆر بە باشی فێری نوسینی عەرەبی واتە رێنوسی ئەو زمانە دەبێ، دەستوور نییە دەرس بنوسێتەوە و تەنیا بە ئارەزوو و لە بەر خەتخۆشی نەبێ مەشقی نییە و چ نانوسێتەوە، دەگەڵ ئەوەش‌دا، فەقێکان لە هونەری خەتخۆشی بەهرەمەندن و زۆریان بەر لەوەی ببنە مەلا و تەنانەت وا هەیە لە سەردەمی سوختەیەتی‌دا خەتی کوردی[٢] و ئارەوی «عربی» و فارسی هەریەکە بە شێوەی تایبەتی خۆی و زۆر بە

---

⇦ گوێ بۆ شاگرد شل‌کەن و شتێکی لێ بسەلمێنن، هەرگیز نایەڵن فەقێ داهێنانێکی هەبێ، جارێک نیە بڵێن ئافەرین قسەی تۆیە، من بە هەڵەدا چووم، ببورە، تا بەو شێوە فەقێ وەبووژێ و گوڵ بکا!!

١ - مەشق: نووسینەوە لە بەردێرێکی جوان چەن جارێک لە سەریەک بۆ خەتخۆشی (خاڵ)

٢ - فەقێیەکان! لە ساڵەکانی پێش شۆرشی ئیسلامی ئێران کە نووسینی کوردی کەم بوو بگرە بەشی زۆری ⇦

جوانی و هونەرمەندانە دەنوسن.

شایانی باسە لەم سەردەمانەدا کە چاپەمەنی زۆرترە و زۆربەی هەرە زۆری کتێبەکان لە چاپ دراون نوسینەوە کەمە دەنا تاماوەی بیست،سی ساڵێک لەمەوبەر بەشی زۆری کتێبەکان هەر لە چاپ نەدراون و ئەگەر لە چاپیش درابن بە کەمی وەدەست کەوتوون بۆیە فەقێ و ماموستایەکان ناچار بوون بۆ وەدەست هێنانی کتێب نوسخەیێکی بە ئەمانەت وەربگرن و لەرووی بنوسنەوە، ئنجا بۆ دەرس تێراگوتن و خوێندن کەڵکی لێ وەربگرنوەکی لە جێی خۆی‌دا ئەو باسە بە درێژی دێنینەوە گۆڕێ.

ئەوچاخی حوجرەکان چاپخانە و فەقێکان مەکینەی چاپ، بوون و هەر لە قورئانی پیرۆزەوە بگرە تا تەفسیر و کتێبی شەرعی و مێژوویی و عیلمی و هەرچی کە پێویستی‌یان پێ بووە وا هەبوە تا هەزار لاپەڕە بگرە زیاتریش کتێبیان نوسیوەتەوە، تەنانەت حاشیە و پەراوێزیشیان قوتار[١] نەکردوون.

ئێستا هەر کەسێک سەرێک لە کتێبخانە کۆنەکانی کوردستان بەتایبەت لە کتێبخانەی مەلایەکان هەڵێنی، دەیان و بگرە سەتان کتێبی وا دەبینێتەوەکە بە زیاتر لە هەزار لاپەڕەوەبەدەست و قەڵەمی فەقێ و ماموستاکان نوسراونەتەوە و لە فەوتان و لەناو چوون پارێزراون و هەر یەکەشیان شاکارێکی هونەری سەربەخۆن. جا بە هۆی ئەو نووسینەوەشەوە خەتخۆشی بووەتە هونەرێکی بەر چاوی زۆر لە فەقێ و مەلاکانی کوردستان.

## شێعر و شاعیری

بە بۆنەی هاتنە پێشەوەی هونەری خەتخۆشی پێم بەجێ بوو ئاماژە[٢] بەوە بکەم

---

⇦ یاساخ و قاچاغ کرابوو و تەنانەت نوسینی نامەیەکیش بە زمانی کوردی قەدەغە بوو، بە دزی و لە بەینی خۆیان و ئەوکەسانە کە متمانەیان پێ‌هەبوو لە نووسینی نامە و شتی واداکەڵکیان لە زمانی کوردی وەردەگرت و بەوشێوە رێزمانی کوردییان دەپاراست.

١ - قوتار: رزگار. (خاڵ)

٢ - ئاماژە: ئیشارە. (هەنبانەبۆرینە)

کە بەشێک لە فەقێیەکان هەست (قریحە)ی شاعیری‌یان بە هێزە و ئەگەر وەدووی کەون زوو گەشە دەکات.

ئەوە تا دەبینین هەمووشاعێرە کۆنەکان و بەشێکی هەرە زۆری شاعیرە لاو و تازەکانمان لە حوجرەسەریان هەڵداوە، کە هەندێکیان بە چوار زمانی کوردی، عەرەبی، فارسی و ئازەری شێعریان داناوە.

برێک لە فەقێیەکان ئەگەر هەستێکی زۆر بەهێزیشیان نەبووبێ یان هەر نەیانویستبێ ببنە شاعیر لانی کەم هێندێک هونراوەی مەزهەبی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و یان جوری دیکەیان هەیە و هەر نەبێ ژیواری نالەباری خۆیان بە هۆنراوە نوسیوە و بەم جۆرە دەردی دڵیان کردووە و کەوتوونە سکاڵا لە ژیانی پڕ لە ژانیان.

جاری واهەبووە شێعر هەڵبەستن و شێعر ووتن لە حوجرە داوای پەرەستاندووە کە لە رووی شۆخی‌یەوە ئەو تاکەشێعرەی شێخ رەزای تاڵەبانیان بۆیەکتر خوێندۆتەوە کە دەڵێ:

«چونکە شاعیر زۆر بووە لەم عەسرەدا    بۆتە حەشری نێرەکەر لەم حوجرەدا»

## جێگای دەرس لێ‌خوێندن

فەقێیەکان بە سوختە و موستەعیدەوە هەر لە ناو حوجرەدا کە جێگای دانیشتن و نان و چاخواردن و نوستنە، دەرس دەخوێنن، تەنیا لە کاتێکدا نەبێ کە دەشت و دەرخۆش دەبن. دەنا بەتایبەت موستەعیدەکان هەر لە حوجرە کەڵک وەردەگرن. هەڵبەت لە وەختێکدا یەکێک‌یان چەند کەس لە فەقێیەکان خەریکی دەرس خوێندن بن ئەوانی دیکە بۆ ئەوەی بە دەنگە دەنگێ نەبنە هۆی ئازاری یەکتر، وەدەر دەکەون و لە جێگایەکی‌تر خەریکی دەرس خوێندن یان دەور کردنەوە دەبن.

فەقێ چ سوختە، چ موستەعید هەقی نییە لە کن ئەوانی‌تر بە تایبەت لە حوجرەدا دەرس و دەوران بە دەنگ بڵێتەوە بەڵام هەموویان مافی ئەوەیان هەیە لە بەر خۆوە و بەبێ

دەنگ خەریک بن. دەبێ ئەوەش بگوترێ کە کەس هەقی نییە بە راوێچکە[١] لە نێو حوجرەدا دەوران بکاتەوە چونکی بێجگە لەوەی حوجرە هەڵسووڕ و داسووڕی تێدا ناکرێ، بە پێی بڕوایەکی نێو فەقێیان دەڵێن: هەر حوجرەیەک بە پیاسەوە[٢] دەوری تێدا بکرێتەوە چۆڵ دەکرێ.[٣]

لە زۆر جێگا بە تایبەت حوجرەی دەرس تێدا گوتنی ماموستای گەورە بە سەر مزگەوت یان بە سەر حوجرەوە ساز کراوە ئیتر ئەو حوجرە تەنیا جێگای موتالا و دەرس گوتنی مامۆستایە.

لە شار و دێهات فەقێیەکان بۆ دەرس خوێندن و دەورکردنەوە چ بە پێوە و چ بە دانیشتنەوە لە مزگەوت کەڵک وەردەگرن بەومەرجە موزاحیمی نوێژکەران نەبن. بە تایبەت موستەعیدەکان بۆ ئەوەی رێ لە یەکتر نەگرن هەر لە مزگەوت دەرس بە سووختەکان دەڵێن. لە بڕێک مزگەوتەکانی شار ناهێڵن فەقێ لە سەر فەرشی مزگەوت راوێچکە بکات و ئەو نەهێشتنەش بۆ پێشگیری لە خراپبوونی رایخەکانە.[٤]

---

١ - راوێچکە: هاتووچوو کردن. (خاڵ)

٢ - پیاسە: قەدەم لێدان. (هەنبانە بۆرینە)

٣ - ئەو بڕوایە لەبارەی خوێندنی کتێبی «تصریف الزنجانی»ش‌دا هەر هەیە و دەڵێن هەر حوجرەیەک ئەمی تێدا بخوێندرێ بەرەو چۆڵی دەروا!!!
لە بیرمە چەند مانگێک بوو چوو بوومە نێو فەقێیان لە گوندی بێوری خوارێی سەر بە شاری سەردەشت دامەزرابووم. هێشتا هیچ باوو یاسایەکی نێو فەقێیان فێرنەبوبوم، رۆژێکیان کە خۆم و موستەعیدیک نەبێ کەسمان لە ژووری حوجرێ نەبوو، دەمهەویست کتێبی «ئەحمەدی» دەور بکەمەوە، تاوم دایە و هەر لە ژوری حوجرێ دادەستم کرد بە راوێچکە و هاتوو چوو، موستەعیدەکەش بێ ئەوەی بۆیەکەمجار تێم بگەیەنێ کە ئەوەکارە بە فلان دەلیلە کارێکی باش نییە و مەیکە، بە تورەییەوە گوتی: ئەوە چ دەکەی برا؟ هەر حوجرێک دەوری تێدا وەکرێ چۆڵ دەبێ. ئەمنیش کە لە سەرێکەوە منداڵ بووم و لە سەرێکیشەوە تازە پێم نابوو نێو ژیانی غەریبایەتی و بێ نازییەوە و چەرمەسەرە و چڕوسانەوەم کەمتر دیتبوو ئەو دەنگ‌دانەم بەو شێوە زۆر لە دڵ گران هاتوو پێم ناخووش بوو.

٤ - رایخ: راخەر (هەنبارە بۆرینە)



**فەقییەکان لە مزگەوتی ئاواییدا دەور دەکەنەوە**

**کەنگێ دەست بەکتێب دەکرێ؟**

لە رۆژێکدا فەقێ دەست دەکا بەکتێب کە بتوانێ دەرسەکەی «تثنیە» بکاتەوە واتە بتوانێ بێ ئەوەی پشوودان «تعطیل»ی بە سەردا بێت لە سەریەک، لانی کەم دوودەرس لەو کتێبە بخوێنێت. جا بۆ و مەبەستە لە یەکێک لە رۆژەکانی شەممو، یەک شەممۆ و چوار شەممۆدا دەستی پێ دەکات چونکە فەقێیەکان بڕوایان وایە ئەگەر دەرسەکەدووپاتە نەبێتەوە بابای فەقێ دەرسەکانی بێ بەرەکەت دەبن و زۆر دەچن.

**مەفتووحانە و مەختوومانە**

رەسم وایە کە فەقێ بە بۆنەی دەست پێکردنی کتێب، خواردەمەنییەک بکرێ و دەرخواردی فەقێکانی بدات کە پێی دەڵێن (مەفتوحانە) و هەروەها بە بۆنەی تەواو کردنیشەوە دەبێ شتێک هەر بکرێ کە پێی دەڵێن (مەختومانە).

هەڵبەت مامۆستای گەورەش لە خواردنی مەفتوحانە و مەختومانەدا بەتایبەت ئەگەر لە لایەن موستەعیدەوە بێ بەشدار دەبێت.



وێنەی حوجرەی «ابن الصلاح» شارەزووری لە حەمامیانی بۆکان و فەقێیەکانی، ساڵی (١٣٨٠ک. ھ) شایانی باسە کە حوجرە و مزگەوتی حەمامیان لە شوێنەوارە مێژووییەکانن و نیزیکەی سەت ساڵە سازکراون.

## تونی چوارەم زانستەکان و پەڕاوە دەرسی یەکان

هەروەک لە مەوەبەر ئاماژە«اشارە»م پێ کرد خوێندنی فەقێیەتی و بەگشتی هەر زانست و خوێندەواری یەک لە خزمەت ئایینی پیرۆزی ئیسلام دایە لەو کاتەوە کە ئیسلامی ئازیز دەسەڵاتی لە مەیدانی رامیاریی‌دا بە دەستەوە نەماوە و دنیا کەوتۆتە ژێر دەستی دنیا خوران چ سەرمایەدارەکان و چ کۆمونیستەکان[1] واتە ئیمپریالیزمی رۆژئاوا و رۆژهەڵاتەوە و بە واتایەکی تر لەو کاتەوە دین و سیاسەت لە یەک جیاکرانەونەتەوە، لەلایەن دەسەڵاتدارەکانی وەختەوە چاوەدێری‌یەکی لێ نەکراوە و بەشتێکی زیاد لە پێویستی کۆمەڵ و تەنانەت بە ملۆزم[2] و زیانهێنەریش لە قەڵەم دراوە و وەک بەشێک لە خوێندنی رەسمی وڵات نەژمێردراوە.بەتایبەت لەوکاتەرا کە دوایین ئیمپراتۆری ئیسلامی تێکدرا و نیشتمانی گەورە و بەرینی ئیسلام لەت‌لەت کرا و دەیان سنووری دەستکردی تێدا دیاری کران و هەر بە شە لە وڵاتی بەرینی ئیسلام نێوێک و هەر تاقمە لە مسوڵمانان رابەرێک، یان باشتر بڵێین ستەمکارێکی بەسەردا سەپێنرا، بە ئەنقەست[3] و لە رووی گەلاڵەوە[4] ئەو خوێندنە لە برەو خرا و وەپاش گوێیان درا.!!

## چۆن و لەبەرچی؟

شتێکی حاشاهەڵنەگرە کە هۆی بنەڕەتی و سەرچاوەی سەرەکی هەموو گیروگرفتێکی مسوڵمانان چ کۆمەڵایەتی، چ سیاسی، چ ئابووری و چ... لێک‌جیابوونەوەی دین و سیاسەت و لەسەرکارنەبوونی میری (حکوومەت)ی ئیسلامی‌یە کە پەیدابوونی

---

١ ـ ئەوکاتی کە ئەم کتێبە نوسرا هێشتا یەکیەتی سوڤیەت نەڕووخابوو.

٢ ـ ملۆزم: کەسێکە مەردوم توشی زیان بکات. (خاڵ)

٣ ـ ئەنقەست : عمداً

٤ ـ گەلاڵە : نەقشە، تەرح

دیاردەی[١] فەقێ و فەقێیەتیش بەو هەموو چۆرتم[٢] و بەلەنگازیی[٣] و بێدەرەتانی‌یەوە هەر لەو هۆیەوە سەرچاوە دەگرێ.

دەنا بۆ دەبێ حوجرە لە مەدرەسە و زانستگە[٤] جیابێ و قوتابی[٥] لە یەکتر نەبان و خوێندن بینە دووان، یەک دەرسی رەحمان و یەک دەرسی شەیتان؟

بۆ دەبێ خوێندنی رشتە دینی‌یەکان رەسمییەتی نەبێ و فێرگە و ماموستا و بەرگ و لیباسی فەقێ لە هی خوێندکارە رەسمی‌یەکان جیا بێ و ژیانی بە دەرکاودەرک و دەست‌پان راکردن بۆ ئەم‌وئەو بەرێوە بچێ؟ و تەنانەت مالی بابیشی بەخێرا خۆیان دەستی بگرنەوە؟ بۆ دەبێ ئەنجامێک بۆ دواڕۆژی خوێندنەکەی خۆی نەبینێ و دوای تەواوبوونیشی لە خوێندن، هەر چاوەڕوانی یارمەتی‌دانی خەلک بێ؟ مەگەر ئەوانە نابنە هۆی دلساردبوونەوە و دوورەپەرێزبوونی[٦] لە خوێندن؟

چما[٧] دوولەت‌کردنی خوێندن و نێولێ‌نانی بەو نێوانە هەر ئیشی نەیاران نییە بۆ ئەوەی مسولمانان بە ناوی دینداری و خواپەرستی‌یەوە بەشیان لە دنیایە ببڕێ و هەرچی هەیە لە زانست و زانیاری کۆی‌کەنەوە و گەشەی پێ‌بدەن و بیکەنە هۆی پەرەپێدانی زیاتری پیشەسازی و جیهانی سروشتی[٨] هەرچی زیاتر پێ رام و دەستەمۆ بکەن و لە خزمەت خۆیانی باوێژن و مسولمانانیش هەر بە ژیانی سەرەتایی قنیات[٩] بکەن و لە گەلێک لە بەش و بارەکانی خوای بێ‌بەش ببن؟ و ئەگەر لە مەیدانەکانی جۆراوجۆری تێکۆشاندا دۆزینەوە و داهێنانێکیشیان بێ، هەر بە نێوی دژمنانیان تەواو بێ؟

---

١ - دیاردە: دابی تازە پەیابووگ.(هەنبانەبۆرینە)

٢ -چۆرتم: سەغلەتی و دەردی‌سەری. (خاڵ)

٣ - بەلەنگازیی: سوالکردن. (خاڵ)

٤ - زانستگە: دانشگاه. (هەنبانە)

٥ - مەبەست لە قوتابی لێرەدا خوێنکاری رەسمی‌یە.

٦ - دوورەپەرێز: لا. (هەنبانە بۆرینە)

٧ - چما: مەگەر. (هەنبانە بۆرینە)

٨ - سروشتی: خۆرسکاو، طبیعی.(هەنبانە بۆرینە)

٩ - قنیات: داکەوتن بە بەشی کەم (خاڵ)؛ قەناعەت.

هەیاران![١] لە کاتێکا کە بناغەی دینی ئیسلام لە سەر زانست و زانیاری دامەزراوە و یەکەم سرووش[٢] بە فەرماندان بە خوێندن و زانیاری دەست پێ کراوە و کۆتایی بەشێکی زۆر لە ئایەتەکانی قورئان بە دەستووردان بە بیرکردنەوە لە بوونەوەر و فێربوون و زانین هێنراوە و لەلایەن پێغەمبەری مەزنەوە(د) سەرەتا و کۆتایی خوێندن بە بێشکە و گۆڕ دیاری کراوە، نابینن دوژمنان چۆن ئەو زانستەیان کە بەشی هەرە زۆریان دژایەتییان لەگەڵ دین‌دا نییە و تەنانەت زانین و پەرەپێدانیشیان ئەرکی سەرشانی مسولمانانە و هەندێکیان هەر لە نێو مسولمانانیش‌دا خولقاون، لێک جیاکردوونەتەوە و سنووریان بۆ داناون و نێوی فریودەریان لێ ناون؟

بەداخەوە دەبێ بڵێین کە ئەو پیلانە[٣] تا رادەیێکی زۆر سەریش‌کەوتوە، دەبینین تەنانەت بڕێک لە دمڕاستانی[٤] دینیش بەر لەو خوێندنە دەگرن، یان ئەوەتا هەندێ جار ئەگەر باسی سەرکەوتنی بەشەر لە مەودای[٥] زانست و پیشەسازی (علم و صنعت)دا بکەی، بۆ نموونە باسی چوونی مرۆڤ بۆ سەر گۆی مانگ بکەی کە دەیان ساڵە بەشەر توانیویەتی ئەو ئیشە بکات و قورئان‌یش دژی ناوێستێ، نەک هەر باوەڕت پێ ناکەن بگرە بە پاشگەز[٦] لە دینیشت دادەنێن.!!

ئەوە لە کاتێکدا کە هەر کەسێک بڕێکی لە دین کۆڵیبێتەوە دەزانێ کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام دژایەتی نییە دەگەڵ هیچ زانستێک کە سوودی بۆ کۆمەڵ ببێ بەڵکو لە روانگەی دینی ئیسلامەوە زانست و زانیاری دوو بەشە: بەشێکی هەموو کەس پێوەندی و سەروکاری دەگەڵ هەیە کە دەبێ هەموو کەس چ پیاو و چ ژن بیخوێنێ یان باشتر بڵێین فێری ببێ، وەک رێ‌وشوێنی خواپەرستی (العبادە) و شێوەی بە یەکەوەژیان و....

بەشێکیشی مرۆڤ هەمیشە پێوەندی دەگەڵ نییە و پێویست ناکا بیزانێ و تەنیا چەند

---

١ -هەیاران: یاران. (خاڵ)
٢ - سرووش: فەرمانێکە بە هۆی فریشتەوە لە خواوە بێ بۆ پێغەمبەران (وەحی). (خاڵ)
٣ - پیلان :کەین و بەین بۆ فێڵبازی.(هەنبانە بۆرینە)
٤ - دمڕاست: قسەوێژ، کاربەدەست، کارپەرداز.
٥ - مەودا: فاسڵە، بوار، زەمینە...
٦ - پاشگەز: پەشیمان، مورتەد.

کەسێک لە کۆمەڵ کە بتوانن نیازی خەڵک جێبەجێ بکە نفێری ببن بەسە و ئیتر هەرکەسیش تاو داتەخوێندن و فێربوونی چ جای ئەوە کە لە دەقە رەسەنە دینی یەکاندا رێی لێ نەگیراوە بگرە هانیش دراوە و پاداشی قیامەتیشی بۆدیاری کراوە.

لێکهەڵبڕینی ئەو زانستانە و دابەشکردنیان بە دوو بەشی دینی و غەیرە دینی لە چەند رووەوە زیانی بە مسوڵمانان گەیاندووە: یەکەم ئەوەکە بەشی هەرە زۆری مسوڵمانان لە خوێندنی زانستە دینییەکان بێبەشن و لە ئاکامدا لە دین و ئایینەکەی خۆیان بێ ئاگا و هەواڵن،چونکە لە بەر بەڕەسمی نەناسرانی فەقێ و حوجرە کەمکەس هەیە روو بکاتە ئەو خوێندنە، ئەوانەش کە رووی تێ دەکەن لەبەر ئەوەی لە باری ژیانەوە بە شێوەیێکی ناحەز بەستراوە بە خەڵکن و بەرنامەیێکی رێکوپێک بۆ خوێندنەکەیان دانەڕێژراوە و تاقیکردنەوە (امتحان)یان نییە و چاوەدێرییەکی بەکەڵکیان لێ ناکرێ و داهاتوویەکی روون[1] بۆ خۆیان نابینن، وەک پێویستە لە سەری دلگەرم نین. بۆیە هەندێ لە فەقێکان دوای ماوەیەک مانەوە، حوجرە بەجێ دێڵن و خوێندن وەلادەنێن، هەندێکیشیان بە ناتەواوی ئیجازە وەردەگرن و خوێندنەکە تەواو ناکەن، بازێکیشیان ئەگەر تەواویشی بکەن وای ناخوێنن کەڵکی ببێ و بەتەواوی تێیدا ببنە مامۆستا و لەئاکامدا بە کۆلکە مەلا دەردێن.

خۆ دیارە غەیری ئەو سێ تاقمە واتە بەشی هەرە زۆری فەقێکان دەگەڵ بوونی ئەو هەموو پیلان و کۆسپانەشدا زۆر بە باشی دەخوێنن و تێدەگەن و پێدەگەن و دێنە مەیدانی

---

١ - دەبێ بگوترێ کە مەبەست لەو داهاتوویە داهاتووی دنیایی یە وەکی باوەڕنامەی خوێندن (گەواهینامە تحصیلی) و دامەزران لە سەر کار (استخدام) و ئەوانە کە بۆ ژیانی دنیایی پێویستن، دەنا ئەگەر ئەجر و پاداشتی قیامەتی وەبەرچاو بگرین نرخی ئەو خوێندنە ئەویش بەو هەموو دەردیسەرییەوە لە هەرچی ئیشە زیاترە و هیچ کارێک نایگەیەنیتێ. هەر بۆیەشە برا فەقێکان دەگەڵ ئەو هەموو بێنازی و بێنانی و بێدەرسی و بێکەسیەدا بە شانازییەوە درێژە بە خوێندن دەدەن و دەبنە زانای گەورە و خزمەت بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەکەن و نایەڵن تیری دوژمن نیشانە بپێکێ و پیلانەکەی سەرکەوێ.

بەڵێ فەقێ لە خوێندندا چاوی لە پلە و مەقام و پارە و ئەو شتانە نییە و تەنیا بەهۆی باوەڕی پتەو و غیرەت و لەخۆبوردوویی و چاوەڕوانیکردنی پاداشتی خوایی تاو دەداتە خوێندن و لە حەوتخانی رۆستەم تێدەپەڕێ و بە هەوراز و نشێوی فەقێیەتیدا هەڵدەگەڕێ و دادەگەڕێ تا دەگاتە سەر ترۆپکی بەرزی خوێندەواری و تیشکی زێڕینی زانست و زانیاری بەملاولادا بڵاو دەکاتەوە و رێگای دین و ژین بۆ خەڵک روون دەکاتەوە.

خزمەت بە دین و دنیای خەڵک، بەڵام لەبەر بەرینی مەیدانی کار و زۆری جەماوەر و بوونی گیروگرفتی جۆراوجۆر بەو شێوەی کە لازم و پێویستە پێڕا ناگەن و فریا ناکەون.

زیانی دووهەم ئەوەیە کە لە بەر نەبوونی زانستە دینییەکان وەک پێویست لە نێو دەرسە رەسمییەکاندا و گوێ پێ نەدرانی ئەوەندەش کە هەیە (هەم لە لایەن خوێندکارەکانەوە و هەم لە لایەن مامۆستاکانەوە) مەگەر چۆن بێ دەنا بابای خوێندەواری مەدرەسەیی لە ئاکامدا یان ئەوەتا بیروباوەڕ لە دەست دەدا و لە دین وەردەگەڕێ، یان ئەگەر بە مسوڵمانیش بمێنێتەوە دوای چەندها ساڵ خوێندن ئاگایەکی لە دین نابێ و تەنانەت دەچێتە ریزی دوژمنانی دینەوە و دەبێتە داردەستی دەستی لاوەکیان و لاوەکانمان لە رێ تلاسا دەکا و بۆ ماوەیەکی سەریان لێ دەشێوێنێ.[1]

بەڵێ بە هۆی ئەو پیلانە زیانهێنەرەوە بەشێکی هێگجار زۆری خەڵکەکەمان بگرە خوێندەوارەکانیشمان لە یاساکانی دین تەنانەت لەو شتانەش کە زانین و ئیش پێ کردنیان لە سەر هەموو کەس پێویستە واتە «فرض‌العين»ن بێ ئاگا و خەبەرن.

جا ئیدی بەو پێیە روونە کە هۆی لێک‌جیابوونەوەی زانستەکان و پەیدابوونی دیاردەی فەقێ و فەقێیەتی چییە و چ زیانێک لەو مەودایەدا لە مسوڵمانان کەوتووە و دەکەوێ.

دەنا ئەگەر لە نیشتمانی گەورەی مسوڵماناندا یان لە هەرکوێیەک مسوڵمانی لێ دەژین دین و سیاسەت تێکەڵ بن و یاساکانی ئیسلام بچەسپێندرێن، هەموو دەردێکی مسوڵمانان بۆ نموونە ئەو دەردانەی باس کران چار دەکرێن و ئەگەر ئەو هۆ بنەڕەتییە

---

۱ ـ هەڵبەت دەبێ پێ‌لەو راستییەش بنێین کە ئەو مەسەلەی باس کرا، تێکرا و بەزۆری ئاوایە دەنا سوپاس بۆ خوا لە دنیای ئیسلامەتیدا زۆر مامۆستا و خوێندکاری مەدرەسەییمان هەیە کە دەگەڵ ئەوەشدا دەرسی دینیان وەک پێویست بۆ دانەنراوە و پێیان ناگوترێ، هەر بۆ خۆیان هەوڵ دەدەن و لەملاولا و بە موتالا خەریکی فێربوون و لێکۆڵینەوەی ئایینن و پاش ئەوەش کە بۆ خۆیان فێر بوون، دەکەونە بلاوکردنەوەی بەنێو بنەماڵە و کەس‌وکار و دۆست و ئاواڵ و دەوروبەریاندا.

تەنانەت هەندێکیان دەگەڵ ئەوەش کە لە بەرگی مەلایەتی و فەقێیەتیدا نین و مامۆستای تایبەتیان نیە هەر بە تێکۆشانی خۆیان دەگەنە پلەیەکی وا لە خزمەت‌کردنی دین کە لە هی مەلایەکی باش زۆر شوێن‌دانەر (مۆثر)تر و بەکەڵکترە.

(حاکمنەبوونی ئیسلام) نەبێ، نابێ دوو بەرنامە و ڕەوشت بۆ خـوێندن و دوو جـۆرە فێرگەمان بین، لەلایەک قوتابی ڕەسمی هەموو جۆرە پێویستییەکی بـۆ دابـین بکـرێ و دواڕۆژی خوێندنەکەی لێرا دیار بێ و لەلایەکی تریشەوە فەقێ و خوێندنەکەی بە ڕەسمی نەناسرێ و لە هەموو ئامرازێکی پێویست بۆ خوێندن بێبەش بێت!!!

نابێ ئەو زانستانە هیچیان لە هیچیان جیا بکرێنەوە بەڵکو هەر زانستێکی بەسوود بۆ کۆمەڵ چ پێوەندی بە دینەوە بێ چ بە دنـیاوە چ بـە هـەردووکیانەوە دەبـێ تـێکرا لە قوتابخانە ڕەسمییەکان بخوێندرێت، بەو شێوە هەر کەسێک ڕوو بکاتە مەدرەسەکـە لە کۆمەڵێکی پێشکەوتووی ئیسلامیدا دەبێ هەموو پێویستییەکانی خوێندنی سەرەتایی بۆ هەموو کەس دابین بکرێنئەو بەشە لە زانست کە زانینی لە سـەر هـەموو مسـوڵمانێکی «مکلّف» واجب و پێویستە فێر دەبێ و بەو پێیە دەبێتە نیمچە مەلایەک و لەوێش پێهەڵلا کابرا چ ڕشتەیەکی پێخۆش بوو یان سەرکەوتنی زیاتری تێدا وەدەست هێنابا درێژەی پێبدات و بەو پێیە لە هەموو ڕشتەکاندا وەک: فقه، تەفسیر، ئوسوول و... کەسانێک ببنە پسپۆر (متخصص) تا خەڵک بەپێی پێویست بچنە لایان و پرسیاریان لێبکەن و کەڵکیان لێ وەرگرن.

مامۆستا ئەبولئەعلا مەودوودی(خ) لە کتێبی «اسلام و تمدن غرب»دا کە «ابراهیم امینی» وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی لەژێر سەردێری «زانستە ئیسلامییەکان دەگەڵ ڕشتەکانی تر تێکەڵ بکەن»دا دەنووسێ: «...بەڵام سەبارەت بە ئەو ڕشتانەی کە تایبەت بە زانستە ئیسلامییەکانن، دەبێ هەر ڕشتەیەک دە نێو بەرنامەی ئەو ڕشتەدا بگونجێندرێ کە لێیدەوەشێتەوە، بۆ نموونە فەلسەفەی ئیسلامی بە مێژوویەوە دەگەڵ ڕشتەی فـەلسەفە، مێژوو و فەلسەفەی مێژوو دەگەڵ ڕشتەی مێژوو، ڕێبیرەکانی[1] یاساکانی ئیسلام و ئەو مەسەلە «فقهی»یانەی پێوەندییان بە کڕین و فرۆشتنەوە هەیە دەگەڵ ڕشتەی «حـقوق»، ڕێبیرە ئـابوورییەکـانی ئـیسلامی (مـبادی اقـتصاد اسـلامی) و مـەبەستە «فـقهی»یـە ئابوورییەکان دەگەڵ ڕشتەی ئابووری تێکەڵ بکرێن.»

---

١ - ڕێبیر: مبدأ (خاڵ)

«بێجگە لە بەرنامەی ناوبراو دەبێ رشتەیەکی تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زانستە ئیسلامییەکان دابندرێ کە بە خوێندکارەکانی باوەڕنامەی «دکترا» بدرێت... و دەبێ بۆو رشتە کەسانێک هەڵبژێردرێن کە بۆ «اجتهاد» و لێکۆڵینەوە لە باسە ئیسلامییەکان ئامادەیان بێ و بتوانن بەپێی گەلاڵە گەلێکی قووڵی ئیسلامی نەک تەنیا رابەڕایەتی مسوڵمانان بەڵکو دەبێ رابەرایەتی بیروڕای خەڵکی تریش وەئەستۆی خۆیان بگرن.»[1]

لەم توی یەدا دەمان ویست باسی زانستەکان و پەراوە دەرسی یەکان بکەین؛ بەلاّم دەردی دڵ و سکالاّ وەک رەشەبا هەڵی گرتین و دەنێو ئەو باسەی پەستاوتین ئیستاش وەک شاعیر دەڵێ: «دەردی دڵ بۆکێ بەیان کەم دڵ کەنالاوێتەوە» جاکە وایە دەکەوینەوەسەر تێک‌حستنەوە و هەڵکردنەوەی داوی پساو و هاڵوازوی تووی چوارەم و دەڵێین:

بەڵێ زۆر لە مێژە لەلایەن هیچ کامێک لە دەسەلاّتدارەکانەوە چاوەدێری یەکی بەکەڵک لەو خوێندنە نەکراوە و رێزی پێویست بۆ خوێندکار و زانا ئایینی یەکان دانەنراوە و ئەوەندە چاودێری و رێزەی هەبوویش زیاتر لە ترسی خەڵکی مسوڵمان یان بۆ ئەوە بووە خۆ، وانیشان بدەن کە بەڵێ پشتیوانی دینن و دەیان هەوێ زانای دینی دروست بکەن و ئایین وەگەشێنن، جا بۆیە خوێندن و زانستی دینی هەر لە شێوەی سەرەتایی خۆیدا ماوەتەوە و لە گەشە کردن و پەرەسەندن وێستاوە و هیچ وەستایەتی یەکی لێ دەکار نەکراوە و نەدراوەتەبەر توێژینەوە و لێ کۆڵینەوە و کۆڵی پێوە هەڵنەگیراوە و گیروگرفتی چارەسەر نەکراوە و تەنانەت بەرەو پاشیش چووە و زۆر لک و پۆپی ون بووە.

ئەوەندەی کە ماوەتەوە و ئێستا لە بەر چاوە لە سایەی رەنج و ماندوویی مامۆستا ئایینی یەکان و خزمەت و تێکوشانی خەڵکی خواناس و مسوڵمانەوەیە. ئەوە تا دەبینین مامۆستا ئایینی یەکانی کوردستان دەگەڵ ئەوەش‌دا کە ژیانێکی پڕلە مەینەت و تاڵی یان هەبوە و هەیە و لەباری ژیانەوە باریان کەوتووە و تۆوی خەم و پەژارە لە دڵیان‌دا چەقەرەی داوە و داوی بێ بەشی و بێ‌نازییان لە لاقی هاڵاوە و هالاّو و بۆچرۆکی برسیەتی یان لێ هەستاوە و هەستی یان بە کەم و کووری هەمەلایەنە کردووە، واش هەستاون و پیاوانە و بێ

---

١ ـ اسلام و تمدن غرب نوسراوی ابوالاعلی مودودی، وەرگێراوی ابراهیم امینی ل ٢٦٧ تا ٢٦٨ چاپی سێهەم.

چاوەڕوانی لە هیچکەس، قۆڵیان لە دەرس‌گوتن و کتێب نوسین و نوسینەوە هەڵماڵیوە و تۆزی غەریبی و بێ‌نازی‌یان لە سەر شانی بێ شانسی ئەو خوێندن و زانیاری‌یانە راماڵیوە و راماڵیان بردۆتەسەر دێوەزمەی نەزانی‌و چوار فەسڵە حوجرەیان بە گوڵی موستەعید و خونچەی سوختە خەملیوە!!

وە هەروەها خەڵکی مسوڵمانی کوردیش سەرەرای ئەوەی کە تەنانەت بۆ ژیـانی ساکار و سەرەتایی خۆشیان زۆر کەند و کۆسپیان هاتۆتە پێش و دەست تەنگی و هەژاری سەر رێی پێ گرتوون تووناوتونی کردوون[1] و کوناوکون بـۆیان گـەڕاوە و راوی لێ‌دا بەشیون و شیو و دۆڵی لێ‌تەنیون، لە بەر ئەوەی کە هەستیان بەبەرزی و بێ وێنەیی ئایینی ئیـسلام و پێویستی ماموستای ئایینی کردووە و کـردەوەیان لێ دیـتووە و زانـیویانە دە ریشەیان دەکشێ و بەرژەوەندی دینی و دنیایی وانـی تـێدایـە؛ بـێ‌ئەوەی هـەست بـە ماندوویی بکەن، ئەرکی بەرێوە بردنی ژیانی فەقێیەکانیان وەئەستۆی خۆگرتووە و هاورێ دەگەڵ ماموستایەکان قۆڵی پیاوەتی و لە خۆبوردوویی‌یان هەڵماڵیوە و تێکرا، یەک بە ماڵ و یەک بە زمان و یەک بە نان سەرەرای زۆری و بەرهەلستی نەیار و دوژمنان؛ نەیانهێشتووە ئەو خوێندنە بە یەکجاری لە ناو بچێ و شوێنە ون ببێ و بەو شێوە کە ئێستا هەیە رایان گرتوە.

ئەوان پاراستن و پەرە پێدانی ئەو خوێندنەیان بە ئەرکی سەرشان زانیوە بەلام لە بەر ئـەو هـۆیانەی بـاس کـران و چـەند هـۆی‌تریش‌لەوانـە: دەست نـەرۆیشتوویی و بێ‌دەسەلاتی نەیان توانیوە یان رێیان پێ‌نەدراوە زیاتر پەرەی پێ‌بدەن و لە بیچمێکی[2] نوێ‌دا، وەدەری‌خەن وەک هەموو شتێکی دی وەسەری خەن.

بەڵێ وەک گوترا لەبەر ئەوەی دەسەلاتداران و کاربەدەستانی وەخت لاگیریەکی بەکەڵکیان لەو خوێندنە و لەو کەسانەی تاویان داوەتێ، نەکـردووە لەشـێوەیەکـی زۆر سەرەتایی‌دا ماوەتەوەو زانستەکان نەک هەر ئاڵ و گـۆرێکی سـودمەندیان تـێدا پـێک نەهاتووە بەڵکو تەنانەت پەڕاو «کتێب»ەکانیش دەستیان لێ‌نـەدراوە و لە بـاری رێک و

---

١ - تووناوتون: بەیەکجاری فەوتان و ئاسەوارنەمان. (هەنبانەبۆرینە)

٢ - بیچم: شێوە. (خاڵ)

پێککردنی ناوەرۆک و شێوەی چاپکردن و چۆنیەتی دانانی مەبەستەکان و ئەوانە وە لەسەر چونیەتی کۆن ماونەوە و بەرێ و رەسم و نەزمی تازە دەر نەهاتوون.



ماموستا و فەقێی حوجرەی مزگەوتی «سید قطب» لە بۆکان

## فەقێیەکان چ دەخوێنن؟

ئەو زانستانەی کە لە فەقێیەتی‌دا دەخوێندرێن و هێندێ لەو کتێبانەی کە لەو زانستانەدا نوسراون و لە بەر دەستدان بریتین لەوانەی خوارەوە:
پێشەکی پێویستە ئەوەی بڵێم‌کە ئەو کتێبانەی ناویان دەبەم کتێب گەلێکن کەلە بەر

دەستی فەقێیەکانی کوردستان دان بەتایبەت بەشە کوردستانی سەر بە ئێران و ئیتر ئاگاداری شوێنەکانی دیکەی نیشتمانی ئیسلامی نیم. و هەروەها هەرچی کتێبیش هەیە ناوی نابەم و تەنیا ئەوانە ناو دەبەم کە زۆرتر لە بەر دەستان و بەخوێندن، یان بۆ موتالا کەڵکیان لێ وەر دەگیرێت.

## یەکەم (صرف)

«صرف» زانستێکە لە گۆڕین «اعلال» و داتاشین «اشتقاق»ی و وشە «کلمە» بێ پێوەندی دەگەڵ رستەدا«جوملە» دەدوێ.

ئەو پەرتوکانەی لەو زانستەدا لەبەر دەستان بریتین لە:

١ـ تصریف‌الزنجانی، کە نوسراوی «شێخ ابراهیم» زەنگانی‌یە و پێشەکیەکی زۆر بەنرخە.

٢ـ شرح تصریف‌الزنجانی؛ نوسراوی «پیرخضرالشاهۆیی».

٣ـ شرح تصریف‌الزنجانی مەشهور بە شەرحی سەعدینی نوسراوی «سعدالدین التفتازانی».

٤ـ تصریف ملاعلی. دانراوی مامۆستا مەلاعەلی شنۆیی‌یە و دوو پەراوێزی لە سەرە: یەکیان بە ناوی «قزڵجی» و نوسراوی مامۆستا مەلاعەلی قزڵجی‌یە و لە گرانی و چەتوونی‌دا بەنێو بانگە. دووهەمیشیان بە ناوی «قەرەداغی» و نوسراوی مامۆستا مەلا عومەری قەرەداغی‌یە، کە ئەمەیان هاسانترە. ئەو سێ کتێبەش هەر سێکیان راڤە «شرح»ی «تصریف الزنجانی» دەکەن.

٥ـ الشافیە، نوسراوی بەڕێز «ابن‌الحاجب» کوردی‌یە و بە چێواشە و چەتوون نێوی روویی‌وە و تەنانەت فەقێ لە، لەبەرکردنی زۆر دەترسن.

٦ـ شرح النظام، نوسراوی «حسن بن محمد نیشابوری»یە و راڤەی «شافیە» دەکا، وەک لێرەوە پێشیش باسمان کرد.

٧ـ شرح‌الشافیە، نوسراوی «سید عبداله نقرەکار» کە ئەمیش هەر راڤەی شافیەی ابن الحاجب دەکات و بە «سید عبداللەی صرفی» بە ناوبانگە.

٨ـ صرف میر، نوسراوی «میر سید شریف‌الجرجانی» یە و بە زمانی فارسی نوسراوە و لە تصریف الزنجانی درێژترە.

٩ـ کمال‌الدین، کە ئەمیش هەر شەرحە لە سەر شافیە و نوسراوی «محمد کمال‌الدین الفسوی»یە.

هەروەها چەند نوسراوی دیکەش هەن و لە بەر دەستان وەک: (صیغ‌مشکلە) و (امثلە) و (شرح‌امثلە)[1] کە فەقێیەکانی کوردی زمان کەم واهەیە بیانخوێنن.

**دووهەم: (نحو)**

نحو زانستێکە قسە دەکا لە وشە«کلمە» لە باری گۆڕانی ئاخری (اعراب و بنا) وە لە نێو جوملەدا.

لەو زانستەش‌دا نوسراوەی زۆر هەن کە هەندێکیان بریتین لە:

١ـ عوامل جرجانی، نوسراوی عبدالقاهر گورگانی.

٢ـ عوامل منظومە نوسراوی عبدالقاهر و هۆنراوەی کمال‌الدین ابن حسام.

٣ـ عوامل ملا محسن، نوسراوی مەلا موحسین.

٤ـ سعداللەی گچکە کە شەرحە لە سەر عوامل الجرجانی و نوسراوی «سعدالدین التفتازانی»یە

٥ـ شرح‌العوامل، لە سەر عوامل الجرجانی نوسراوی عبدالقاهرالجرجانی یە.

٦ـ الهدایە، نوسراوی ابو حیان غرناطی اندلسی.

٧ـ «شرح‌الانموذج» نوسراوی «محمد بن عبدالغنی الاردبیلی»یە و راڤەی کتێبی «انموذج» نوسراوی «جارالله الزمخشری» دەکات.

٨ـ «الصمدیە» نوسراوی «بهاءالدین عاملی»یە و لە لایەن زانا شیعەکانەوە گەلێک شەرحی لێ کراون وەکی: سید علیخان کبیر وصغیر و حدائق و شرح‌الصمدیە.

٩ـ العوامل المحشی.

---

١ ـ امثلە و شرح امثلە نوسراوی «میر سید شریف‌الجرجانی»ن.

١٠ـ الاظهار، کە ئەو دوانە نوسراوی «زین‌الدین محمد بن پیر علی البرکوی»ن.
١١ـ «اطەلی» کە شەرحە لە سەر «اظهار» و نوسراوی «شێخ مصطفی بن حمزە»یە.
١٢ـ «الکافیە» نوسراوی «ابن الحاجب» کوردی یە.
١٣ـ «الفوائدالضیائیە» یان «شرح جامی» کە نوسراوی «شیخ عبدالرحمن جامی»یە و لە سەر کافیەی ابن الحاجب دانراوە.
١٤ـ البهجةالمرضیة یان السیوطی کە راڤەی «الفیة»ی «ابن المالک» دەکا وەک لەمەوە بەریش باسمان کرد.
١٥ـ مغنی اللبیب نوسراوی جمال‌الدین ابن هشام الانصاری.
وە هەروها زۆر کتێبی دیکەش لە عیلمی «نحو»دا لە بەر دەستدا هەن بەلاّم بۆوەی ئەو باسە درێژە نەکێشی لە باس کردنیان خۆ دەپارێزین.

سێهەم «المنطق»

«منطق» ئامرازێکی یاسایی‌یە کە خۆی پێ لە هەڵە کردن لە بیرکردنەوەدا دەپارێزرێت.
هێندێک لەو پەڕاوانە کە لەو زانستەدا نوسراون و لە بەردەستان بریتین لە:
١ـ «کبری‌فی‌المنطق» کە بە زمانی فارسی و نوسراوی میر سید شریف گورگانی‌یە.
٢ـ «ایسا غوجی» نوسراوی «اثیرالدین الابهری»یە.
٣ـ «مغنی‌الطلاب» نوسراوی «محمود بن حافظ حسن المغنینی»یان «المغنیساوی»یە.
٤ـ «گلنبوی شرح» نوسراوی «شیخ اسماعیل الگلنبوی»یە.
٥ـ «فناری» نوسراوی «شمس‌الدین محمد بن حمزةالفناری»یە.
ئەم سێ کتێبانە لە سەر «ایساغوجی» دانراون.
٦ـ «قول احمد» حاشیەیە لە سەر«فناری» و نوسراوی «قول احمد»ە.
٧ـ «ملتقطة» نوسراوی مەلا «عثمان»ی «دارە قوتە»یە کە خەڵکی دارە قوتەی سەر بە شاری قەلاّدزێ بووە.

٨ـ «حاشية الملا عبداللهاليزدی» کە پەراوێزی «تهذیب‌المنطق»ی «سعدالدین التفتازانی»یە و ناویشی بە گرانی دەرکردووە؛ بە تایبەت باسی «موجهات»ی زۆر شانگیرە.

٩ـ «گلنبوی برهان» نوسراوی «شێخ اسماعیل الگنبوی»یە و «متن ومنە»یە

١٠ـ «شرح الشمسیە» کە راڤەی «الشمسیة»ی «نجم‌الدین القزوێنی‌الکاتبی» دەکا و نوسراوی «قطب الدین محمودی بن محمد الرازی»یە.

و هەر لە «منطق» دا دەیان کتێبی‌تریش بە شێوەی: متن، متن و شرح، متن و منە و حاشیە هەن کە نێوبردنیان لێرەدا بە پێویست نازانم.

## چوارەم «معانی»

زانستی «معانی» زانیاری‌یەکە بە هۆی ئەوەوە چۆنیەتی بەرانبەرکردن «تطبیق»ی و وتە «کلام» دەگەڵ «مقتضی»ی «حاڵ» دەناسرێ.

## پێنجەم «بیان»

«بیان»، زانستێکە بە هۆی ئەوەوە چۆنیەتی دەربڕینی مەبەست بە چەند رێگای جوێ‌جوێی واکە هێندێکیان ئاشکراترن لە هێندێکیان، دەناسرێ.

## شەشەم «بدیع»

«بدیع» زانستێکە، لە رێگاکانی جوانکردنی ووتە و رازاندنەوەی قسە دەدوێ.

ئەو کتێبانەی لەو سێ زانستانەدا هەن بریتین‌لە:

١ـ «رسالة الاستعارە» کە نوسراوی مەلا «ابوبکر میر رستم»یە و تەنیا قسە لە زانستی «بیان» دەکات.

٢ـ «تلخیص‌المفتاح» نوسراوی «محمد بن عبدالرحمن القزوینی»یە و لە هەر سێکی ئەو زانستانە دەدوێ.

٣ـ «مطوّل» کە نوسراوی «سعدالدین التفتازانی»یە و شەرحە لە سەر «تلخیص المفتاح».
٤ـ «مختصرالمعانی» لە لایەن نوسەری ناوبراوەوە لە «مطول»راکورت کراوەتەوە.
٥ـ «جواهرالبلاغه» نوسراوی «السیدالمرحوم احمد الهاشمی»یە.
٦ـ «البلاغة الواضحة» نوسراوی «علی الجازم و مصطفی امین»انە.
٧ـ «علوم البلاغة» نوسراوی «مصطفی غلاینی».
ئەم سێیانە تازە هاتونە ناوەوە.

## حەوتەم «وضع»

«وضع» زانستێکە قسە لە چۆنیەتی دانانی ووشە لە بەرانبەر مانادا دەکات و لەو زانستەش‌دا هەر «رسالةالوضع»ی مەلا «ابوبکر المصنف المیررستمی»یم پێ‌شک دێت.

## هەشتەم «کلام»

«کلام» زانیاری‌یە کە قسە دەکات لە ذات و صفات‌ی خوا و بیر و باوەرەکان«معتقدات»ی تری ئیسلامی.
لەو زانستەش‌دا ئەو پەڕاوانە هەن:
١ـ «ئاقیدەی شێخ سەمیع» کە حاجی شێخ عبدالسمیع بانەیی بە هونراوە و بە زمانی کوردی نوسیویەتی.
٢ـ «شرح العقایدالنسفی» کە نوسراوی «سعدالدین التفتازانی»یە و راڤەی «العقاید»ی نجم‌الدین عمر النسفی دەکات.
٣ـ «رسالة التوحید» نوسراوی «الشیخ محمد عبده» ویە و لەم دوایی‌یانەدا لە لایەن ماموستا مەلاعبداللەی احمدیانەوە وەرگێردراوەتەوە سەر زمانی فارسی.
٤ـ «تهذیب الکلام» نوسراوی «سعدالدین التفتازانی»یە و مەلا«عبدالقادر التختی» شەرحێکی درێژی لە دوو بەرگ‌دا بە نێوی تقریب‌المرام» لە سەر کردووە.

**نۆهەم «آداب البحث»**

«آداب البحث» کردەیێکی «نظری»یە قسە دەکات لە چۆنیەتی باس و دەمەتەقە و ئەو هەل و مەرجانەی لە گفتوگۆدا پێویستن بۆ تێ نەشکان و دمکووتکردنی دژ.

لەو زانستەش‌دا هەر کتێبی «گلنبوی آداب»م دیووە کە نوسراوی «شێخ اسماعیل الگلنبوی»یە و دوو پەراوێزیشی لە سەرە یەکیان ئی «الشیخ عمر ابن القرەداغـی»یـە و ئەوی دیش ئی «ملاعبدالرحمن» الپێنجوێنی»یە.

**دەهەم «اصول الفقه»**

«اصول الفقه»، عیلمێکە قسە دەکا لە سەر چاوەکانی شەرع[1] و شێوەی درووستی دەرهێنانی «فقه» لەو سەر چاوانە.

کتێبەکانیشی ئەمانەن:

١ـ جمع الجوامع، نوسراوی «عبدالوهاب ابن السبکی».

٢ـ «شرح الجلال محمد بن احمد المحلی» کە «شرح»ی «جمع الجوامع»ە و دوو پەراوێزی لە سەرە: یەکیان بە ناوی «البنانی» و نوسراوی «العلامةالبنانی»یە و ئەوی دیش بە ناوی «الشربێنی» و نوسراوی «عبدالرحمن الشربینی»یە.

٣ـ «لب الاصول» مەتنی «غایةالوصول»ە کە هەر دوکیان هی «قاضی زکریا»ن و لە «جمع الجوامع و شرح الجلال المحلی» راکورت کراونەوە.

٤ـ «المستصفی» نوسراوی بەرێز «امام محمد الغزالی»یە.

٥ـ «الوجیز» کە هی «دوکتور عبدالکریم زیدان»ە و تازە هاتۆتە ناوەوە.[2]

---

١ ـ کە بریتین لە: کتاب، سنت، قیاس اجماع و ...

٢ ـ لەم دوایی یانەدا الوجیز لە لایەن مامۆستا احمد نعمتی پاوەیی یەوە کورت کراوەتەوە و بە شێوەی پرسیار و وەڵام دەرهاتوە و شتێکی بە نرخە.

**یازدەهەم «حکمت ـ فلسفه»**

«حکمت» زانستێکە قسە دەکات لە راستەقینەی شتوەک هەیە لە بووندابە پێی توانینی بەشەر.

نواسراوە بیندراوەکانی ئەم زانستە بریتین لە:

١ـ «مقولات العشر» کە دانراوی ماموستا مەلا عەلی قزلجی‌یە و شەرحێکی لە سەرە بە نێوی «بدرالعلاةفی کشف غوامض المقولات» کە نوسراوی «الشیخ عمر» ناسراو بە «ابن القرەداغی» یە و هەر خۆیشی پەراوێزێکی لە سەر «بدرالعلاة»ە کە داناوە کە لە زاراوەدا ئەمجۆرە نوسراوە واتە شتێک نوسەر لە سەر نوسراوەی خۆی بە شێوەی پەراوێز بینوسێ«منه»ی پێدەگوترێ.

٢ـ «قاضی ولاری» شەرح و مەتنە؛ مەتنەکە هی «اثیرالدین الابهری» و شەرحەکەشی هی «قاضی میبدی»یە.

٣ـ «سبزواری» شەرح و مەتنە و هەردوکیان هی «ملا هادی سبزواری»ن.

**دوازدەهەم « عروض» و «قافیه»**

«عروض» زانستێکە بە هۆی ئەوەوە کێش « وزن» و گۆڕانی هۆنراوە «شعر» دەزاندرێ.

«قافیه»ش زانیاری یە کە لە پێکەڵپێک هاتنەوەی ئاخری هونراوە واتە «قوافی الشعر» و ئەحوال و چونیەتی وان وەک «الحرکة، السکون، اللزوم، الجواز، الصحیح، القبیح و ... دەدوێ.

کتێبگەلێک کە لەو دوو زانستە لە بەر دەستا هەن بریتین لە:

١ـ «العروض» نوسراوی «الشیخ معروف النودهی» و تەنیا لە عەروز دایە.

٢ـ «العروض و القافیه» نوسراوی بەرێز «الشێخ محمد امین البیژوەیی»یە و لە هەر دوو زانستەکە دەدوێ.

٣ـ «رسالة ارجوزة القافیه» نوسراوی «محمد حسن ابن القزلجی»یە و هەر لە

زانستی قافیە باس دەکات.

**سێزدەهەم «علم الریاضیات»و «الهندسة».**

دوو عیلمن قسە لە ژمێرەو ئەندازە دەکەن.

لەو دوو زانستەدا چەند نوسراوە هەن یەکێک لەوان کتێبێکە بە نێوی «خلاصةالحساب والهندسه» کە نوسراوی «بهاءالدین العاملی»یە و لە لایەن «محمد ابن آدم»ی کوردی باڵەکی یە وە شەرح کراوە و هەروەها تازەش شەرحێکی لە سەر کراوە لە لایەن: ( سید محمد جواد ذهنی )یەوە بە نێوی «اللباب شرح خلاصةالحساب». یەکێکی تر «اشکال التأسیس» نوسراوی «بهاءالدین العاملی»یە و لە لایەن «ابن آدم»ەوە پەڕاوێزێکی لەسەر نوسراوە. وە هەروەها چەند نوسراوی دیکە لەو دوو عیلمەدا هەیە.

**چواردەهەم «علم الهیئة» یا «علم الفلك»**

«علم‌الفلک» زانستێکە قسە دەکا لە شوێن و جولاْن و چونیەتی جیرمە عاسمانی یەکان.

کتێبەکانی ئەم زانیاری یە بریتین لە «تشریح الافلاک» نوسراوی «بهاالدین» ناوبراو.تازەش شەرحێکیی لە سەر کراوە بە ناوی «شرح تشریح الافلاک» لە لایەن محمد جواد ذهنی تهرانی»یەوە و هەروەها لە لایەن مامۆستا مەلا شێخ عبدالرئوف نقشبندی سەردەشتی یەوە وەرگێردراوەتەوە سەر زمانی فارسی و بە نێوی «آینەی جهان نما» نێونراوە بەلاْم هێشتا چاپ نەکراوە و ربعین و اسطرلاب.

**پازدەهەم «التفسیر»**

تەفسیر زانستێکە لە بارەی مانا کردنەوە و لێکدانەوەی چەمک و مەبەستەکانی قورئاندا دەدوێ.

لەو بارەش‌دا نوسراوەی زۆر هەیە کە هێندێکیان ناو دەبەین:

١ـ «تفسيرالجلالين» نوسراوی جلال‌الدين السيوطی و جلال‌الدين المحلی‌یە.

٢ـ «تفسيرالبيضاوی» نوسراوی «قاضی عبدالله البيضاوی الشيرازی»یە.

٣ـ «تفسيرالخازن» يان «لباب التأويل فی معانی التنزيل» نوسراوی «علاءالدين علی بن محمد بن ابراهيم البغدادی» ناسراو بە «خازن»

٤ـ «تفسير مدارک التنزيل و حقايق التأويل» نوسراوی «ابو البرکات عبدالله بن احمد بن محمود النسفی».

٥ـ «تفسيرالمراغی» نوسراوی «احمد مصطفی المراغی»

٦ـ «فی ظلال القران» نوسراوی شەهيدی ژێر سێبەری قورئان «سيد قطب»

٧ـ «التفسير القرآنی للقرآن» نوسراوی «عبدالکريم الخطيب»

٨ـ «تفسيرالصاوی علی‌الجلالين» نوسراوی «الشيخ احمدالصاوی»

٩ـ «تفسير روح‌المعانی»

و برێکی دیکەش تەفسیرکە لە بەردەستان و زۆربەیان تازە کەوتونە بەردەست.

شازدەهەم «فقه»

«فقه» زانیاری‌یە کە قسەدەکا لەو دەستوراتە شەرعی‌یانەی کە لە بەڵگە و سەرچاوەکانیانەوە دەردەهێندرێن.

هێندێک لە کتێبەکانی «فقه»یش بریتین لە:

١ـ «فتح‌القريب»نوسراوی «الشيخ‌محمد قاسم الغزی»یە و لە سەر «غايةالاختصار» نوسراوی «علامە ابوشجاع»ی ئیسفەهانی‌یە.

٢ـ «فتح‌المعين» نوسراوی «زين‌الدين الميباری»یە.

٣ـ «اعانةالطالبين» نوسراوی «علامەابوبکر» ناسراو بە «السيدالبکری»یە و لە سەر «فتح‌المعين»ە.

٤ـ «منهاج‌الطالبين» دانراوی «ابو زکريا يحيی بن شرف‌النووی» و کورت کراوی «المحرر»ی «ئیمامی رافعی قەزوێنی‌یە.

٥ـ «مغنی‌المحتاج» نوسراوی «الشيخ محمد الشربينی الخطيب» کە راڤەی

«منهاج الطالبين» دەکات.

٦- «السراج الوهاج» نوسراوی «الشيخ محمد الزهري الغمراوي» كە ئەمیش هەر لە سەر «منهاج الطالبين»ە.

٧- «تحفة المحتاج» نوسراوی «الشيخ احمد ابن الحجر الهيتمي»یە و راڤەی «منهاج»ی ئیمامی نەوەوی (رح) دەکات.

٨- «النهايه» نوسراوی «الشيخ محمد الرملي» یە و لە سەر «منهاج»ە.

٩- «منهج الطلاب» نوسراوی قاضی زکریا الانصاری و کورت کراوەی «منهاج الطالبين»ە.

١٠- «فتح الوهاب» شرح منهج الطلاب» ئەو دوو شەرح و مەتنە هی «قاضی زکریا الانصاری»ن.

١١- «البيجوري» کە راڤەی «فتح القريب» دەکا و نوسراوی «الشيخ ابراهيم البيجوري»یە.

١٢- «حاشية البجيرمي» یا « التجريد لنفع العبيد» پەراوێزە لە سەر «شرح المنهج»ەونوسراوی «سليمان بن عمر بن محمد البجيرمي»یە.

١٣- «حاشية الجمل» نوسراوی «الشيخ سليمان الجمل»ە و ئەویش هە ر پەراوێزە لە سەر «شرح المنهج».

١٤- «بغية المسترشدين» پالاوتەیە کە لە فتوای بڕێک لە پێشەوایانی زانای «متأخر» و لە لایەن «السيد عبدالرحمن المشهور باعلوي» کۆکراوەتەوە.

١٥- «المجموع» نوسراوی «الامام النووي»یە و لە سەر «المهذب»ی «ابواسحق»ی شیرازی یە.

١٦- «شەریعەتی ئیسلام» نوسراوی «مەلا عبدالكريم مودەریس»ە و بە زمانی کوردی نوسراوە.

١٧- «فقه محمدی» نوسراوی «آية الله محمد مردوخ»ی کوردستانی یە و بە زمانی فارسی نوسراوە.

هەروەها گەلێکی تر نوسراوەی زل و چووک هەن لە«فقه»دا کە لە نوسینیان

خۆدەپارێزین.

**حەڤدەهەم: «الحدیث ـ یا ـ السنة»**

«حدیث» شتێکە لە پێغەمبەرد. گیردرابێتەوە؛ لە فەرمودەیان کردەوەیان بێدەنگی لە بەرانبەر کارێک یان قسەییەکدا کە لەلای وی کرابێت. لە حدیثدا ئەو کۆکراوانە هەن:

١ـ «صحیح‌البخاری» کۆکراوەی «ابوعبدالله محمد بن اسماعیل».

٢ـ «صحیح‌مسلم» کۆکراوەی «ابوالحسین مسلم بن‌الحجاج»ی نیشابوری.

٣ـ «سنن ابی‌داود» کۆکراوەی «سلیمان بن‌الاشعث‌السجستانی» ناسراو بە ابو داودە.

٤ـ «سنن ابن ماجه» کۆکراوەی «محمد بن یزید القزوینی، ابو عبدالله»ە.

٥ـ «جامع الترمذی» کۆکراوەی «محمد بن عیسی».

٦ـ «المجتبی‌للنسائی» کۆکراوەی «احمد بن علی بن شعیب ابو عبدالرحمن»ی خوراسانی.[١]

کە ئەو شەش کۆکراوانە بە «الصحاح الستە» بە ناوبانگن و زۆر کتێبی دیش هەن وەکی «التاج‌الجامع للاصول» و «ریاض‌الصالحین» و ...

**هەژدەهەم «علم‌الحدیث»**

علم الحدیث زانستێکە بە هۆی ئەوەوە وتە و کردەوە ژیوارەکان «احوال»ی پێغەمبەرد. دەزانرێن.

لەو زانستەدا ئەوکتێبانە لە بەر دەستا هەن:

١ـ «علوم الحدیث» نوسراوی «الدکتور صبحی الصالح».

٢ـ «مصطلح الحدیث» نوسراوی «العلامةالبرکوی»یە و شەرحێکی لە لایەن «داودالقارصی»یەوە لەسەر کراوە.

٣ـ «تیسیرمصطلح‌الحدیث» نوسراوی «الدکتور محمود الطحان».

---

١ ـ زۆربەی زۆری ئەم کتێبانەش لە کوردستانی ئێمەدا نەبوون و لەم دوایی‌یانەدا پەیدا بوون.

٤- «علوم الحدیث» نوسراوی «عثمان ابن الصلاح»ی شارەزوری.

**نۆزدەهەم «علوم القرآن»**

علوم القرآن چەند زانستێکن قسە دەکەن لە: چۆنیەتی هاتنە خوارەوە و لە بەرکردن و نوسینەوە و خوێندنەوە و مانا کردن و ... ی قورئان.

لەو زانستانەش‌دا دەیان کتێبی زل و چووک نوسراون کە ئەو چوار ـ پێنج دانەیان لە بەر دەست‌دا هەن:

١ـ علوم‌القرآن نوسراوی احمد عادل کمال.

٢ـ التصویرالفنّی فی‌القرآن نوسراوی سید قطب کە دوو جار، جارێک لە لایەن «محمد مهدی فولادوند»ەوە بە ناوی «آفرینش هنری در قرآن» و جارێکیش لە لایەن «محمد علی عابدی» بە ناوی تصویر فنی نمایش هنری در قرآن، وەرگێڕدراوەتەوە سەر زمانی فارسی.

٣ـ «علوم القرآن» نوسراوی «الدکتور صبحی الصالح».

٤ـ «الاتقان فی علوم القرآن» نوسراوی «جلال الدین عبدالرحمن‌السیوطی»

٥ـ «مناهل العرفان» نوسراوی «الشیخ محمد عبدالعظیم الزرقانی».

٦ـ «التبیان فی علوم القرآن» نوسراوی «محمد علی الصابونی»[1]

---

١ ـ زۆربەی هەرە زۆری کتێبەکانی «علوم‌الحدیث و علوم القرآن»یش یان هەر تازە نوسراون یان فەقێ و مەلای کوردستانی رۆژ هەڵات تا ئەم دواییانە لێیان بێ بەش بوون.



**وێنەی حوجرە و ماموستا و فەقێیەکانی ئاوایی سۆفیان ـ شنۆ**

**(ساڵی ١٣٨٠ک. ھ)**



فەقێیەکانی حوجرەی «ابن الحاج»ی ئالانی لە بێژوەی سەردەشت، ساڵی (١٣٦٢ك. ھ) لەوانەی بە پێوەن نەفەری چوارەم لە راستڕا بۆ چەپ نووسەری ئەم کتێبە یە

## توێی پێنجەم شێوە و ڕێزی خوێندنی پەڕاوەکان

هەر وەک خوێندنەکە بەرەسمی نەناسراوە و ڕێ و ڕەسم و شێوازێکی لەباری بۆ دیاری نەکراوە هەرواش بۆ کەسێک بیهەوێ ببێتە فەقێ؛ هیچ مەرجێک دیاری نەکراوە. تەنیا مەرجێک کە بوو مەبەستەوە بەر چاو گیراوە ئەوەیە کە فەقێ ئەگەر لە ماڵی خۆی و لە ژێر چاوەدێری کەس و کارەکانی‌را، هاموشوی لای مامۆستای بکات، دەبێ بتوانێ کەڵک لە خوێندنەکە وەر بگرێ و دەرسی پێ‌ڕەوان بکرێ، واتە تەمەنی ئەوەندە بێ کە هۆشی دەرس خوێندنی هەبێت. وە ئەگەر لە کەس و کاریشی دوور بکەوێتەوە و دایک و بابی یان کەسێکی تری نەتوانن چاوەدێری بکەن؛ سەرەرای ئەو مەرجەی باس کرا، دەبێ بتوانێ لێرە و لەوێش بحەوێتەوە و پاکی و خاوێنی خۆی پێ بکرێ و توانای ئەنجامدانی ئەو ئیشانەی هەبێ کە لە حوجرەدا پێی دەسپێردرێن.

بەڵام ئەوە کە بەرلە هەموو شتێک چ دەرسێک و چۆن بە فەقێ دەگوترێ ئەوە پێوەندی بە خودی فەقی‌یەکەوە هەیە؛ چونکو ئەگەر لە پێش فەقێ‌یەتیەکەی‌دا چوبێتە قوتابخانەی ڕەسمی و یان بە هەر شێوەیێکی دیکە شتێکی خوێند بێ و حەرف(پیت)ەکانی ناسیبن ئەوە هەر سەرسەرەکی و بێ وردکردنەوە ئەلف و بێ‌ی پێ دەگوترێ و پاشان دەستی پێ بە حینجە دەکرێ.

و ئەگەر نەچوبێتە قوتابخانە و لەبن‌را دەست بە خوێندن بکات ئەوە نێوی خوای پێ دێنن و لە پێش دا ئەو سێ دوعایەی فێردەکەن: (یاالله) تەوفیقم‌بدەی! (یافتاح) فەتحم بدەی! (یارزاق) رزقم بدەی!

دوایە شکڵ و دەنگی ئەلف و بێ‌ی زمانی عەرەبی کە بیست و نۆ پیتن پێ دەناسێندرێت و پێ‌ی دەگوترێ ئەو پیتە نوختەی هەیە یان نا؟ ئەگەر هەیەتی چەند دانە و لە کوێی پیتەکە هەڵکەوتوون.

بۆ وێنە پێی دەگوترێ ئەوە[أ] ئەلفە[1] و هیچ نـوختەی نـین. ئـەوە (ب) بـێیە و نوختەیەکی هەیە لە خوارێ. ئەوە (ت) تێیەو دوو نوختەی هەیە لە سەرێ. ئـەوە (ج) جیمە و نوختەیەکی هەیە لە نێو ماڵەکەی‌دا. وە هەر وەها چونیەتی شکڵی پیتەکانی پێ دەناسێندرێت بۆ نمونە پێ‌ی دەگوترێ: ئەوە (س) سینەوسێ چـوکڵەی هـەیە. دوایـە بزوێن (حرکة)ەکان واتە سەر و ژێر و بۆر (ـَ ـِ ـُ) و هەروەها نیشانەکانی دیکەی وەک زەنە (ـْ)، شەددە (ـّ)، مەددە (ـٓ)، هەڵکشاو (ـٰ)، داکشاو (ـٖ) و ئەوانەی بۆ دەبردرێتە سەر ئەو پیتانە و دەنگی پیتەکەی بە هەرکام لەو نیشانانەوە پێ دەناسێندرێت، وەک ئەوە کە دوای ناسینی شکڵ و دەنگی پیتەکان هەرکام لە بزوێن و نیشانەکانی بۆدەبردرێتە سەر یەکیەکی پیتەکان و دەنگەکەی تێدەگەیەندرێت، کە تەواوی پیتەکـان بـە بـێ‌نیشانە و بەنیشانەشەوە لە سەرەتای جزمی (عمّ) چاپ کراون، بۆ نموونە نوسراوە، «اَ ـ بَ ـ تَ ...» کە دەخوێندریتەوە (ئەلف سەر، ئە، بێ سەر، بە، تێ سەر،تە) واتە (ا ـ ئەلف) کە بزوێنی (ـَ)، سەری هەبێت، دەنگ «صوت»ەکەی دەبێتە «ئە» و (ب ـ بێ) ئەگەر بزوێنی سەری بیرێتە سەر دەنگەکەی دەبێتە «بە» و هەروەها (ت ـ تێ) ئەگەر بزوێنی سەری، لە سەر بێت دەنگەکەی دەبێتە «تە». یان نوسراوە «اِ بِ تِ) کە دەخوێندرێتەوە: «ئەلف ژێر، ئی، بێ ژێر،

---

١ ـ وەکی لە کتێبی لۆغەتنامەی (المنجد) دەردەکەوێ (أَلف) بەژێری هەمزەکە وزەنەی لامەکە بە مانای دۆست و دوستایەتی‌یە، بە سەری هەمزەکە وزەنەی لامەکە بە مانای ژمارەی هەزارە و بە سەری هەمزەکە و ژێری لامەکەش بە پیتی یەکەم لە ئەلف و بێتکە واتە بە هەمزە دەگوترێ. جا لە زمانی عەرەبی‌دا ئەگەر (أَلف) بە مانای سێهەمی بە کار ببرێت؛ ئەوە دەبێ بە ژێری لامەکە بخوێندرێتەوە. بۆ نمونە وەکی خوێندنەوەی (الف)لە رستەی (قال: أصله قَوَلَ قلبت الواو الفاً لتحرکها و انفتاح ما قبلها).

بەلاّم ئەگەر لە زمانی کوردی‌دا بەو مانایە بە کاربرێ پێویست ناکا بە ژێری لامەکە بخوێندرێتەوە. مەسەلەن ئەگەر بمان هەوێ لە رووی سیپارە، ئەلف‌و بێتکە بە قوتابییەک بلێین پێویست ناکا فێری بکەین بە پیتی [أ] بلێت ئەلیف. یان پێویست ناکا لە کاتی حینجەکردنی ووشەی (اعوذ)دا فێری بکەین بلێت: (ئەلیف سەرئە) بەڵکو باهەر بخوێنێتەوە ئەلف سەرئە. هەر چەند لە زمانی عەرەبیش‌دا بۆ ئەم مانایە (ئەلیف)دەخوێندرێتەوە. چونکی با بە عەرەبیش (ئەلف) بە مانای هەزار بێ و بەو پیتە (ئەلیف) بگوترێ تازە لە زمانی کوردی‌دا (ئەلف) بە مانای ئەوپیتەیە. ئەوە تا لە فەرهەنگی خاڵ و هەنبانەبۆرینەی ماموستا هەژاریش‌دا ئەو مەبەستە دەردەکەوێ. هـەنبانە دەڵێت «ئەلف: ناوی یەکەم پیتی ئەلف و بێتکەیە» خاڵ دەڵێت «ئەلف ناوەبۆپیتی یەکەم لە بـیست و حـەوت پیتەی کوردی...» لەگەل ئەوەش‌دا ئەگەر وەکو عەردبان (ئەلیف)یش بخوێنینەوە قەیدی ناکات و هەردروستە.

بی، تێ ژێر، تی»واتە (ا-ئەلف) ئەگەر بزوێنی (ـِ) ژێری هەبێت، دەنگەکەی دەبێتە «ئی» و (ب ـ بێ) ئەگەر بزوێنی (ـِ) هەبێ دەنگەکەی دەبێتە «بی» و (ت ـ تێ) ئەگەر بزوێنی ژێری لە سەر بێت دەنگەکەی دەبێتە «تی».

یان نوسراوە «اُ ـ بُ ـ تُ» کە دەخوێندرێتەوە: «ئەلف بۆر، ئو، بێ بۆر، بو، تێ بۆر،تو» واتە (ا ـ ئەلف) ئەگەر بزوێنی (ـُ) بۆری لە سەر بێت دەنگەکەی دەبێتە «ئو» و (ب ـ بێ) ئەگەر بزوێنی بۆری لە سەر بێت دەنگەکەی دەبێتە «بو» و (ت ـ تی) ئەگەر بزوێنی بۆری لە سەر بێت دەنگەکەی دەبێتە «تو».

هەروەها نوسراوە «اًباً...» کە دەخوێندریتەوە: «ئەلف دووسەر، ئەنبێ دووسەر، بەن» واتە (ا ـ ئەلف) ئەگەر دوو بزوێنی سەری لە سەر بێت دەنگەکەی دەبێتە «ئەن» و بەو شێوە دەنگی پیتەکانی دەگەڵ نیشانەکانی دیکەی وەک: (ـٍ دوژێر، ـٌ ـ دوو بۆر، (ـْ) زەنە، (ـّ)، شەددە (ـَ) مەددە، (ـٰ) هەڵکشاو، (ـٖ) داکشاو) و هەروەها دەگەڵ سێ پیتی (ا ـ و ـ ی) پێ دەناسێندرێت. بۆ نموونە پێی دەگوتری: «بٰا ـ بێ ئەلف، با» واتە: بێ ئەگەر ئەلفی بەدوادا هات دەنگەکەی دەبێتە «با» یان پێی دەگوترێ« تو ـ تێ واو، تو» واتە ئەگەر تێ واوی بە سەرەوە بوو بەهەردکیان بۆ رێکیان بە دەمی یەوە بۆ، دەنگەکەی دەبێتە«تو».

یان پێی دەگوترێ «لِي لام، یێ لی» واتە ئەگەر لام، یێی بە دودا هات و بە هەردوکیشیان ژێرێکیان بو؛ دەنگەکەی دەبێتە «لی».

## حینجە و رەوانە

وێدەچێ حینجە لە (هجاء)ی عەرەبی یەوە هاتبێ کە بە مانای کەرت کەرتکردنی ووشە و ژمێرەکردنی پیتەکانی یەتی بە سەر و ژێر و بۆرەوە. کە لە کوردیش دا مەبەست لە حینجە هەر ئەو کارەیە. واتە دوای ناسینی ئەو پیت و نیشانانە و فیربوونی دەنگەکانیان ئەمجار پیت و نیشانەکانی لەنێو ووشە و رستەدا پێشان دەدرێ و دەنگەکەی تێدەگەیەندرێ.

بۆ وێنە نوسراوە «الْحَمدُلِلّهِ رَبِّ الْعٰالَمِينَ» کە ئاوا حینجە دەکرێ: ئەلف سەرئە، لام زەنەئەل، حێ سەرحە، میمزەنەحەم، دال بۆردووئەلحەمدو، لام ژێرلیلام ئەلف، لا، هێ

ژێر، هی لیللاهی. ڕێ سەر، رە، بێ ژێر، بی، لام زەنە، بیل، رەببیل. عەین ئەلف، عا ـ لام سەر، لە، میم یێ، می، نون، سەر، نە، عالەمینە. کە بە سەریەکەوە دەبێتە «ئەلحەمدولیللاهی ڕەببیل عالەمینە».

هەروەها لە سەر ووشە و ڕستەکان بۆی دیاری دەکرێ کە فلانە پیتە، چ نیشانەیەکی لە سەرە و ئایا ئەو پیتە دەخوێندرێتەوە یان نا. بۆ وینە لە لێکدراوی «غیرالمغضوب»ی دا پێی دەگوترێ ئەوە غەینە و ئەوە نوختەیەتی و ئەوە سەریەتی. ئەوە یێیەو ئەوە نوختەکانی و ئەوە زەنەیەتی. ئەوە ڕێیە و ئەوە ژێریەتی. ئەو ئەلفە ناخوێندرێتەوە. ئەوە لامە و ئەوە زەنەیەتی، ئەوە میمە و ئەوە سەریەتی. ئەوە غەینە و ئەوە زەنەیەتی. ئەوە «ضاد»ە و ئەو واوەی بە دەمەوەیە. بەو «ضاد»ە وبەو واوە، ئەوبۆرەیان هەیە هتد.[١]

حینجە لە بەرەوە بە مەبەستی ڕەوان کردن یان فێربوونی نوێژ لە سوورەتی «الفاتحە»وە کە لە سەرەتای جزمی «عم» چاپ کراوە، دەست پێ دەکرێ پاش تەواو بوونی فاتیحە «ذکر»ەکانی نوێژ و «التحیات» و ئەوانەش دەخوێندرێن و دوایە دەچنە سوڕەتە کورتەکانی قورئان کە هاسانترن بۆ خوێندن.

پێویستە ئەوە بلێین کە جزمی «عَمَّ» بە پێی تەرتیبی قورئان سەرەتاکەی بە سوورەتی «النبأ» دەست پێ دەکا و بە سوورەتی «الناس»یش دوایی پێدێت. بەلام بۆ ئاسانی کار، هێندێک جزمەکان پاش و پێش لە چاپ دراون، واتە سەرەتایان بە سوورەتی «الناس» دەس پێدەکا و کۆتاییان بە سوورەتی «النبأ» دێت، کە ئەوەش بۆ ئاسانی فێرکردن، «التعلیم» لە رووی شەرعەوە شتێکی ڕەوایە هەرچەند بە پێچەوانەی تەرتیبی نووسینی قورئانیش هەلدەکەوێ.

حینجە خۆی لە جێی دەنگ کێشان واتە «صدا کشیدن»ی فارسی یە. بەلام لە کاتی حینجەکردندا فەقێ تەنیا دەنگی پیتەکەی بە بزوێنەوە پێ دەگوترێ و ئیتر ووشەکانی بۆ کەرت کەرت ناکرێن؛ وەک لە خوێندنی دەرسی فارسیدا ئەوکارە بۆ قوتابی دەکرێت و پێی دەلێن (بخش کردن) واتە بەش بەش کردن. بۆ نمونە ووشەی «مدرسە»ی بەو شێوە

---

١ - «هتد» کورتکراوی «هەتادوایی»یە کە بازێک لە جیاتی «هتد» «تاد» دەلێن. وەکی لە زمانی عەرەبیدا «الخ» کورتکراوەی «الی آخر»ە.

بۆ کەرتکەرت دەکەن: (مەدرەسە) کە دەبێتە سێ کەرت.

بەو شێوەی باسمان کرد حینجە درێژەی پێدەدرێ تاکوو قوتابی خۆی دەتوانی بێ مامۆستا وێژامە (عبارت)ی قورئان حینجە بکات کەزۆری و کەمی ماوەی خوێندنی حینجەش پێوەندی بە زیرەکی و نازیرەکی و هەروەها هەوڵدان و هەوڵنەدانی قوتابی‌یەوە هەیە.

پاش ئەوەی حینجە بە ئەندازەی پێویست خوێندرا نۆرەی خوێندنی بە «رەوانە» دێت. بە رەوانە خوێندن ئەوەیە کە مامۆستا وێژامەی قورئانی بەبێ حینجەکردن بۆدەخوێنیتەوە و ئەویش دووپاتی دەکاتەوە، تاوای لێ دێت، بێ هەڵەیان بە هەڵەیەکی کەمەوە قورئان بخوێنێتەوە، کە بە زۆری خوێندنی بە حینجە بە چوار پێنج سورەت و خویندنی بە رەوانەش بە چوار پێنج «جزم» کوتایی پێدێت و ئیتر قوتابی خۆی بە تەنیا دەکەوێتە سەر قورئان خوێندنەوە و دەوری لێدەکاتەوە تا بە تەواوی رەوانی دەکات و هەموی خەتم دەکات.

هەڵبەت قورئان دوای رەوانبونیشی کۆڵی هەر لێ نادرێ بەڵکو بۆ خێر و بەرەکت دەوری هەر لێ دەکرێتەوە.

فەقێ پاش خوێندنی قورئان یان ئەگەر دەخۆرابینێ وێرای خوێندنی قورئان، دەست دەکا بە خوێندنی کتێبی «ئەحمەدی» کە لوغەتنامەیەکی چکولەیە و «الشیخ معروف النودهی» بە هۆنراوە و لە عەرەبی‌یەوە بۆ کوردی نوسیویەتی.

لە فەرهەنگدا بە زۆری ئەوکتێبە دەخوێندرێ و لە بەر دەکرێت. هێندێک فەقێش لە جیاتی ئەحمەدی کتێبی «دورشتە» نوسراوی «مامۆستا مەلاعبدالکریم»ی مودەریس دەخوێنن کە لە ئەحمەدی درێژتر و بەکەڵکترە.

پاش خوێندنی قورئان و لوغەتنامە، «ئاقیدەی شێخ سەمیع» دەخوێندرێ و لە بەر دەکرێ کە بە هونراوەیەو لە زانستی «کلام» یان باشتر بڵێین «ئاقیدە»دا نوسراوە.

لەبەر ئەوەی فەقێی کوردستانی ئێران چ لە سەردەمی فەقێ‌یەتی‌دا و چ لە سەردەمی مەلایەتی‌دا بێگومان پێویستی بە زانینی زمانی فارسی و نوسین و خوێندنەوە بەو زمانە هەر دەبێ، ناچارە وێرای خوێندنی دەرسی عەرەبی؛ دەرسی فارسیش

کەمکەمە بخوێنێت. بۆیە بە ناچاری هێندێک لە کتێبەکانی پۆل «کلاس»ی یەکەم تا پێنجەمی سەرەتایی بە تایبەتی کتێبی «فارسی» دەخوێنێ و کەڵکیان لێ وەردەگرێ و بۆ ئەوەش کە لە زمانی فارسی‌دا دەستی زۆر بڕوا کتێب گەلێکی‌دیش وەک «گـلستان و بۆستان»ی شێخ سەعدی شیرازی و ئەوانە دەخوێنێت.

لەرابردوودا کە کتێبەکانی فارسی دەرسی رەسمی لە ولاٌت دانەبوون سەرەرای گوڵستان و بۆستان برێک وردە کتێبی دیش وەک «ای شده، نوسراوی شێخ مەعرووفی نودێیی؛ جرم‌بخش و اسماعیل نامە» کە نوسراوی شێخ سەعدین هەر خوێندراون.

زۆربەی فەقیەیەکان دوای تەواو کردنی خوێندن لە بەر ئەوەی فارسی و عەرەبی دوو زمانی لێک نزیکن و هەر دوو لاشیان دەخوێنن؛ لە ئەدەبیاتی فارسی‌دا لە «دیپلمە» نامێننەوە و بەڵکو تەنانەت شان لە شانی لیسانسی‌یە ئەدەبی‌یەکان دەدەن.

ئەمجار کە فەقێ ئەوانەی تەواوکردن دەست دەکا بە خوێندنی «تصریف‌الزنجانی» و دوایەش «عوامل‌الجرجانی» دەخوێنێت. شایانی باسە کە شێوەی خوێندنی «تصریف‌الزنجانی» لە ئی هەمووکتێبەکانی دی جیایە؛ چونکە ئەو کتێبە بە زۆری لە بەر را دەخوێندرێ؛ بەم‌شێوە کە لە کاتی خوێندن‌دا تەنیا مامۆستا کتێبی بە دەستەوەیە و فەقێ نە لە کاتی دەرس خوێندن‌دا و نەدوایەش لە کتێب کەڵک وەر ناگرێ و دەبێ هەر دەگەڵ دەرس خوێندنەکە رەوانی بکات کە ئەوشێوە هەرچەند شێوەیەکی چەتوون و وەختگیرە بەلاٌم زۆریش بەکەڵکە.

### ریزی خوێندنی کتێبەکان

بەکورتی ریزی کتێبە عیلمی‌یەکان لە خوێندن‌دا بە زۆری بەو شێوەی خوارەوەیە:

۱ـ تصریف الزنجانی.

۲ـ عوامل الجرجانی.

۳ـ شرح النموذج.

۴ـ الاظهاریان کتاب الصمدیه یان الهدایه.

۵ـ تصریف ملاعلی یان شرح التصریف للتفتازانی.

٦ـ الاستعارة.

٧ـ رسالة الوضع.

٨ـ شرح الجامی یان الکافیه.

٩ـ البهجة المرضیة المسماة بالسیوطی.

١٠ـ شرح النظام یان سید عبدالله صرفی.

١١ـ لە «مغنی الطلاب و ملتقطه یەکێکیان.

١٢ـ الحاشیه لملا عبدالله الیزدی.

١٣ـ شرح العقائد النسفی یان رسالةالتوحید.

١٤ـ گلنبوی آداب.

١٥ـ المقولات.

١٦ـ مختصرالمعانی یان کتاب المطول.

١٧ـ جمع الجوامع یان المستصفی للغزالی و لەم دوایییانەدا «الوجیز»ی دکتر عبدالکریم زیدان و «اصول الفقه الاسلامی» الدکتور وهبة الزحیلی.

١٨ـ تهذیب الکلام.

١٩ـ سبزواری.

٢٠ـ خلاصة الحساب و الهندسه و اشکال التأسیس.

٢١ـ تشریح الافلاک و اسطرلاب و ربعین.

پێویست بە درکاندنە کە هێندێک لەو کتێبانەی ناوم بردن بگرە بڕێک لە عیلمەکانیش وەک «ئاداب البحث» و «فلسفە» و «نجوم» و «علم‌الریاضیات» وەلانراوان و زۆر کەم دەخوێندرێن و وەک لەمەوبەریش گوتم ئەو تەرتیبەی باس کرا لە کتێبەکاندا پێویست ناکا هەر بپارێزرێ و واهەیە فەقێ پاش و پێش بە کتێبەکان دەکات و یان لە جیاتی هێندێک لەو کتێبانە کتێبێکی دی دەخوێنێت. فەقێ لە دەورو بەری کتێبی «جامی»را دەست دەکا بە خوێندنی شەرع، واش هەیە لە سەر دەمی خوێندنی «النموذج» و ئەوانەدا کتێبی «غایةالاختصار» دەخوێندرێت.

لە شەرعدا ئەو کتێبانەی بە زۆری دەخوێندرێن ئەوانەن:

**١ـ منهاج‌الطالبین یان فتح‌المعین یان هەردوکیان.**

**٢ـ هێندێک باس لە «شرح‌المنهج»را یان هەموی لە جیاتی ئەو دوو کتێبەی سەریش دەخوێندرێت.**

**٣ـ برێک مەبەستی پێویست لە «تحفةالمحتاج»را.**

**بۆ تەفسیریش لەو تەفسیرانەی ناوم بردن وەک: جلالین، البیضاوی، خازن و مدارک، المراغی، فی‌ظلال القران، فەقێ لە هەر کامیان پێی خۆش بێ یان لە یەک دوانێکیان (٥-٦) جزمیان کەمتریان لێ دەخوێنێت.**

**هەر چەند گرینگترین ئامانج لە خوێندنی فەقێ‌دا فێر بوونی «قرآن و حدیث» و مانا کەیانە و ئەو دووانە زۆر پێویستن و دەبێ بە زۆری بخوێندرێن و لەبەر بکرێن بەلاّم بەداخەوە بە زۆری لەو دوو ئەنجامە گرینگەچاو دەقوچێندرێ و فەقێ بێجگە لەوەی هەر لە قورئان و حەدیس کەم دەخوێنی، ئەوەندەی دەشی خوێنی لە بەری ناکا و کۆڵی پێوە هەڵناگرێ و وەکو پێویست ئاگای لێ نییە و دوای ئەوەی لە خوێندن بووە و هاتەدەبەرگی مەلایەتی و خزمەت کردنەوە تەنانەت سەت «حدیث» یان دوو جزمی لە قورئان بە مانا و تەفسیرەوە لە بەر نییە، کە ئەوە زۆر جێی داخە و هۆی زیانێکی زۆر گەورەیە کە دەبێ فەقێیەکان لەو بارەوە وریا ببنەوە و زیاتر گرینگی بدەنە قورئان و حەدیث.[١]**

**دەبێ بڵێین کە زانینی شەرعیش زۆر پێویستە و دەبێ زۆری گوێ بدرێت، بەلاّم نازانم بۆچی دەرسی شەرعی کراوە بە لادەرس و زۆری کار لە سەر ناکرێت!؟ من رام وایە ئەگەر فەقێ برێک (نحو و صرف) فێر بوو ئیتر بۆ فێر بوونی شەرع زۆر هان بدرێ و لەو پێوەندییەش‌دا دەرسی شەرع بکرێتە راستە دەرس وپێشنوێژان بخوێندرێت و سەرەرای لێ وەرگرتنی تاقی‌کردنەوەی بە نووسین (امتحان کتبی) وەک هەموو عیلمەکانی دی،**

---

١ - خۆشبەختانە لەم دواییانەدا لەبەر کردنی قورئان و **حەدیث** گرینگی پێ دەدرێ و کەم کەم «حافظ القرآن» پەیدا بوون و هەیە تەواوی قورئانی لەبەرە.

شایانی باسە کە فێرگە ئایینێ‌کانی حەنەفی مەزەبەکان لە «سیستان و بلوجستان» و... گرنگی زۆر دەدرێتە خوێندن و لە بەر کردنی قورئان و حەدیس و بازێک لە فەقێیەکانی کورد، بۆ و مەبەستە، بۆ ماوەیەک روو دەکەنە ئەو ناوەندانە.

تاقی کردنەوەی کردەوەیی (امتحان عملی)شی بۆ دابندرێت بە تایبەت لە بەشی عیبادات و بەشکردنی میرات و مارە برین و قەزاوەت و ئەوانەدا.



تاقمێک فەقێی سەردەشتی و سندووسی دەگەڵ چەند تازە مەلا، ساڵی (١٣٦٥)ی ک. ھ

## راستەدەرس و لادەرس

فەقێ لە رۆژێک دا دوو دەرس دەخوێنێت: یەکەم دەرس پێش نیوەرۆ دەخوێندرێت کە پێی دەگوترێ دەرسی «مستقیم» واتە راستە دەرس و دووهەم دەرس دوای نیوەرۆ کە پێی دەگوترێ «لادەرس».

بەڵام هۆی ناونانی ئەو دوو دەرسانە بەو دوو ناوانە چییە. دیارە دەرسی پێش نیوەرۆ بۆیە پێی دەگوترێ راستە دەرس چونکو دەرسی رەسمی و «اصلی»یە و شتی گران و گرینگ لەودا دەخوێندرێ و کەمتر دەفەوتێ. بەڵام دەرسی دوانیوێژێ لە بەرانبەردا غەیرە رەسمی و «فرعی»یە؛ زۆر وا هەیە دەفەوتێت بۆیە پێی دەگوترێ «لادەرس».

ووشەی «لا»ش لە لێکدراو «مرکب»ی لادەرس‌دا وێدەچێ هەر پیتێکی کوردی و پێشگر بێ وەک ئەو «لا»یەی کە لە ووشەی: «لارێ»دایە؛ هەروەکی لارێ بە شوێنێک

دەڵێن کە ڕاستەرێ نەبێ لادەرسیش بە دەرسێک دەگوترێ کە ڕاستە دەرس نەبێت.

دەرسی فارسی هەر ئەندازە بخوێندرێ و دەرسی شەرع لە هەر کوێوە دەست پێبکرێت و دەرسی حەدیس و زۆر وا هەیە دەرسی تەفسیریش هەر بەلادەرس دەخوێندرێن وهەروەها کتێبێک کە فەقێ باش لێی تێنەگەیشتبێ و بی هەوێ بێ خوێنێتەوە بە زۆری هەر بە لادەرس دەیخوێنێتەوە.

ئەگەر مامۆستا لە شەودا موتالای دەرسی فەقێی بۆ بکرێت یان پێویستی بە موتالا نەبێت بەیانی پاش نان و چایی خواردن دەرس دەڵێت و ئەگەر بە هەر هۆیەکیشەوە موتالاکەی بکەوێتە ڕۆژێ ئەوە هەرکات لە موتالا بووە دەرس دەڵێت. جا واهەیە دەرسەکان ئەوەندە زۆرن مامۆستا هەر لە بەیانیرا تا بانگی نیوەڕۆیە دەرس دەڵێتەوە.

دەرسی پاش نوێژانیش واهەیە لە دوای نوێژ و نان و چایی خواردن دەست پێ دەکرێ، واش هەیە لە دوای نوێژی ئێواری.

هێندێک مامۆستا ئەگەر ڕۆژێک سەفەر، یان کارێکیان هەبێ بۆ پێشگیری لە چوونی دەرس دوای نوێژی بەیانی و بەر لە نان و چایی خواردن دەست دەکەن بە دەرس گوتن و وادەکەن لانی کەم دەرسی پێشنوێژێ بگوترێ و یان ئەگەر دەرسەکان کەم بن دەرسی پاش نوێژیش هەر بڵێن جا بڕۆن بە دوای سەفەریان کارەکەیاندا.

## گرانی دەرسەکان

فەقێ سەرەڕای ئەوەی کە بە ژیانی کوڵە مەرگی دەژێت و چاودەبڕێتە ژیانی چاولەدەستی و دەست بۆ ئەم و ئەو ڕادەگرێ و لە لایەکەوە تەنگی حوجرەرای دەکوشی و تاریکایی بێ چرایی هەڕەشەی لێ دەکا و لە لایەکی ترەوە دەکەوێتە بەر هێرشی سەرمای زستان و بێبەشی لە سپەری بەرگ و پۆشاک و سوتەمەنی بەڵام بەهێزی بیر و باوەڕ بە ڕێبازەکەی خۆ ڕادەگرێ و گرێ و گۆڵی سەر ڕێگای دەپەڕێنێ. هەروەها سەرەڕای سەتان کەند و کلۆی دیکەی سەر ڕێگای، گرانی و حەستەمی دەرسەکەشی لێ دەبێتە سەرباری دەردان و نان و ئاوی پێ تاڵ دەکا و سەری لێ دەشێوێنێ بەتایبەت لە دەورانی سوختەیەتی دا و لەوکاتەداکە دەست دەکا بە خوێندنی «نحو و صرف» کە لە پڕێکا دەبێ لە

گژ زمانێکی بێگانە رابچێ و بچێتە بنج و بناوانیەوە، لێکی بداتەوە و شەن و کەوی بکات و لە بێژینگی بدات.(١)

بۆ ئەوە بیسەلمێنین کە دەرسی قەفێ بەتایبەت لەو سەردەمەدا چەند چەتون و شانگیرە دەرسێکی هەوەڵی «تصریف الزنجانی» کە بە زۆری یەکەم کتێبە لە عیلمەکان دەخوێندرێ، لێرەدا دەنوسین و پاشان دەرسی یەکەمی کتێبی «عوامل الجرجانی»ش کە دوا «تصریف الزنجانی» یەکەم کتێبە لە عیلمی «نحو»دا دەخوێندرێ بەوشێوەیە کە بە فەقێ دەگوترێ باس دەکەین.

دیارە وەک لەمەوە بەرباسمان کرد ماموٚستا و سوختە ئەوشتانە کە بە پێی یاسای دەرس خوێندن و دەرس گوتن هەرکام لەوان دەبێ وەبەرچاوی بگرن وەکی ناوی خوابردن و سوپاسی خوا کردن و ئەوانە جێ بەجێ دەکەن پاشان بەمشێوە دەرسەکە دەست پێ دەکەن:

دەقی کتێبەکە پاش نوسینی «بسم‌اللہ‌الرحمن‌الرحیم» ئاوا دەست پێ دەکات: «اعلم ان التصریف فی اللغة التغییر و فی الصناعة تحویل الاصل الواحد الی امثلة مختلفة لمعان مقصودة لاتحصل الابها» کە ئەم وێژامەیە بەمشێوە بە فەقێ دەگوترێ و دەبێ بە بێ چاو لە کتێب کردن رەوانی بکات: دانەری کتێب دەڵێ: (اعلم) بزانە ئەی ئەو کەسەی دەتهەوێ فێری عیلمی «صرف» ببی (ان التصریف) کە بەڕاستی وشەی «تصریف» کە پێک هاتووە لە: پیتەکانی؛ (ت) و (ص) و (ر) و (ی) و (ف) (فی اللغة) لە زمانی عەرەبی دا؛ (التغییر) بە مانای گۆڕینە. گۆڕینیش واتە (احداث شیء لم‌یکن قبله) پەیداکردنی شتێک کە لە پێش دا نەبووبێ؛ (کنزول الثلج علی الجبل و الکتابة علی القرطاس) وەکوو بارینی بەفر بەسەر کێودا و نوسین لە سەر قاقەز کە ئەوانە لە پێش دا نەبوون و دوایە پەیداکراون. (و فی الصناعة) و «تصریف» لە زاراوەی زانایانی عیلمی «صرف»دا (تحویل الاصل الواحد) بە وەرگێڕانی «اصل واحد» دەڵێن کە «مصدر»ە (الی امثلة مختلفة) بۆ لای چەند میسالێکی جوێ جوێ لەباری حەرەکە و سکون و حروفی زائدەوە نەک لەباری حروفی اصلی وە (لمعان

---

١ ـ شەن و کەوکردن: خاوێن کردنەوەی دەخڵ، برێتی لە لێکۆڵینەوە. (هەنبانە)

مقصودة) لەبەر چەند مەعنایێکی مەبەست و مەقسوود (لاتحصل الابها) کە پەیدانابن مەگەر بەو میسالانە.

جا لێرەدا مامۆستا بۆوەی دە فەقێ بگەیەنی کە چون «اصل واحد» یان «مصدر» وەردەگێردرێ بۆ لای ئەو میسالە لێک جیایانە شەش حەوت وێنەی بەمشێوە بۆ دێنێتەوە: وێنەیەکت بۆ دێنمەوە لەو میسالە جیاجیایانە کە «فعل ماضی»یە وەک «ضرب» و «الضرب» «مصدر»یەتی تا «تحویل»ی «الضرب» نەدەی بە «ضرب» بۆت پەیدانابێ مەعنایەک لە «معانی مقصودە» کە لێدانە لە زەمانی رابردوودا.

وێنەیەکی دیت بۆ دێنمەوە لە «امثلة مختلفه» کە «فعل مضارع»ە وەک «يَضْرِبُ» و «الضرب» «مصدر»یەتی تا «تحویل»ی «الضرب» نەدەی بۆ لای «يَضْرِبُ» بۆ تۆ پەیدا نابێت مەعنایەک لە «معانی مقصودە» کە لێدانە لە زەمانی داهاتوودا.

وە هەروەها تا چوار پێنج نمونەی دیشی بۆ باسدەکات، جا ئەوجار مەعنای ئەو دوو خەتە تەواودەبێت.

هەڵبەت دەبێ لە سەر (تحويل الاصل الواحد) ئەم شێعرەش لەبەربکات:

اصـــل واحـد مـصدر است ای ذاالکـمال المـــــصدر مــــايصدر مــــنه الفــعال

وەکوو گوترا فەقێ لە کاتی خوێندنی دەرسەکە هیچ کتێبێکی پێنییە و هەر دەبێ بە گوێگرتن لە مامۆستای فێریبێ و لە سەر دەرسی داهاتوو، بێ کەم و زیاد بۆیبڵێتەوە و ئەگەر کتێبیشی پێبێ تەنیا «التصريف»ی پێیە و ڕێگای پێنادرێ بۆ ڕەوانکردن و دەور کردنەوەش لە «شرح» و شتیوا کەڵک وەربگرێت و دەبێ ئەو شتە زیادیانە لەبەررا ڕەوانبکات.

ئەوەندە هەیە ئەو شێوە لەبەررا خوێندنە تەنیا بۆ «تصريف الزنجاني» و یەک دوو کتێبی دی وەکی «لغتنامە احمدی» و «ئاقیدەی شێخ سمیع» و ئەوانەیە، کتێبەکانی دی ئەگەرچی لەبەرکردنیشیان بوێ لە کاتی خوێندندا لە بەردەستدان و بۆ لەبەرکردنیش چاویان لێدەکرێت.

یەکەم دەرسی «عوامل»یش بەمشێوە دەستپێدەکات:

(بسم‌الله‌الرحمن‌الرحيم و به نستعين)

«بسم‌الله» واتە ئێمە دەست‌دەکەین بە خوێندنی ئەم کتێبە بە یارمەتی ناوی خوا (الرحمن) کە سیفەتێکی ئەو خودایەش ئەوەیە رەحم و بەزەیی هەیە بۆ هەموو گیان‌لەبەرێکی دنیایە (الرحیم) واتە سیفەتێکی دیکەشی ئەوەیە بەخشندە و میهرەبانە و رەحمی هەیە بەتایبەتی بۆ مسوڵمانان لە رۆژی قیامەت‌دا (وبه نستعین) یانی هەر لە خوا داوای یارمەتی دەکەین.

بەڵێ مامۆستا بەوشێوە مانای ئەو دورستانەی بۆ لێک‌دەداتەوە و ئەمجار نۆبە دەگاتە «ترکیب» واتە لێک‌دانەوەی رستەکان لەباری «صرف»ی‌یەوە کە داخوا لە چ وشەگەلێک تێکەڵ کراون و هەروەها لەباری «نحو»ی‌یەوەکە داخوا وشەکان چ حاڵەتێکیان هەیە و چ نیشانێکیان لە سەرە و ئەو حاڵەتە و نیشانا نەچون پەیدابوون کە بە زاراوەی عەرەبی بەم لێکدانەوەی دوایی دەڵێن «اعراب». کە «ترکیب»ی ئەو دورستانەش بەم‌شێوە بە فەقێ دەگوترێ: (بسم‌الله) «ب» حەرفی جەررە «اسم»ی دە «لفظ»دا پێ «مجرور»ە. «جارّ و مجرور» «تعلق» دەبەستن بە «نبتدأ» وی «مقدره»ی «مؤخره» و «محلا منصوب مفعول‌به غیرصریح»ە بۆ «نبتدأ» وی «مقدره»ی «مؤخره»، «اسم مضاف»ە بۆ لای «الله، الله لفظا مجرور مضاف‌الیه»ی یەتی «الرحمن» سیفەتی هەوەڵە بۆ «الله» و «الرحیم» سیفەتێکی دیەتی. «وبه‌نستعین» «و» واوی «ابتدائی»یە «نستعین» «فعل»ی «مضارع»ە بۆ «متلکم»ی «مع‌الغیر»ە «فاعل»ەکەی «نحن»ویە و تێیدا «مستتره»ە.

دوای ئەوەی لە «ترکیب»ەکەی بوونەوە نۆبەی پرسیار و وەڵامان دێت و ئەوانیشی بەم‌شێوە فێردەکات:

کەسێک پرسیاردەکات: بۆچی دەڵێی «جار و مجرور» «تعلق» دەبەستن بە «نبتدأ»ی «مقدره»ی «مؤخره» واتە «فعل نبتدأ» بۆچی «مقدره» و نەنوسراوە و لەبەرچیش «مؤخر»ە و لە پاش «جار و مجرور»ەکان «مقدر» دەکرێ؟

لە وەڵام‌دا دەڵێن ئەوە لەبەر چەند هۆیەکە: یەکەم لەبەرئەوەی کە پێش خستنی «جار و مجرور» لە سەر «متعلق»ەکەیان «حصر» دەگەیەنی واتە ئەوە دەگەیەنێ کە داوای یارمەتی تەنیا لە خوای دەکرێت. دووهەم لەبەر رێزدانانە بۆناوی خوا.

سێهەم لەبەرئەوە رەددانەوە بێ لە قسەی بت‌پەرستەکان کە دەیانگوت «نبتدأ

بسم‌اللات و العزی»یانی دەست‌دەکەین بەو ئیشە بە یارمەتی ناوی «لات و عزی»کە ناوی دوو بتی گەورەن وەک دیارە «فعل»ی «نبتدأ» لە قسەی واندانە «مقدر»ە و نە «مؤخر»یشە؛ بەڵکوو لە پێش جار و مجرورەکاندایە و «تلفظ»یشی پێ‌کراوە و لە کاتی نـوسینیش‌دا نوسراوە.

هەروەها ئەو دەرسە چەند پرسیاری دیکەشی لەسەرە وەک:

۱- بوەچی «ب» لە «بسم‌الله»دا بە درێژی نوسراوە؟

۲- بۆچی نوسراوە «بسم‌الله» و نەنوسراوە «بالله»؟

۳- بۆچی وشەی «الله» لە پێش «الرحمن»دایە؟

۴- بۆچی «الرحمن» لە پێش «الرحیم»دایە؟

۵- بۆچی «بە» لە پێش «نستعین»دایە؟

وە چەندی دیش لەم‌جۆرە پرسیارانە بەڵام بۆ خۆپاراستن لە پێکهێنانی سەرئێشی لە هێنانی وان و وەڵامەکان خۆدەپارێزین.



کۆمێک فەقێی ناوچەی سەقز (۱۳۴۹)ک. ه .

## ڕاستی‌یەکی حاشا هەڵنەگر

پێ لەو ڕاستی‌یەش بنێین باشە کە گرانی دەرسی «عوامل» بەشێکی زۆری تاوانی موستەعیدەکانە چونکی بەرلەوەی فـەقێ بـاسی وشـە و زاراوەگـەلێکی وەک: جـار و مجرور، تعلق، مقدر و مۆخر، مضاف و مضاف‌الیه، صفت و موصوف، فاعل و ئەوانە تێبگا و هەرکامیان لە جێ‌ی خۆی‌دا بخوێنی هەق‌نییە باسی ئەوانەی بۆ بکرێ و داوای لێبکرێ ڕەوانیان بکات.

کەسێک تێکەڵاوی دەگەڵ ئەو عیلمانە ببێ دەزانێت کە باسی «جار و مجرور»ان لە «نوع» هەوەڵی «عوامل»دا دەخوێندرێ، باسی «مضاف و مضاف‌الیه» لە ئاخیری «عوامل» دەگەڵ «عوامل قیاسی» دێتە پێشی، باسی «صفت و موصوف» ان لە «توابع النموذج»دا فێردەبین و ئەوانی‌تریش هەرکام لە جێگای تایبەتی خۆی‌دا باسیان لێوە دەکرێت.

جا هەق‌وایە لە خوێندنی «عوامل»دا فەقێ «مقدمه»کەی هەر بۆ مانا بکرێ و ئیتر «ترکیب»ەکەی پێ‌نەگوترێ و پاش «مقدمه»کەش چ «عامل»ێکی خوێند لە میسال‌دا هەر باسی ئەو عامیلە و شوێنەواری وی پێبگوترێ. بۆ نمونە لە «ترکیب»ی یەکەم میسالی «نوع اول»دا کە «مررت بزیدٍ»ە هەر ئەوەندەی پێبگوترێ کە «ب» حەرفی جەڕرە و ئەوەتا «زید»ی مەجرور کردوە واتە ژێری بۆ پەیداکردووە و هەروەها لە تەرکیبی «دخلت علیه بثیاب السّفرِ»دا کە میسالی چوارەمی ئەو نەوعەیە نابێ هەموو ڕستەکەی بۆ ترکیب بکرێ چونکە با باسی «فعل»یشی لە «صرف»دا خوێندبێ خۆ ئێستا باسی «علی»ی نەخوێندوە کە حەرفی جەڕرە، یان خۆ ئێستا باسی «مضاف و مضاف‌الیه»یانی بە گوێ نـەگـەیوە. کەوابوو دەبێ تەنیا «بثیاب»ی بۆ شی‌بکرێتەوە.

دەی‌کوا ڕەوای هەقە سوختەی بەستەزمان بەرلەوەی باسی هیچ «عامل و معمول و عمل»ێکی خوێندبێ پێشەکی عەوامیلی لە «بسم‌الله»دا بۆ تەرکیب بکرێ و بەو هەموو جڕ و جانەوەرانە بتۆقێنرێ.

تەرکیب پێ‌گوتنی بەر لە پێ‌ناساندنی (عامیل و مەعمول و عەمەل) لەو قەبیلەیەکە بێنی بۆ پێناساندنی پیتی «م» بە قوتابیەک کە تـەنیا (ب) و (د) و (ا) و (ر)ی نـاسیوە

لەجیاتی وشەی «مار و بارام» میسالی بە وشەی «میوان و کەمتیار و همبانە و ئاکام» بۆ بیّنیەوە کە شەش حەوت پیتی نەناسراوی بۆ وی، تیّدان.

هەروەکی باسمکرد مەبەستم لە نوسینی ئەو دوو دەرسە و ئەو پرسیارانە ئەوەبوو کە بە خویّنەرە بەڕیّزەکان نیشانبدەم، چەتوونی دەرسی فەقیّ بەتایبەتی دەرسی سوختە تاچ رادەیەکە و چەندی کویّرەوەری دەویّ.

بەلاّم ئەی خویّنەری ئازیز و خۆشەویست پیّتوانەبیّ فەقیّ لەبەر گیروگرفتی زۆر و چەرمەسەرەی ژیان و دەرسی گران هەلّدیّت و دەبەزیّت و سەنگەری حوجرە ویّلّ دەکا و ریّگا بۆ دوشمن چۆلّ، نا، بەلّکە بگرە دوای چەند کەڕەت گوتنەوە، دەرسەکەی رەوان دەکات و پاش لەبەرکردنی دەرسەکە، نەبەزی و راوەستاوی خۆی لە بەرانبەر گیروگرفتەکان و هەروەها پیّخۆش بوون و ئارەزووی لەسەر خویّندن بەو هەلّبەستە دەردەبڕیّ و دەلّیّ:

«عیلمی نەحو دەخویّنم عەوامیلی جورجانی
لە نەوعی یەک بومەوە گەیشتمە نەوعی ثانی
سی و دوو مەلام پیّکرد هیچیان چاکیان نەزانی[1]
دەچمە کن حاجی حەدەی لە قسان چاکی دەزانی
ئیقعەنسەسەی پیّدەکەم وەک روستەمی داستانی»

## دیسان دەردی دلّ و پیّشنیار

لە لاپەڕەکانی پیّشوودا باسی نەبوونی تاقی کاری و کەترەخەمی مامۆستا و فەقیّ و ئەرکی سەرشانیان لە پیّناو چارەسەرکردنی ئەو دەردانەدا، کرا و دەشلّیّن دوو پات کردنەوە ناحەزە؛ بەلاّم لەبەرئەوەی دەردەکە گرانە و چارەشی ئەگەر چارەرەشی نەبیّ

---

١ - بازیّک ئەو هەلّبەستە بەم شیّوە دەگیّرنەوە:

عیلمی نەحو دەخویّنم عەوامیلی جورجانی — نەوعی ئەوەلّ تەواو بوو گەیشتمە نەوعی سانی
پرسی سیودوو مەلام کرد «ردف»یان نەزانی — دەچمە لا حاجی حەدەی دەلّیّن چاکی دەزانی
(اقعنسس)ی پیّدەکەم وەک تەسریفی زەنجانی — لە خوای دەکەم تەلّەبی ببمە رۆستەمی سانی

هاسانە و بە قازانجی هەموانە؛ ئەو باسە دێنمەوە گوڕێ و بە واتایەکی تر دەڵێم: بەداخەوە دڵسۆز نەبوونی مامۆستاش واهەیە دەبێتە هۆیەکی دیکە لە هۆیەکانی بەدبەختی و رۆژەڕەشی و دواکەوتوویی فەقێ و وادەبێ مامۆستا چ موستەعید و چ مامۆستای گەورە دڵسۆزی دەگەڵ شاگردەکەی ناکا و تەنیا بۆ ناو و شۆرەت فەقێ رادەگرێ. واهەیە بێ ئەوەی کارێکی گرینگی هەبێ دەرس‌دەچوێنی یان ئەگەر دەرسیش بڵێت وای‌ناڵێت کەڵکی لێ‌وەربگیرێت. جارێک نییە پرسیار بکا و بڵێ: ئەرێ برای فەقێ چت خوێندووە، چ دەزانی؟ لە کام عیلمەدا لە پاشی؟ فلانە مەبەستە چۆن شی‌دەکەیەوە؟!!!

دەگەڵ ئەوەی‌دا کە ئەو لێ‌پرسینەوە و هەڵسەنگاندنەی مامۆستا زۆر پێویست و گرینگە و کەمتەرخەمی مامۆستا لەوبارەدا دەبێتە هۆی زیانێکی زۆر و لەوانەیە ئەگەر پرسیاری لێ‌نەکرێ و بە بێ تاقی‌کردنەوە بچێتە پێش، هیچیش فێرنەبێ و نەش‌زانی کە هیچ فێرنەبووە و تا دڕەنگ لە خەوی نەزانی وە خەبەر نییەت و دڕەنگە و دواش تازە لە دەستی دەردەچێ، جا یان دەبێ دەست لە خوێندن هەڵبگرێت و یان ئەگەر درێژەشی پێ‌بدات هیچ هەر فێرنابێت و ئاکامی هەردوک لا ئەوەیە وەک پەیکەرێکی بێ‌گیان دەبێ وە سەر دایک و باب و کەس و کارەکانی بکرێتەوە و هەموو هیوا و ئاواتیان لێ بە ئاودا بچێت و ئاو و نانیان پێ تاڵ بکرێت. چونکی بەداخەوە لە بەرلە رەسمییەت خرانی ئەو خوێندنە فەقێیەکان بەرنامەی رێک‌وپێکی خوێندنیان نییە و هەرواش لە تاقی‌کردنەوە «امتحان»ی رەسمی و گشتی بێ‌بەشن و ئەگەر مامۆستا دڵسۆزانە ئاوڕێک، نەداتەوە سەر فەقێیەکەی و ئاورێکی لێ‌نەکوژێنێتەوە و جارجار نەی‌بوژێنێتەوە و پرسیاری لێ‌نەکات و لە دەرسەکانی‌دا بە تاقی‌نەکاتەوە؛ مەگەر فەقێیەک کە زۆر لێهاتوو هەڵکەوتووبێت دەنا بەتایبەت سوختە هەر گوێ بە خوێندن نادات و یان ئەگەر گوێش بداتێ؛ بۆ خۆی لە رادەی زانین و نەزانینی خۆی ناگات و پێی وایە زۆری دەزانیت. لە حاڵێکیش‌دا کە هاڕەی لە بڕێ ناکاتەوە.(١)

---

١ - هاڕەی لە بڕێ ناکاتەوە: لە بنەڕەت‌دا ئاوا بووە «هرّە»ی لە «برە»ی ناکاتەوە، کە «هرە» لە زمانی عەرەبی‌دا بە مانای پشیلەیە و «برە»ش لە زمانی فارسی‌دا بە مانای بەرخە، واتە کابرا ئەوەندە نەزانە پشیلە و بەرخ لێک [illegible]

بەڵام ئەگەر مامۆستا جار دەگەڵ جار فەقێیەکەی بە تاقی بکاتەوە و پرسیاری لیّبکا؛ ئەگەر فەقیّ بە کەڵکی خویّندن بیّت با نەزانیش بیّ مادام نەزانینەکەی بە هۆی تەمبەڵی و تیّنەکۆشانی‌یەوە بیّت ئەوە وریا دەبیّتەوە و پتر تیّدەکۆشی و هەوڵدەدا و شتیّکی لیّ‌پەیدا هەر دەبیّت. ئەگەریش تیّی‌گەیی و بۆی‌دەرکەوت کە لە پاشیەکەی بە هۆی تەمبەڵی‌یەوە نییە و هەر لە بن‌را نازیرەک و بیّ‌زەینە و توانای خویّندنی نییە ئەوە باش وایە لیّی حاڵی بکات کە بە کەڵکی خویّندن نایەت و بچیّ خەریکی ئیشیّکی دیکە بیّ باشترە، لەبەرئەوەی ئەو فەقێیەی کە لیّ‌وەشاوەیی خویّندنی نییە لەوانەیە لە زۆر کار و پیشەی دیکەدا پلە و پایەییّکی بەرز بەدەست بیّنیّت و هەم خۆی و دایک و بابی بەخیّو بکات و هەم راژەیەک بە کۆمەڵ بکات و ئیتر بە خۆرایی و بیّ‌هوودە تەمەنی بە فیرۆ نەدات و وەختی مامۆستا نەگریّت و لە کار و ئیشیش نەبیّت و تووشی دوارۆژیّکی تاریک و رەش نیّیەت. (وەک پیّشتریش ئاماژەمان بەوە کرد)

گویّ پیّ‌نەدانی هیّندیّک مامۆستا لە لایەک و لە لایەکی دیشەوە بریّک مامۆستا هەن کە بەداخەوە دەگەڵ ئەوەش‌دا شیاوی مامۆستایەتی و توانای فەقیّ‌راگرتن و دەرس‌گوتنەوەیان نییە خۆیان دەکەنە مامۆستای‌دەرس‌بیّژ و دەبنە هۆی دواخستن و بەدبەخت‌کردنی فەقیّ.

یان وا هەیە توانای گوتنەوەی کتیّبەکانی خواریّ‌ی هەیە و دەتوانی بە تیّکۆشانی زۆر و وردەوردە، پیّش هەڵلا بڕوات بەڵام بە بیّ وەبەرچاوگرتنی هەوڵ و تیّکۆشان و پیّهەڵلاچوونی وردەوردە یەکسەر لە گژ کتیّبیّکی گران و رەق رادەچیّ و دووبارە هۆی بەدبەختی و نەهاتی فەقیّ پیّک‌دیّنیّ.

فەقیّش بەتایبەت کە تازە دەستی بە خویّندن کردبیّت وانییە کە بە زوویی لە نەزانی و لیّ‌نەهاتوویی مامۆستاکەی حاڵی‌بیّت و خۆی لە بەردەستان نەجات‌بدات و پیّ‌ی وایە مامۆستا هەردەبیّ ئاوابیّت و ئەگەر بەوشیّوە دریّژە بە خویّندن بدات چی پیّ‌ناچیّ کە دەبیّتە زانایەکی مووقەڵەشیّن!!!

## چەند کۆسپی دیکەش

جگە لەو گیروگرفتانەی بە بڵاوی باسمانکردن وەک بەسترانەوەی ژیانی فەقێ بە خەڵکەوە، چ لەباری خواردەمەنی و چ لەباری جێگا و ڕێگاوە، لە ڕەسمی یەت خرانی ئەو خوێندنە، ماڵە و ماڵ گەڕانی فەقێ، چەتوونی و گرانی دەرسەکەی و ئەوانە، چەند کەند و کوسپ و ناحەزی و نالەباری دیش وەبەرچاو دەکەون کە بوونەتە هۆی دواکەوتوویی و باش پێنەگەیشتن و زوو تێنەگەیشتنی فەقێ:

**١ ـ چۆنیەتی لە چاپدرانی کتێبەکان و ناوەڕۆکیان.**

(أ) خراپی کتێبەکان لەباری چاپەوە.

زۆربەی هەرەزۆری ئەو کتێبانەی کە لە بەردەستی برایانی فەقێدا هەن و بۆ تێرا خوێندن یان بۆ موتاڵا کەڵکیان لێوەردەگیرێت، یان هەر دەستنوسن و هێشتا رووی چاپیان بە خووە نەدیوە یان ئەگەریش چاپکرابن بە شێوەی کۆن و قەدیمی چاپکراون و ئیتر لە نێویاندا لەو نیشانانەی کە لە سەبکی تازەی نووسین و چاپکردندا وەبەرچاو دەگیرێن و خۆیان نیوە مامۆستایەک و ڕێنوێنێکی شارەزان بۆ خوێنەر، وەک نیشانەی پرسیار (؟) نقتەبانگ[١] و سەرسوڕمان (!) وکۆتایی رستە (.) و بەکورتی لە نیشانەکانی نوختەدانان، هەواڵێک نییە. لەبەر ئەوە فەقێ لە کاتی دەرس‌خوێندندا سەرەڕای وەرگرتن و ڕاگرتنی مەبەست دەبێ لە پێناوی لێکدانەوەی وێژامەی کتێبەکەدا، داخوا فلانە مەبەست سەرەتای لە کوێیە وکۆتایی لە کوێ دێت. یان داخوا ئەو رستە هەواڵە، پرسیارە، یان شتێکی ترە و... ناچارە هەوڵی زۆر بدا و بە بار تەقای مەبەستە سەرەکیە کە بەو کارەوە خۆ ماندوو بکا.

---

١ ـ نقتەبانگ: [illegible]



**وێنەیەک لە بەشدارانی کۆڕی ئیجازە لەگوندی «زمزیران»ی سەردەشت**
**ڕێکەوتی: ۱۳۷۹/۱/۲۹ک. ھ**

تەنیا نیشانەیەک کە لە کتێبەکاندا وەبەرچاو دەکەوێ نیشانەی دوو کەوانە یان خەتی درێژەکە بەسەر مەتندا دەکێشرێ کە ئەو دوو نیشانەش بۆ لێک هەڵاواردنی مەتن و شەرحن.[1] جا بۆیە بابای فەقێ یەکێک لە کارە وەختگیرەکانی ئەوەیە دەبێ بە بێ کەڵک وەرگرتن لەو نیشانە ڕێنوێنی کەرانە خۆی لە مەبەستی کتێبەکە بگات و لێکی بداتەوە و تێکی کاتەوە.

---

۱ - هەڵبەت لەو دوایییانەدا هێندێک لە کتێبەکان لە چاپدراونەوە و برێکیش لەوانەی تا ئێستا چاپنەکرابوون چاپکراون کە لەو لە چاپدانەدا لە سەبکی نوێ کەڵک وەرگیراوە و برێک لە گرفتەکان چارەسەر کراون.

## کتێب خۆشکردن

جا لێرەدایە مەسەلەی کتێب خۆشکردن دێتە گۆڕێ. ئـەویش ئـەوەیە کـە فـەقێ کتێبەکەی چاپکراو بێ یان دەستنووس، دوای ئەوەی بە هـەوڵی خـۆی و فـێرکردنی مامۆستا لە کتێبەکەی حاڵیبوو بە پێی بەرەو پێش چوونی دەرسـەکـانی، خـۆی ئـەو نیشانانەی بۆ دادەنێ تا ئەگەر ویستی جارێکیدی بە مەبەستی لێوە فێربوون یان دەرس تێراگوتنەوە چاوی لێبکات ئەو سەختی و شانگیریەی نەمێنێ و بە ئاسانی بتوانێ کەڵکی لێوەربگرێت.

هەڵبەت کتێب خۆشکردن تەنیا بریتی نییە لە دانانی ئەو نیشانانە کە لە یـاسای تازەی لەچاپداندا وەبەرچاو دەگیرین؛ بەڵکوو چەند نیشانەی دیش هەن وەک:

١ـ دیاریکردنی «مبتدا و خبر» لە رستەیەکی درێژی واداکە «مبتدا و خبر»ەکەی بە هاسانی دەرنەکەون. بۆ ئەو مەبەستە لە سەر «مبتدا» نـیشانەی «مب» و لە سـەر «خـبر» نیشانەی «خب» دادەنێن.

٢ـ لەسەر واوێک کە واوی «حاڵیە» بێت وشەی «حال» بە خەتێکی ورد دەنوسن.

٣ـ هەوەڵی رستە بە نیشانەی «ســ» دیاریدەکەن.

۴ـ بە یەکێک لەو نیشانانە «ع، عط، عطف» ووشە و رستەکان دەبەنەوە سەر یەکتری (عطف کردنەوە).

۵ـ کاتێک دوو وشە یان دو رستە لەوەختی لە چاپدان یان نوسیندا پاش و پێش کرابن لە سەر دواکەوتووە کە نیشانەی «م» واتە «مقدم» و لە سـەر پێش کـەوتووەکـەش نیشانەی «خ» واتە «مؤخر» دادەنێن.

۶ـ لە سەرەتای مەبەستێک کە وەڵامی پرسیارێکی فەرزی بێ یان رستەکە داگری وەڵام و پرسیار بێ، نیشانەی «س ج» واتە «سؤال و جواب» دادەنێن.

٧ـ دوو وشەی «إنْ و لَوْ» واهەیە بۆ مەرجن و واش هەیە بۆ ئەو پەڕ (غایة)ن، جا هەرکاتێک بۆ غایەت بن نیشانەی دوو وێرگول «،،»ی لە بن دەنووسن.

٨ـ هەروەها لە بن هەر ئاوەڵناو «ضمیر»ێکی ئاشکرا یان شێردراوە کە جێی بـۆ

گەڕانەوەکە «مرجع»ی بە هاسانی نەدۆزرێتەوە نیشانەیەکی بە دڵخواز لە بن خۆی و «مرجع»ەکەی دەنووسن.

٩ـ یەکی دی لە کارەکانی پێوەندی دار بە کتێب خۆشکردنەوە ئەوەیە کە لە وانەیە کتێبەکە لە کاتی نوسینەوە یان لە چاپدانی‌دا، وشەیەک، ڕستەیەک، پیتێک یان نوختەیەک یان شتێکی دیکەی زیاد بێ کە لێی کەم دەکرێتەوە، کەم کردنەوەش یان بە بەسەر داهێنانی خەتێکە یان بە کڕاندن و پاک کردنەوەیەتی بە وەسیلەی ترنجوێک[1] یان شیشۆقەیەک.

یان ئەوەتا یەکێک لەو شتانەی کەم دەبێ، کە پێویستە بۆی بنوسێ؛ جا ئەگەر لەو جێیەی لێی کەوتووە جێگای بۆوە ئەوە چاکە دەنا لە جێیەکی تری ئەو لاپەڕەدا دەینوسێتەوە و نیشانێکیشی بۆ دادەنێت و لە ئاخیریش‌دا لی‌ێ دەنوسێ «صح» کە کورت کراوەی «تصحیح یان صُحِّحَ یان صحیح»ە و نیشانەی ئەوەیە ئەو شتە دەرچووە و دروست و ڕاستکراوەی ئەو وێژامە ئاوایە.

١٠ـ ئیشێکی دی ئەوەیە کە پەراوێزێک یان مەبەستێکی کە پێوەندی بە ناوەرۆکی کتێبەکەوە بێت دەیهێنێت و لە سەر کتێبەکەی خۆی دەی نوسێتەوە بە مەبەستی هاسان کردنی شوێنێکی گران یان بە مەبەستی کەڵکی زیاتر. ئەو پەراوێزەش بە زۆری لە نوسراوە و کتێبی دیکەرا بە نێوی خاوەنەکەیەوە دەهێنرێ. واش هەیە هەرشی‌کردنەوە و لێدوانی مامۆستایە، کە فەقێ بە شێوەی حاشیەیەک دەری دێنێ و بە نێوی «تقریرات استاد» فلانکەس لە سەر کتێبەکەی دەنووسێ.

و ئەگەر فەقێ بۆ خۆشی توانای ببێ لێکدانەوەوشی کردنەوەی خۆی بە زمانی عەرەبی یان زمانێکی دی بە شێوەی حاشیە دەردێنێ و لە سەر کتێبەکەی دەنوسێ لە ئاخیریش‌دا لە بنی دەنوسێ «لکاتبە» واتە ئەو حاشیە هی نووسەر، خۆیەتی.

ئەو جار بۆوە بزانرێ کە ئەو حاشیە پێوەندی بە کوێی کتێبەکەوە هەیە نیشانێکی بە دڵخوازی بۆدادەنێن کە نیشان بدات ئەو حاشیە بە کوێی کتێبەکەوە پێوەندی هەیە.

---

١ - ترنجو: تیخی تیژ. (هەنبانەبۆرینە)

شایانی باسە کە لە کتێب خۆشکردندا بۆ دانانی نیشانەکان لە قەڵەم یان مەرەکەبێک کەڵک وەردەگیرێت کە لە رەنگی چاپی کتێبەکە جیا بێت و بە زۆری رەنگی سوور بەکار دەبرێت.

جێگای لێ نووسینی ئەو حاشیە و پەراویزانەش قەراغ و قوڵاغ و چـوار دەوری لاپەرەکانی کتێبەکەیە کە «بیاض»ی پێ دەڵین. و هەر بە مەبەستی لێ نوسینەوەی حاشیەو شتی زیادی، لە کاتی لە چاپدان یان نوسینەوەدا لە چواردە دەوری لاپەرەکان جـێ ی زیادی دێڵنەوە.(١)

## (مسطر) خەتکێش

لە زوو دا چونکە قاقەزی خەتدار کەم بووە لە کاتی نوسیندا بە مەبەستی راست دەرهاتنی خەتەکان و لێک جیابوونەوەی جێگای حاشیەکان و عیبارەتی کـتێبەکـا بـە «مسطر» پەرەکانیان خەتکێشی کردووە و جالێیان نوسیوەتەوە.

«مسطر» یان خەتکێش ئامرازێک بووە بە پانایی و درێژایی پەڕی کتێب کە لە لەتکە مقەبایێکی قایم و خۆراگر سازیان کردووە، بەم شێوە کە بە شریتێک یان گشتەکە دەزوێکی نەپسێن لە مقەبایەکەیان وەتەنیوە بە جۆرێکی واکە گشتەکەکەیان بە باری پانایی مقەباکەدا ئەمسەر ئەوسەر کردوە و نێوانی هەر دوو داوانیش بە ئەندازەی نێوانی دووخەتی ئـەم قاقەزە خەتدارانە بووە. هەر ئاوا تا مقەباکە تەواو بـووە، دەزوەکـەیان لێ بـەستوو، و لۆیەک، یان چەند لۆشیان بە چوار دەوری داهێناوە تا جێگای لێ نووسینی عـیبارەتی کتێبەکە لە جیگای لێ نووسینی حاشیەکان جیا بکاتەوە. هەڵبەت بۆ جێ ی حاشیەکان بە مەبەستی جوانی و بۆ ئەوەش حاشیەکان دەگەڵ دەقی کتێبەکە تێکەڵ نەبن، دەزوەکە لاو نیو رایەڵ کراوە و مابەینی دەزوەکانیش کەمتر بووە.

شێوەی کار کردنیش بەو خەتکێشە ئاوابوە کە دوای ئـامادە بـوونی لە بـن پـەڕە قاقەزەکەیان داناوە و بە توندی دەستیان بە سەردا هێناوە و بەو شێوە پەڕەکە شوێن شوێن

---

١ ـ [illegible]

بووە و جابە ڕێنوێنی ئەو شوێنانە دەستیان کردووە بە نوسینەوە و نوسراوەکە زۆر جوان دەر هاتووە.

کتێب نوسەرەوەکان بە هۆی هونەرمەندی خۆیان و ئامادەکردنی خەتکێشی جۆراوجۆر حاشیە و پەراوێزەکانیان بەشکڵ و شێوەی جوراوجۆر دەرهێناوە. واهەبووە بە وێنەی گوڵ و گوڵدان یان بە شکڵی دیزە و گۆزە و یان بە شێوەی چادان و سەماوەر و گەڵادار و ئەوانە حاشیەکانیان نوسیوەتەوە.

**(ب) توندی و گوشراوی عیبارەتی کتێبەکان.**

ئەوکتێبانەی لە بەر دەستدان وکەڵکیان لێ وەردەگیرێت چونکو بەشی زۆریان لە چوار تا هەشت سەدە لەمەوبەر نوسراون باوی ئەدەبیاتی ئەو سەردەمەش وادیارە بریتی بووە لەوە کە نوسەر هەوڵ بدا وشە و ویژامەی رەق بەکار بێنی و چەمک و مانای زۆر لە وێژە و وتەی کەمدا بگونجێنی، لە سادەنووسی و درێژکردنەوە و شیکردنەوە خۆ بپارێزێ و ئیتر نوسراوەکەی زیاتر وەک مەتەڵ وابێ و هەمووکەس نەتوانێ خۆی لە قەرەبدات. بێ گومان مەبەستی سەرەکییان لەو (ایجاز) و بە کورتی نوسینە بە زۆری ئەوە بووە کە نوسراوەکانیان بە حاسانی لەبەر بکرێن و لەزەیندا رابگیرێن. جا ئەگەر مەبەستی دیکەش لەوکارە لە ئارادا بوبن وەکی هاندانی خوێنەران بۆ وردبوونەوە و قووڵ خوێندنەوەی پتر، یا بە هۆی کەمی و دەست نەکەوتنی قاقەز و قەلەم بووبێ ئەوە خوا دەیزانی و هەرچی بێ ئەوان خزمەتی خۆیان کردووە و گۆی خۆیان لە مەیدانی پاراستن و پەرەپێدانی عیلم و زانیاریدا بردوەتە دەر و مەرجی پیاوەتیان بردوتە سەر خواجەزایان بداتەوە و لایان لێ بکاتەوە.

بۆ نموونە مامۆستا مەلا عەلی قزڵجی کە لە بەینی سالەکانی (١٢٤٠)تا (١٢٩٦) کوچیدا ژیاوە و خەڵکی برایماوای قزڵجەی سەر بە قەزای پێنجوێن بووە و لە زانستی تەجوید و میرات بەشکردن و زۆر شتی دیشدا نوسراوی هەیە و هەروەها لە سەر «جمع‌الجوامع و تصریف ملاعلی» و ئەوانە پەراوێزی نوسیون، دەبینین پەراوێزەکانی بە ئەندازەیەک توندوو گوشراون کە هەریەکەیان مەتەڵێکی سەربەخۆن.

ئاشکرایە کە شەرح و پەراوێز نووسین لە سەر کتێبێک بەو مەبەستەیە کە کتێبەکە پێ هاسان بێ، کەچی زۆر لەپەراوێزەکانی مامۆستای‌خوا پایەی بەرزتر کاتەوە. لەسەر «شرح‌التصریف»ی مەلا علی شنۆیی مەگەر پیاوی زۆر زیرەک و وشیار دەنا بە خوێندن نەبێ کەس نایانزانێ.

دەڵێن جارێکی لێیان پرسیوە: مامۆستا گوێچکەی‌راستەت کامەیە؟ لەوەڵامدا دەستی چەپی بەسەر گوێچکەی چەپی و تۆقی سەری دابردووە؛ جا لەودیو گوێچکەی راستی نیشان داوە!!!



بەڕێز جەنابی مامۆستا مەلا «عبدالرحمن طاهری» دەرسبێژی گوندی «مەرخوز»ی سەقز دەگەڵ دوو نەفەر لە فەقێکانی کە ماوەیەک دوای بوونیان بە مەلا چوونەوە دیدەنی و دووکەس لە مامۆستایانی ئازەری زمانی قوتابخانە و ریش‌سپیەکی ئاوەدانی ساڵی (١٣٥٥ک. ھ) لە گوندی مەرخوز

**(٢) بە نابەڵەدی لەگۆ زمانی بێگانەرا چوون.**

یەکی دی لەو شتانە کە دەبێتە هۆی پاشکەوتن و درەنگ سەرکەوتنی فەقێ ئەوەیە کە بەر لەوەی هیچ سەواد و خوێندەوارییەک پەیدا بکات دەست دەکا بە خوێندنی فەقێیەتی کە ئەوە زۆریان لە فەقێ دەداو لە خوێندن وەدوایەی دەخات. من پێم وایە زۆر زۆر پێویستە فەقێ لانیکەم تا پۆلی پێنجی سەرەتایی بخوێنێت جاپاشان بێت بۆ فەقێیەتی، کە هەم دەرسە عەرەبیەکەی بۆ هاسانترە دەبێت و هەم زووتریش لە خوێندن دەبێتەوە. دەنا بابای فەقێ هەر بە پێناساندنی ئەلف و بێتکە بەگژ ئەو عەرەبیە سەخت و دژوارەدا بکرێ سەری لێ دەشێوی و ئەوەی فێری ببێ تا ماوەیەکی زۆر هەر توتیوارییە و بە ئەزمون دەرکەوتووە کە ئەوانەی سەوادی نوسین و خوێندنەوەی فارسییان هەیە؛ جا دەست دەکەن بە خوێندن بە دوو سێ ساڵ زووتر لێ دەبنەوە یان باشتر بڵێین دوو سێ ساڵ وەپێشتر دەکەوەن ئەوجار ئەگەر لەبەر ئەوەش نەبێ کەسێک دانیشتوی ئێران بێ کە ئێستا زمانی فارسی رەسمییە بە تایبەت ئەگەر بیهەوی پیشەی مەلایەتی بگرێتە بەر، زانینی زمانی فارسی تا رادەی قسە پێ کردن و خوێندنەوەی نوسراوە فارسییەکان و نوسینی هێندێک شتی وەک نامە و قەباڵە و ئەوانە هەر زۆر پێویستە یان لەوانەیە بۆ نوسین و وەرگێرانەوەی کتێب کەڵکی لێوەر بگیرێت.

وە ئەگەر بڵێین فەقێ دەتوانی وێڕای دەرسی عەرەبی کتێبی فارسیش بخوێنی وەک گوڵستان و بۆستان و ئیسماعیلنامە و «ای شدە» و ئەوانە؛ ئەوەلە سەرێکەوە وایە بەڵام وەک ئەوە فێر هەر نابێ کە لە قوتابخانەی رەسمی بخوێنی و دیسان عەرەبی و فارسی وێکرا بخوێنی دەرسەکانی گرانتر و وەختگیرتر دەبن. پاشان بە خوێندنی ئەوکتێبانە تەنیا فێری خوێندنەوە و نووسین دەبێ، بەڵام لە قوتابخانە سەرەرای ئەوانە فێری زۆر شتی پێویست وەک ژمێرە «حیساب»و زۆر لە زانستەکانی تر دەبێ و ئەگەر بشڵێیت ئەو هەموو زاناگەورەگەورە، ئەوگشتە عالمە مووقەڵە شێنەکە هەرکامیان لە زانستەکاندا دەریایەکی عیلم و زانیاری بوون دەگەڵ ئەوەشداکە زۆربەی هەرە زۆریان بێ ئەوەی لە قوتابخانەی رەسمی بخوێنن یەکسەرە روویان کردۆتە حوجرە و کەچی واش تێگەیشتوون و

پێ گەیشتوون! لەوە لاّم دادەڵێین: ئەوە شتێکی سەڵماوو بەڵگە نەویستە و مێژوو شاهیدە کە حوجرە زۆر کەڵەپیاوی وای پێ گەیاندوون کە هەر لە سەردەمی کۆرپەیی را لە باوەشێی گرتوون و هەر بە ژەکی خۆی فرچکی پێ گرتوون بەلاّم مەبەست ئەوەیە ئەگەر فەقێ لانی کەم تا پۆلی پێنجی سەرەتایی بخوێنێ پاشی بچێتە حوجرە چەند قازانجێکی هەیە:

(أ) یەکەم ئەوەیە کە فەقێ زووتر لە خوێندنێ دەبێتەوە یان باشتر بڵێین زووتر سەر دەکەوێ چونکی لەو تەمەنەیدا کە دەتوانێ بچێتە قوتابخانەی رەسمییەوە کە ساڵی حەوتەمی تەمەنیەتی ناتوانێ بچێتە فەقێیەتیو لە هەندەران وەسوڕێ و ئیش و کاری نێو حوجرە جێبەجێ بکات. بەلاّم منداڵ لەو تەمەنەدا دەتوانێ بچێتە قوتابخانە، چونکە لە ماڵی خۆی کلا نابێت و جگە لە بەڕێوەبردنی کارەکانی پێوەندیدار بە خوێندنەوە ئیشێکی دیکەی لە سەر زیاد ناکرێت و خوێندنەکەشی بە زمانێکیلە چاو عەرەبیهاسان و لە کتێبی تازە چاپ و وێنەدارڕایە، لە کاتێکدا منداڵ تا تەمەنی سێزدەچاردە ساڵی بۆ حوجرە هەر باش نییە و ئەگەر بەر لەو تەمەنە بنێردرێتە حوجرە لەوانەیە لە زۆر بارانەوە تووشی زیان و تێشکان و چۆرتمە ببێت ، بەو پێیە منداڵ تا کاتی چوونی حوجرەی دێتدەتوانی پێنج شەش کلاس لە فێرگە بخوێنێ و بەوجۆرە هەم بە دەرس خوێندن و وەرگرتنی ئەرکی دەرس و دەوررا دێت و هەم زۆر شتی پێوەندیدار بە دەرسی عەرەبیشەوە فێر دەبێت. بۆیە دەتوانین بڵێین بە سێ چوار ساڵ زووتر دەرسی مەلایەتیەکەی پێش دەکەوێت.

(ب) دووهەم ئەوەیە کە قوتابی لەو چەند ساڵە خوێندنەیدا چەند زانست و مەبەستێک دەخوێنێ و فێریان دەبێ کە زۆر بەکەڵک و پێویستن و لە نێو بەرنامەی ئێستای فەقێیەتیش دایان نێن یان ئەگەر هەشبن وەک پێویست کەڵکیان لێ وەرناگیریت. بۆ نموونە زانستی ژمێرە «حساب» کە لە دەرسی فەقێیەتیدا چەند کتێبێکی لەبارەدا نوسراوە وەک کتێبی «خلاصةالحساب»ی بهاءالدین عاملی ئەویش بە شێوەیەکی زۆر سەخت و کۆن. یان وەک زانستی «نجوم ـ علم‌الفلک» کە کتێبی «تشریح الافلاک»ی تێدا نوسراوە و ئەمیش هەر ئی نووسەری ناو براوە و بە شێوەیەکی زۆر نا لەبار لە چاپ دراوە. جگە لەوەش «بهاءالدین عاملی» لە ساڵی (٩٥٣) تا (١٠٣٥)ی کۆچی مانگیدا ژیاوە و

**ئەوکاتەش ئەو زانستانە بە تایبەت زانستی نجوم کە پێویستی بە ئامرازی وەک تلێسکوپ و دووربین و شتیوا هەیە؛ پێشکەوتنێکی وایان نەبووە و هێندێک لەو شتانەی کە ئەو کات بەشێکی سەلمێندراوی عیلمی لە قەلەم دراون ئێستا ڕەد کراونەوە.**

**جا پیاو بەجیّی ئەوەی کە خۆ بەو کتێبانەوە ماندوو بکات کە هەم بە شێوەیەکی ڕەق نوسراون و هەم خەت و چاپیان ناحەزە و هەم بەشێک لە ناوە ڕۆکەکەشیان دوای بەرە و پێش چوون و هەلّدانی ئەو زانستانە، یان ڕەد کراوەتەوە یان ئاڵ و گۆری تێدا پێک هاتووە؛ بۆ چی لە کتێبەکانی فێرگە ڕەسمییەکان کەڵک وەر نەگرێت؟**

**ئەمن بە بیروڕای خۆم وام پێ باشە کە فەقێ ئەگەر بە شێوەی ڕەسمیش دەرس‌نەخوێنێ بۆوجۆرە زانستانە و زۆر زانستی پێویستی دیش کە لە بەرنامەی خوێندن‌دا نین وەکی: جوغرافی، کۆمەڵناسی، دەروون‌ناسی و ئەوانە هەر لە کتێبە ڕەسمییەکان، یان لەو کتێب و گۆوارانە کە لە بازاڕ دەست‌دەکەون کەڵک وەربگرێت.**

**(ج)سێهەم ئەوە کە منداڵ بەو چەند ساڵانە ئەگەر بچێتە فێرگە و دەگەڵ کۆمەڵی زۆر تێکەل ببێ، مێشکی باشتر دەکرێتەوە و زەینی ڕوّنتر دەبێتەوە. لە بەر ئەوەی کە فێرگەی ڕەسمی ئازادی زیاتر تێدایە و منداڵ لەوێ زیاتری هەڵبەزین‌و دابەزین بۆ دەکرێ و وریاتر دەبێت و لە حوجرەدا ئەو ئازادییەی نییە و بگرە قوتابی ڕێگەی هیچ جۆرە زاق و زۆق[1] و حیندرحۆیەکی پێ‌نادرێ و لە ئاکامدا بە تەواوی مێشکی ناپژێ و ڕووی ناکرێتەوە.**

**(د)قازانجی چوارەم ئەوەیە کە فەقێ لە زمانی ڕۆژ تێدەگا و بۆ وەڵام دانەوەی خەڵک ئامادەیی زیاتر دەبێت. چونکە فەقێ کە قەرارە ببێتە میراتگری پێغەمبەر(د) و ئەرکی ڕاگەیاندن و تێگەیاندن وە ئەستۆی خۆی بگرێ لە سەردەمی فەقێیەتیدا و بە تایبەت دوای بوونی بە مەلا دەهەموو کەسێک هەڵدەنگوێت و دەگەڵ هەموو جۆرە پرسیارێک ڕوو بە ڕوو دەبێت و لەلایەن هەموو چین و توێژێکەوە پرسیاری لێ دەکرێت؛ جابۆیە دەبێ لە زمانی ڕۆژ تێ بگات، بەتایبەت زمانی چینی خوێندەواری مەدرەسەیی**

---

١ - زاق و زۆق: چەقە و هەرای منالان. (هەنبانە بۆرینە)

حەتمەن دەبێ بزانێت، بۆوەی بتوانی دینیان تێبگەیەنێت و وەک کەسێک کە لە مەڕ مەسەلەو بابەتە دینی‌یەکانەوە پسپۆڕی هەیە گرێ و گۆڵەکانیان بۆ هەل بکات و بزانێ و بتوانێ دەگەڵیان دابنیشێ و هەر بەو زمان و زانستانەی کە بۆ خۆیان پێی دەخوێنن و لێی تێدەگەن بۆیان بدوێ و ئەو لێک دابڕان و دووری و لێک نەبانی‌یەی دوژمن لە نێوان دوو چینی خوێندەواری مەدرەسەیی و فەقێدا پێکی هێناوە لە ناوی بەرێ و دەستی برایەتی و هاوکاری کاکی مەدەرسەیی بە توندی راگوشی و هەردووکیان بەیەکەوە بکەونە شەڕ دەگەڵ نەزانی و هەموو دیار دەیەکی دیکەی دواکەوتوانە.

بۆیە من تەنانەت رام وایە کەفەقێ ئەگەر بکرێ بەر لە هاتنی بۆ نێو فەقێیان مەدەرکی (دیپلمەیانسیکل) هەر وەربگرێ و ئەگەر نەشکرا تا پۆلی پێنجی سەرەتایی هەر بخوێنی و جا دوای ئەوەی خوێندنەکەی سەرکەوت واتە گەیشتە رادەی «شرح‌العقاید» و «مختصرالمعانی» و ئەوانە بە شێوەی «متفرقە» ئیمتیحان بدات، تالانی کەم دیپلومە وەر دەگرێت. بەو مەرجە خوێندنە عەرەبیەکەی پاش گوێ‌نەدات و کەمتەر خەمی تێدا نەکات. خۆ ئەگەر لە باری ماڵی و حاڵی و ساڵی‌یەوە توانی بچێتە زانکۆ و قوناغەکانی تێپەڕ بکا، ئەوە نوری عەلا نورە و ئازایەتی‌یەکی بێ‌وێنە و بێ سنوورە.

(ه) خەت و سەوادی فارسیش یەکی دیکەیە لە قازانجەکانی چون بۆ فێرگەی رەسمی. چونکو فێر بوونی ئەو زمانە ئەگەر لە بەر قسە پێ کردن و نوسین و خوێندنەوەی نامە و قەبزە و قەباڵە و کتێب و گوێ‌راگرتن لە رادوێ و تەلەویزیون و هەر وەها خوێندنەوەی گۆوار و رۆژنامە و ئەوانەش نەبێ، هەر تەنیا لەبەر ئەوەی زۆر لەو کتێب و نوسراوانەی فەقێ، یان مەلاکەڵکیان لێ وەردەگرێ؛ جا هەر لە تەفسیر و شەرع و مێژوو نوسراوی عیلمی‌یەوە بگرە تا هەموو ئەو نوسراوە سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی و ئەخلاقی و بیر و باوەڕی‌یانەی کە لە بارەی ئیسلام و پێویستیەکانی دیکەی خەڵکدا بە زمانی فارسی نوسراون یان وەرگێردراونەوە کە خوێندەواری ئایینی بە هیچ کلونجێک ناتوانی لێیان بێ نیاز بێت؛ ئەو خەت و سەوادە گەلێک پێویست و بەجێ‌یە.

### ٣ـ وەخت بە فیڕۆدان

یەکی دیکە لە هۆیەکانی زیان دیتنی فەقێ و بە خەسار چوونی تەمەنی پڕ بایەخی ئەوەیە کەکاتی خۆی زیاتر لەو زانست و کتێبانەدا بە سەردە باکە نا بێ هێندەیان گوێ پێ بدرێت و لە بەرانبەردا ئەو زانست و زانیاری‌یانەی کە وەکو ئامانج‌وان و دەبێ حەتمەن بزانرێن؛ یان هەر نایان خوێنێت یان ئەگەر بشیان خوێنێت وەک پێویست وەبەر چاویان ناگرێت.

چونکو ئەگەر وەک ڕاستەقینە ئامانج و ئاکامی فەقێیەتی وە بەر چاو بگرین دەبێ بڵێین: فەقێ کەسێکە دوای سەرکەوتن بە هەوراز و نشێوی فەقێ‌یەتی‌دا سەرەنجام دەبێت بەمەلا. مەلاش میراتگری پێغەمبەری ئیسلامە(د) واتە کەسێکە دەبێ لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بە باشی تێبگات و بە شێوەیەکی ڕاست ودروست بە خەڵکی ڕابگەیەنێ. دەش‌زانین کە دینی ئیسلام بریتی‌یە لە چەند ئەسڵێکی عەقیدەیی،بەرنامەیەکی عیبادەتی، ڕێبازێکی ئەخلاقی، پەیڕەوێکی ئابووری و پڕوگرامێکی سیاسی و نیزامی کە ئەوانە لە چوارچێوەی قورئان و فەرمودە و کردەوە و بڕیارەکانی پێغەمبەر (د)دا، گونجێندراون.

جا هەر چەند ئەوانە بەشی زۆریان بە هۆی ڕەنج و تێکۆشانی پێشەوا موجتەهیدەکانەوە لە سەرچاوەکان هەڵێنجراون و لە کتێبە شەرعی‌یەکان‌دا کۆ کراونەوە، بەڵام لە بەر ئەوەی دەرگای (اجتهاد) دانەخراوە و هەموو شتێکیش ئێستا نەزانراوە، زۆر پێویستە دوای پەیداکردنی پسپۆڕی (تخصص) جا با لە مەسەلەیەکی نێو (مذهب)ێک‌دا بێ لە قورئان و حەدیس بکۆڵدرێتەوە و ڕەنجیان لە پێناودا ببردرێ. کە ئەوەش پێویستی‌بێجگە لە زانستەکانی وەک: نحو، صرف، بلاغت و اصول‌الفقه و...ـ بە (علوم القرآن و علوم الحدیث و....) هەیەو کەچی دەبینین ئەو زانستانە لە بەرنامەی خوێندنی فەقێیەتی‌دا هەر پاش گوێ خراون و ئی‌وا هەیە ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێ هەر ناش‌زانێ شتی واهەیە. تەنیا شتێک کە لە (علوم‌القرآن و علوم الحدیث)دا وە بەر چاو دەگیرێ: تەجوید و خوێندنی دووسێ جزو قورئان لە تەفسیررا و خوێندنی نەختێک حەدیس و هیچی دی. ئیتر نە گوێ بە لەبەرکردنیان دەدرێ و نە ئەو زانستانەی لەبارەیان‌دا

نوسراون دەخوێندرێن ئەگەر چی بە زاراوە ئەوانە وەبەر علوم‌الحدیث و علوم‌القرآن ناکەون و زانستانێکی سەر بەخۆن.(١)

بەداخەوە بڕێک لە مەلایەکان دوای خوێندنی ئەو هەمو زانستانە ئیجازە بە خۆیان نادەن مانای ئایەتێک لێک بدەنەوە و پێیان وایە دەبێ لە هەموو شتێکدا هەر وەدوای بیر و بۆچون و لێکدانەوەی (مفسر)ەکان بکەون و هەر چی ئەوان نوسیویانە با هیچ بەڵگەی نەقڵی یان عەقلی لە سەر نەبێ هەر راستە. ئەوە لە حاڵێکدایە کە ئێمە تەنانەت لە سەرمان پێویستە بە پێی توانا لە بەڵگە و رێکاری موجتەهیدەکانیش بکۆڵینەوە.

تەنانەت بازێکیان لە بەرکردنی قورئان بۆ فەقێ بەباش نازانن و بەرگری لێ دەکەن!!!



**فەقێ و مامۆستای حوجرەی خانەقای پاوە**

---

١ ـ بە خۆشییەوە دەبێ بڵێم لەو دواییانەدا ئەو دوو علمانە کە هەرکامیان لە چەندین زانستی جوێ، جوێ پێک هاتوون لە بەشێکی زۆری حوجرەکاندا خراونە پاڵ بەرنامەی دەرسی.

## زانستە پێویستە لەدەست چووەکان

ریزی ئەو زانست و زانیاری‌یانەی کە بۆ مەلایەتی بەکەڵکن و لە بەرنامەی بانگ‌هێشتنی خەڵک بۆلای خوا (الدعوة الی‌الله)دا بۆنیان لازم و زەرووری‌یە بەلام یان لە بیر بردراونە وە یان وەک پێویست وەبەر چاو ناگیرێن بەم شێوەیە:

١ـ (علوم‌القرآن) جگە لە تەجوید و بڕێک تەفسیر.

٢ـ (علوم‌الحدیث) بێجگە لە خوێندنی مانای بڕێک حەدیس.

٣ـ (مێژوو) کەلانی کەم دەبوو لە مێژووی ئیسلام‌دا یەک دوو کتێبی کورت بخوێندرێ و مێژووی گشتی‌ش بە موتالاکەڵکی لێ وەر بگیرێت.

٤ـ (علم‌الاخلاق) یا (التصوف) کە پێویستە کتێبی سەر بە خۆی تێدا بخوێندرێ کەچی فەقێ بە شێوەی پەرتەوازە و تاک و تووک نەبێ رێی دەمەسەلە ئەخلاقی‌یەکان ناکەوێ.

٥ـکۆمەڵناسی (جامعەشناسی).

٦ـ دەرون ناسی (روان شناسی) کە ئەو وو زانستانەش بۆ مەلا زۆر پێویستن و ئەگەر کابرای دەعوەتگەر لە باری کۆمەلایەتی و خۆوخدەو دەرونی خەڵک، ئاگاداری نەبێ زۆر جاران بانگ هێشتنەکەی یان هەر کەڵکی نابێ یان زیانیشی لێ پەیدا دەبێت.

٧ـ (فقه‌الدعوة)

پێم وایە هۆیەکی هەرە گەورەی سەر نەکوتنی مامۆستا ئایینی‌یەکان لە بانگ هێشتنی خەڵک بۆ لای خوادا وەک پێویست، نەخوێندنی (فقه‌الدعوة) و تێ‌نەگەیشتن لە شێوازی دروست و بەکەڵکی دەعوەت و راگەیاندنە. چونکی وەک دەزانین دەعوەتگەر لە ژیانی دەعوەت‌دا دەگەڵ هەموو کەس و هەر جۆرە تاقمێک روو بە روویە و هەر کەسەش خۆوخدە و بیر و بۆ چوون و سەلیقەیەکی تایبەت بە خۆیەوە هەیە و لە دنیایەک‌دا دەژی کە کەسی لە گەڵ‌دا نییە و وەک هیچ کەس ناژیی و بیر ناکاتەوە. ئی وا هەیە لە پێش و لێ‌هاتوو تێ‌گەیشتویە؛ ئی واش هەیە نازانێ دەوری چ پاشایەکی‌یە.

بازە کەسێک دەست رۆیشتوو و ساغ و بەکەیف شادە؛ ئی واش هەیە بێ دەرەتان و

نەخۆش و خەفەتبارە.

هێندێک کەس هێمن و لە سەرەخۆ و لێ بووردۆن؛ هێندیکیش کەم چیکڵدانە و زوو هەڵچوو و تۆڵەستێنن.

بەشێک لە خەڵکی کەم ساڵ و منداڵ و کاڵن؛ بازێکیش پیر و بەبیر و ژیرن.

هەمانە خوراگرو (ارادی)یە؛ هەشمانە خۆدۆڕێن و هەڵە و (احساس)ی‌یە.

بابای گوێگر هەڵدەکەوێ ناسیاو و خۆماڵی‌یە؛ دەشبێ نەناسراوو و نامۆ و لاوەکی‌یە.

کۆمەڵێک هەن بە تەقوا و پارێزگار و لە خوا ترس؛ تاقمێکیش هەن بە پێچەوانە.

جا کەسێک کە بانگەواز دەکا بۆلای خودا، نابێ تەنیا لە بانگ هێشتنی گشتی کەڵک وەربگرێ و بەبەکار هێنانی رستەی (ایهاالناس) هەموو کەس وەک یەک لە قەڵەم دا و بە چاوێک تەماشایان بکا و تێکڕا و بەشێوە و زمانێک و لە مەبەستێک بۆیان بدوێ. چونکو نە هەموو کەس هەموو شتێک هەڵدەگرێ و نە هەر مەبەستێک بۆ لێ دوان دەبێ و نە هەر جێ و شوێن و کات و ساتێک هەر مەبەستێکی تێدا دەگوترێ. بەڵکو دەبێ وێڕای کەڵک وەرگرتن لە دوانگە (منبر) و کۆبوونەوەکان و وتاری گشتی، لە راگەیاندن و بانگ هێشتنی تاکی و فەردیش کەڵک وەربگیرێت و دەگەڵ یەکەیەکەی خەڵک پێوەندی گەرم و گوڕ بگیرێت و بە پێی توانا و بۆلوان دەگەڵ هەر کەس بە زمانی خۆی قسە بکرێ و بەرە و دینداری و خواپەرستی رابکێشرێ.

بەڵێ لە دەعوەت و بانگەواز بۆلای خوادابۆ ئەوەی ئەو دەعوەتە شوێن‌دانەرتر بێ‌وبەرهەمی زیاتری هەبێ چەند مەرجێگ وەبەر چاوگیراون کە ئەو مەرجانە لە قورئانی پیرۆز و ژێنامە (سیرە)ی حەزرەتی رەسوول درودی خوای لە سەر بێ و فەرمودەکانی‌دا بە ئاشکرا گوتراون جا یان دەقیان لە سەرە یان ئەوەتا ئاماژەیان بۆ کراوە؛ کە بڕێک لەو مەرجانە دەبێ لە (داعی) خوی‌دا بێنەجێ و بڕێکیشیان پێوەندی‌یان بە (مدعو)وە هەیە و بە بێ وەبەر چاوگرتنی ئەو مەرجانە بانگ‌هێشتنی بۆلای خوا، یان هەر کەڵکی نییە یان ئەگەر بشی‌بێت زۆر کەمە و لەوانەیە هێندێک جار زەرەر و زیانیشی لێ وەکەوێت.

تا ئەو چەند ساڵانەی دوایی زانستی (فقەالدعوة) لە وڵاتی ئێمە بە شێوەیەکی

کۆکراوە و ڕێک و پێک وەچەنگ نەدەکەوت و تەنیا لە تەفسیرەکان و کتێبە حەدیسی و شەرعی‌یەکان‌دا لە باسەکانی وەک (الامر بالمعروف و النهی عن‌المنکر) و جێ‌جێ‌ی (ربع‌العبادات) و (کتاب‌السیر) و ئەوانە، بە پرژ و بڵاوی دەبینرا. بەڵام بە خۆشی‌یەوە لەو دوایـــی‌یانەدا کـــتێبانێکی زۆر لەو زانســـتە بـــە ســـوودەدا کـــەوتوونەتە بـــازاڕوە و وەدست‌خستنیان هاسانە.

کە واتە برای فەقێ ئەگەر بیهەوێ سپەی ڕۆژێ لە ئەنجام‌دانی ئەرکی سەر شانی‌دا کە بانگ‌هێشتنی خەڵکە بۆلای ئیسلام و دینداری؛ سەرکەوتنی زیاد وەدەست بێنێ؛ زۆر بە جێ و پێویستە چەند کتێب لەو زانستەدا بخوێنێ و موتالاّ بکات و ئیتر بێ ئاگاداری لە پیشە(فن)ی دەعوەت و بانگەواز، لە گڕ ئەو کارە ڕاچون، سەفەری بـە نـابەلەدی و بـە تاریکە شەوێ ڕێ‌کوتان و سەر لێرە و لەوێ‌دانە.

بەڵێ ئەو جۆرە زانستانە کە بڕێکیان پلەی زانست و زانیاری «داعی» دەبەنە سەر و بازێکیشیان «مدعو»ەکانی پێ دەناسێنن و لە هەل و مەرجی دەعوەتی تێدەگەیێنن یـان ئەوەتا ناخوێندرێن ولە بەرنامەی دەرسی حوجرەکان‌دا نێوێکیان نیە یان ئەگەر بش بن وەک پێویست وە بەر چاو ناگیرین کەچی لە بەرانبەردا بۆ هێندێک لە زانستەکان نرخی زیاد لە پێویست دادەنرێت و کاتی زۆریان بۆ تەرخان دەکرێت.

مەبەست لە خوێندن زانینی عیلمە نەوەک کتێب

بە داخەوە بڕێک لە دەرس بێژەکان وادەزانن و فەقێ‌یەکانیش وا تێدەگەیەنن کـە مەبەست لە خوێندنی عیلمی «نەحو» بەوێنە، فێر بوونی کتێبە نـەحوییەکـانە، نـەوەک زانستەکە خۆی. بۆیە دەیان هەوێ فەقێ بێجگە لە مەتن و شەرحی کتێبەکە، تەواوی ئەو حاشیە و قونەقەید و پرسیار و وەڵام و ڕەخنانەی کە هەن دەبێ موو بە موو بزانرێن، دەنا نابێ دەست لەو کتێبە هەڵبگیرێت و دەست بە کتێبێکی دی بکرێت.

یان پێیان وایە دەبێ هەر کتێبێکی لەو زانستەدا نوسراوە، بە وردی بزانرێت و ئیتر ئەو جورە مامۆستایانە لە بەر نـاوەستایی خـۆیان جـیاوازی دانـانین لە نـێوان (عـلم) خوێندن و (کتێب) خوێندن‌دا.

بیر لەوەی ناکەنەوە کە تەمەن بردنە سەری زیاد لە پێویست لە عیلمێکدا بە تاوان و گوناه دادەنرێ و زیانێکی قەرەبوونەکراوەیە لە فەقێ دەدرێ. لە زۆربەی کتێبە (نحو)یەکاندا نوسراوە: «الغرض من علم النحو معرفةالاءعراب» واتە مەبەست لە خوێندنی زانستی «نەحو» ناسینی (اعراب) واتە سەر و ژێر و بۆری ئاخری وشەکانە لە رستەدا. کەچی ئەو جۆرە مامۆستایانە بە کردەوە لەو مەبەستە لادەدەن و دەڵێن: «الغرض من علم النحو معرفة جميع الكتب المؤلفة في هذا العلم بما عليها من الحواشي و بما فيها من القيود و الأسئلة مع أجوبتها و الاعتراضات الواردة و دفعها» واتە مەبەست لە زانستی نەحو فێر بوونی هەموو ئەو کتێبانەیە کە لەو عیلمەدا نوسراون؛ بە هەر چی حاشیە و پەراوێزەوە کە بە سەریانەوەیە و بە هەموو ناتۆرە و پرسیارو وەڵام و رەخنە و جوابێکەوە کە تێیاندا هەیە!!!

ئاخر بە راستی ئەگەر فەقێ توانی وێژامەی عەرەبی بە پێی یاسای نەحو بخوێنێتەوە، چ پێویست دەکا هەموو کتێبەکان بە وردی بخوێنی؟ یان ئەگەر ئەو زانستە لە هەر کتێبو نوسراوەیەکی نەحویدا فێر بێ چ کورت و چ درێژ، چ کۆن و چ تازە، چ زەرد و چ سپی چ فەرقێکی هەیە؟!

بۆ دەبێ فەقێی بێچارە چاری ناچار بێ (جامی) هەر بخوێنێ و (حاصل و محصول)ان هەر بزانێ و (دوور دائر) هەر دەفع بکات؟!!!

هەرچی لە خۆی نەگۆڕێ دەزانێ کە مەبەستی سەرەکی لە خوێندنی فەقێیەتی تێگەیشتن لە قورئان و حەدیث و شەرعەو ئیتر عیلمەکانی دی وەکی «نحو، صرف، بلاغت و...» ئامرازێکن بۆ فێر بوونی وان و راستەوخۆ مەبەست نین و هەر ئەوەندە بزانرێن کە پیاو کاتی خۆی بتوانێ بیان لێتەوە و هەر وەها بتوانێ لە قورئانوحەدیث و کتێبە شەرعییەکان و هەر کتێبێکی دی کە بە عەرەبی نوسرابێ کەڵک وەر بگرێ بەسە و ئیتر نابێ زیاتر وەختیان تێدا بە فیڕۆ بدرێت.

بابای مەلا ئەگەر دەستی کرد بە مەلایەتی و ئەنجامدانی ئەرکەکانی کەبریتین لە وتارادان (الخطابە) ئامۆژگاری (الموعظە)، رێنمونی (الارشاد)، روون کردنەوەی مەسەلە شەرعییەکان (الافتاء)، دەستووردان بە چاکە و گێرانەوە لە خەراپە (الامر

بالمعروف و النهی عن‌المنکر)، بانگەواز بۆلای خوا (الدعوةالی‌اللـه)، نـاتوانـی بـەو عیلمانە وەڵامی خەڵک بداتەوە و ئەرکی سەرشانی بەرێوە بەرێ، بەڵکوو ئەوکارە تەنیا و تەنیا بە زانینی قورئان و حەدیث و شەرع و مێژوو و ...دەکرێ.(١)

هەندێک لەو عیلمانەی، فەقێ زیاد لە پێویست پێیانەوە خەریک دەبێ و تەمەنێکی زۆریان تێدا بە سەر دەبات و لە ئاکامیش دا زەرەر دەکات بریتین لە:

أ) عیلمی «نحو» لە عیلمی «نحو»داکە زانستێکە بە ئامانجی ناسینی «اعراب» واتە دروست خـوێندنەوەی وێـژە (کـلام)ی عـەرەبی و لێک هـەڵاواردن و لێکدانـەوەی وشەکانی، دەخوێندرێت پێنج شەش کتێبی بەو تەرتیبە لە بارەدا دەخوێنن:

١ـ «عوامل‌الجرجانی» یان عوامل البرکوی یان هەردوکیان.

٢ـ النموذج بە شەرحەوە.

٣ـ الاظهار للبرکوی یان الصمدیەیان الهدایە یان دودانە، لەوانە.

۴ـ الکافیە یان شەرحەکەی فوائد الضیائیە «شرح جامی».

۵ـ الفیةابن مالک بە شەرحەکەیەوە «السیوطی».

۶ـ واهەیە «مغنی‌اللبیب»یش هەمووی‌یان باسی حەرفەکەی هەر دەخوێندرێ.

ب) عیلمی «صرف»کە زانستێکە بە ئامانجی ناسینی وشە لەباری ریشە و داتاشین و گۆڕانکاری‌یەوە دەخوێندرێت ئەویش چوار پێنج کتێبی تێدا دەخوێندرێن بەم شێوە:

١ـ شرح الأمثلە و صرف أمیر.

---

١ ـ لە بیرمە ئەو ساڵەی کە ئیجازەی مەلایەتیم وەرگرت و بە پێی دابی ئیجازە وەرگرتن قۆلێکم مەلا و فەقێ و خەڵک دەگەڵ هاتنەوە ئاوایی خۆمان، پاش تەواو بوونی رێ و رەسمی بەخێر هێنان و پیرۆزبایی لە مزگەوتی دێ دەگەڵ تاقمێک لە میوانەکان و خەڵک چوینە ماڵێ، ئیستا بە چاکی دەست بە قـان نەکرابوو کە حاجی‌یەکی خەڵکی ئاوەدانی هەڵیدایە: ئەرێ فلانە کەس پرسیارێکم هەیە! گوتم فەرموو. گوتی ئەرێ حەزرەتی «حسن» خوای لێ رازی بێ چۆن شەهید بوو؟منیش کە سەرم لە پرسیاری مێژویی هەردەر نەدەچوو مێژووش یەکێک لەو زانستە بەکەڵکانە بوو کە دەبوو بخوێندرێ و بەڵام نەخوێندرابوو بە ناچاری و بە شەرمەوە هەڵم دایەو گوتم ئەوەی راست بێ مام حاجی ئێمە لە ماوەی فەقیەتی‌دا دەرسی مێژوو ناخوێنین و دەبێ پاش ئیجازە وەرگرتن موتالای لە سەر بکەین جابۆیە ناتوانم وەڵامی ئەو پرسیارەت بدەمە! ماڵم هەقە ئەویش نەلەسەر ئەو پـرسیارە رۆیی ونە پرسیاری دیکەی لێ کردم.

٢ـ تصريف الزنجانی بە شەرحەوە.

٣ـ التصريف لملاعلی الاشنوی کە وا هەیە «قزلجی و قەرەداغیشی لە سەر دەخوێندرێن.

٤ـ شرح‌النظام یان سید عبدالله نقرەکار یان کمال‌الدین. کە هەر سێکیان شەرحی شافیەی «ابن الجاجب»ن.

ج) (منطق) لە مەنتیقدا زۆر کتێب خوێندراون وەک:

١ـ ایساغوجی.

٢ـ مغنی‌الطلاب یان الملتقطە.

٣ـ حاشیەی ملا عبدالله یزدی.

٤ـ گلنبوی شەرح.

٥ـ شرح الشمسیە.

٦ـ گلنبوی برهان و چەند کتێبی دیش.

بەڵی لەو سێ عیلمانەدا بێجگە لە حاشیە و شتی وا، ئەو کتێبانە خوێندراون و تەمەنیان تێدا بەسەر بردراوە لە حاڵێکدا کە ئەگەر بۆ نموونە لە «نحو»دا تەنیا عەوامیلی جورجانی یان بورکەوی و «النموذج» و «الصمدیە» و «السیوطی» و ئەگەر بگونجێ موفرەداتی «مغنی‌اللبیب» و لە (صرف)دا «تصریف‌الزنجانی» و تصریف ملاعلی و «شرح‌النظام» و لە «منطق»دا «مغنی‌الطلاب» و «حاشیەملاعبداللە» بخوێندرێن و بە چاکی بە فەقێ بگوترێن و ئەویش کۆششی پێویستیان تێدا بکات؛ گومان لەوەدا نییە کە بەسن و پیاو پێیان بێ نیاز دەبێ و ئیتر پێویست بەو هەموو خۆئازاردان و کتێب سەرە و نێو کردنەی ناکات کە تەنیا کات بە فیرۆدانە و هیچی تر.



**دەستەیەک فەقێی «بوغدەکەندی» سەقز. لە ساڵەکانی ٤٧ و ٤٨ی کوچی، هەتاوی‌دا.**

جا ئێستێ هەر باشە کە بڕێک لەو کتێبانە وەلانـراون. یـان هـەر ڕاستە کـتێبەکـە دەخوێندرێت. دەنا وەکی باس دەکەن تا ماوەی بیستسی ساڵێک لەمەوبەر بێجگە لەو شەرح و مەتنانە، زۆر حاشیە و شەرحی دیکەشیان لە سەر خویندراوە وەک «حدائق» و «نعمةالله» لە سەر «النموذج»، «اطەلی» لە سەر «الاظهار»، «سـید عـلی خـان» لە سـەر «الصمدیە، عبدالغفور و عـصام‌الدیـن و مـحرم افـندی لە سـەر «جـامی» ابـوطالب و عبدالحکیم لە سەر «السیوطی».

بە کورتی دەتوانم بڵێم لە ڕابردوودا زیاتر خەریک و فێری کتێب خوێندن بـوون نەوەک عیلم و زانست؛ ئەگەر بابای فەقێ لە نێو کتێبێکی گەرەی وەک جامی‌دا ڕۆژێک، قونەقەیدێک، حاشیەیەک شتێکیان لێ پرسیبێتەوەو نەیزانیبێ وەڵامی دروست بداتەوە، ئیتر نەپرسیارکەر ئەوی بە سەوادار و نە ئەو خۆی بە پیاو زانیوە؛ یەکجاری خۆی لە بەر چاوان کەوتووە و بەر لە هەموو شتێک لە بـیری تـوڵە کـردنەوەدا بـووە و ویسـتویەتی

پرسیارێکی وای لێ بکاتەوە کە ئەویش سەرە دەرێی لێ دەرنەکاو نەیزانێ، پاشان هەوڵی ئەوەی داوە ئەو پرسیارەی شکستی تێدا خواردوە روون بکاتەوە، تا جارێکی دیش بۆری پێ نەخوات و ئەگەر بۆی روون بوبێتەوە کە چەند جێی دیکەش لەوکتێبەدا هەن کە ئەگەر پرسیاری لێ بکرێ نایان زانێ سەر لە نوێ بۆجاری دوهەم یان بۆ چەندەمین جار ئەو کتێبە، یان هەر ئەو جێیانەی بە دەرس خوێندۆتەوە و زۆرێکی دی لە تەمەنی پڕ بایەخی تێدا بەسەر بردووە. بەڵام هەر ئەو فەقێیە ئەگەر دەیان و سەتان پرسیاری لە قورئان و حەدیث و شەرع لێ کرابێت و نەیزانیبێت باکی نەبووە و تەقەی لە سەری نەهاتووە. تەنانەت لەو مەبەستە ـ ەرەکی و بنەرەتی‌یانە باس و پرسیار هەرنەکراوە و لێدوان لە چەمک و مانای ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان هەر بە گوناح و تاوان زانراوە و بازێک مەلای بیر تەسک بوون: ڕێگایان بە خۆشیان نەداوە مانای قورئان لێک بدەنەوە و لانی کەم بچنە نێو تەنکاوی دەریای بێ بنی رستە پڕ مەبەستەکانی قورئان و لە قەراغ و قوڵاغان رادەست راکێشن بۆ دوڕ و گەوهەران.

## دوایین پلەی خوێندەواری

دوایین پلەی خوێندەواری بریتی‌یە لە پلەی (الاجتهاد). بۆ گەیشتن بەو پلەیە پێویستە خوێندەوار بێجگە لە زانینی زمانی عەرەبی بە تێری وتەسەلی و هەروەها زانینی قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەر «د» لە هەموو بارێکەوە و زانینی (اصول‌الفقه) بە تەواوی، دەبێ مەسەلە ئیجماع لە سەر کراوەکان بناسێ، لەمەبەستەکانی شەریعەت تێبگا، دارای ئامادەیی سروشتی (الاستعداد الفطری) بێ و...

### المجتهد

موجتەهید بە خوێندەوارێک دەڵێن ئەو مەرجانەی سەرێی تێدابن و بتوانێ ئیجتیهاد بکات، واتە ئەو پەڕی هێز و توانای خۆی بە کار بەرێ بۆ دۆزینەوە و پەی‌بردن

بە ئەحکامی شەرعی و هەڵێنجانیانلە سەر چاوە دیاریکراوەکان،[١] بەکەڵک وەرگرتن لە یاساکانی (اصول‌الفقه).

موجتەهید سێ جۆری هەیە کەبەکورتی دەیان ناسێنین:

١- (المجتهدالمطلق) ئەوە بو کە باسمان کرد.

٢- (المجتهدفي‌المذهب) ئەم جورە موجتەهیدە ڕێبازێکی تایبەتی نییە بۆ دەرهێنانی ئەحکام، بەڵکو بە کەڵک وەرگرتن لە ڕێباز ودەقەکان (نصوص)ی ئیمامەکەی ئەحکامی شەرعی هەڵدێنجێ[٢]

٣- (مجتهدالفتیا)، پلەی ئەم موجتەهیدەش لە پلەی هەردوک جۆرەکەی پێشەوە لە خوارترە و بە کەسێک دەڵێن کە سەری لە ڕێبازی ئیمامەکەی زۆرباش دەردەچێ و رایەکی بە سەرڕایەکی تریدا (ترجیح)دەدات و بە باشتری دادەنێ.

شایانی باسە کە بە لای هەندێک لە زانایانەوە (اجتهاد) بەشبەش «تجزیە» دەکرێ و دەگونجێ زانایەک هەر لە مەسەلەیەک یان مەبەستێکدا موجتەهید بێ، واتە توانایی هەبێ لە سەر ئیجتیهادکردن لە مەسەلەیەک یان لە چەند مەسەلەدا، جا با لە مەسەلەکانی تردا بە پلەی موجتەهیدی نەگەیشتبێ؛ وەک ئەوە کەسێک هەبێ تەنیا لە میرات بەشکردن (تقسیم‌المیراث)دا موجتەهید بێ بەم چەشنە ئەوکەسە ئاگاداری هەموو بەڵگەکانی میرات

---

١ - سەرچاوەکانی دیاری کراو بۆ لێ‌هەڵێنجانی یاساکانی شەرعی بە درێژی یازدە دانەن کە بریتین لە: (الکتاب و السنة) بەڕای تێکرای پێشەوا مسوڵمانەکان «الأئمةالمسلمین» (الاجماع والقیاس) بە هاو دەنگی «اتفاق»ی زۆربە «جمهور»یان. (الاستحسان، المصلحةالمرسلة، سدالذرائع، العرف، قول‌الصحابی، شرع من قبلنا و الاستصحاب بەکێشەو نیزاعی زانایانەوە تێیاندا.

٢ - هەر کام لە موجتەهیدەکان ڕێباز (مذهب)ێکی تایبەت بە خۆیان هەیە چونکە هەروەک لە پەراوێزی رابردوودا گوترا بێجگە لە قورئان و سونەت هیچکام لە بەڵگە شەرعی‌یەکان (الادلةالشرعیه) هاودەنگی هەموو موجتەهیدەکانیان لە سەر نییە و هەروەها جگە لە ئیجماع و قیاس جمهور لە سەر هیچیان هاورا نین. بۆ وێنە «النظام»ی موعتەزیلە و هەندێک لە خەواریجەکان ئیجماعیان قبوڵ نییە، زانایانی جەعفەری و «ظاهریە» قیاس بە بەڵگەیەکی شەرعی نازانن، ئیمامی شافیعی «خ» بەڵگەی (الاستحسان) و هەندێک بابەتی (سدالذرائع) رەت دەکاتەوە.

یان ئەوەتا موجتەهیدەکان لە مەرجەکانی پەسندکردنی (سنةالاحاد)دا جیاوازی بیر و رایان هەیە و بەم جۆرە هەر کام لەوان بۆ دەرهێنانی حوکمە شەرعی‌یەکان ڕێبازێکی تایبەتیان گرتۆتە بەر.

بەشکردن، وەکی قورئان، فەرمودەکانی پێغەمبەر«ص»، قسە و رای زانایان و ...بێ. جا ئەو کەسە بۆی هەیە لە مەسەلە میراتی‌یەکاندا بەگوێرەی یاسای پێوەندی‌دار، ئیجتیهاد بکات و رای خۆیان تێدا دەربڕێ.

ئەو ئاکامانەی موجتەهیدبە هەر سێ جۆرەکەیەوەپێیان دەگات لە سەرخۆی بەڵگە (حجة)ن و پێویستە بۆ خوی دەکاریان‌کات و بۆ هەرکەسێکی دیش کە بە پایەی ئیجتیهاد نەگەیشتبێ دروستە کە پەیرەویی «تقلید»ی لێ بکات بەو مەرجەی رێباز «مذهب»ەکەی کۆکراوە «مدوّن» بێت.

## چت لە دەست دێ ئەوەبکە

ئاشکرایە، گەیشتن بە پلەو پایەی موجتەهیدی بە هەرسێ جۆریەوە گەلێک بە زەحمەت و چەتونە و بۆ هەمووکەس نالوێ و کاری حەزرەتی فیلە، تەنانەت گەیشتن بە پایەی مەلایەتی‌یەکی باشیش بۆ هەمووکەس دەست نادات بەتایبەت بەو هەل و مەرج و کەرەسە و کەل‌وپەلەی بۆ فەقێی ولاتی ئێمە هەیە. بۆیە هەروەکی باس کرا، ئەوکەسانەی ناگەنە پلەی ئیجتیهاد، دەبێ بۆزانینی یاسا شەرعی‌یەکان پەیڕەوی لە موجتەهیدێکی ماو یان نەماو بکەن و بە پێی تواناش بڕوانە بەڵگە و قسەکانیان و لێیان ورد بینەوە.

هەروەها پێویستە ئەو خوێندەوارانەی نابنە باش مەلا، لە بەرەی خۆیان لاق تێ‌نەپەڕێنن و چیان لە دەست دێ هەر ئەوە بکەن و بلێن و چ لە فتوادان و دەرس‌گوتنەوە و تەمێ و ئاموژگاری خەڵکدا و چ لە راپەراندنی کار و باری مارەبڕین و تەلاق خستن و میرات بەشکردن و شتی‌وادا. ئەوەی نایزانن و نایتوانن خۆی لە قەرە نەدەن و نەبنە هۆی گوناهباری خۆیان و رێ ونکردن و سەرلێ شێواندن و زیان گەیاندن بە خەڵک.

ئەگەر کەسێک هەر پێشنوێژی لە دەست دێ باپیشەی و تاردان «الخطابە» یان فتوادان «الافتاء»یان شتێکی دی وەستۆی خۆی نەگرێ.

ئەگەر فەقێیەک‌با ئیجازەی مەلایەتیشی پێ‌درابێ‌دەخۆی رانەدی دەرس بلێتەوە، با بەلێنی تەدریس بە خەڵک نەدات، یان بەر لەوەی توانایی تەدریس‌کردنی کتێبێک یان عیلمێکی ببێ با لەو کتێب و عیلمەدا فەقێ رانەگرێ.

ئەگەر پرسیارێکی لێ کرا، یان ڕێنوێنی‌یەکیان لێ ویست، با بەنابەڵەدی و لە ڕووی ناشارەزایی‌یەوە وەڵام نەداتەوە و بابای ڕێنوێنی‌خواز گومڕا و خۆشی گوناحبار نەکات، جایان مۆڵەت بخوازێ و بەهۆی موتالاّ و پرسیار ڕوونی کاتەوە یان ئەوەتا بێ پێچ و پەنا بڵێ نازانم. چونکی هەر وەکی شاردنەوەی زانست «کتمان‌العلم» بۆ زانا، تاوانە، هەروەها جواب‌دانەوەی بە نابەڵەدیش بۆ نەزان کارێکی نارەوایە بەڵکو بەولاتریشەوەیە.

## نازانم ڕەحەتی گیانم

ئەگەر نازانی وەڵامی پرسیار — مۆڵەت بخوازە و ببە دەست بەکار
موتالاّ بکە باسی ئەو دەرسە — واش کە نەتزانی هەڕۆوەپرسە
پرسین بێ‌عەیبە، نەزانین عارە — تازە دوڕاوی چارت ناچارە
یاخۆ نسیبت هەر ئەوەندەیە — وەکوو یەک نییە هەرچی بەندەیە
چوون فەرموویەتی خودایی قەدیم — کە «فَوقَ کُلِّ ذي عِلمٍ عَلیم»
دەناوە خوێنە لە مەڕدەلیلا — و مَا أُوتیتم الا قَلیلا
بەنا بەڵەدی وەڵام مەدەوە — بە «نازانم»ێک لە کۆڵ خۆی کەوە
ئەگەر نایزانی بڵێ «نازانم» — دەڵێن: «نازانم ڕەحەتی گیانم»
وەڵام لە خۆڕا زۆر بێهوودەیە — زمان لێگەڕێ سەر ئاسوودەیە
لەم پیشە پیسە نەکەی بەرگری — باری عالەمێش دەبێ هەڵگری
بەخسووس، بۆ فتوا، ئاگات لە خۆبێ — نەوەک تاوانت لە مل وەکۆبێ
کەسێ، بۆ هەرشت خاوەن جووابە — لای «ابن مسعود» بەشێت حیسابە
«ابن عُیَینە» و «سحنون» دەبێژن — پیاوی فتوا زۆر، کەمزان و گێژن
هەندێک پێشوونە لە ڕووی‌بەرزی‌وە — لە کاتی وەڵام لەشیان لەرزیوە
فریشتە، وتیان: «لا عِلْمَ لَنا» — تۆش کە نەتزانی وا بڵێ دەنا:
تووش دەبی‌بەدرۆ و تێشکان‌لەهەمبەر — یاسای قورئان و خودا و پێغەمبەر(د)
ئیمام ئەحمەد بۆ شتی خیلافی — «لا أدْرِي» کردبۆە، وەڵامی کافی
«مالک» چل و هەشت پرسی لێ‌کراوە — بۆ شازدە دانە وەڵامی داوە

## تویی شەشەم: چەند داب و ڕێ و ڕەسمی گشتی

### ڕۆیشتن:

تەنیا شتێک کە فەقێ جارجارە دڵخۆشی خۆی پێ دەداتەوە و کوڵی دڵی پێ دادەمرکێنی و خەم پەژارەی پێ دەڕەوێنی و یان هەر کاتێک بە هەر هۆیەکەوە لە مامۆستاکەی یان لە یەکێک لە ئاوەڵەکانی دڵی ڕەنجا، یان ئەوەتا لەو ئاوەدانی یە کە تێیدا دەخوێنێ وەڕەز بوو و ویستی دڵی چابکاتەوە و وەڕەزی خۆی بشکێنی؛ ئەوەیە کە شوێنی خوێندن و مامۆستاکەی بەجێ دێڵی و دەچێتە شوێنێکی دی و مامۆستایەکی دیکە پەیدا دەکات و ناچار نییە هەر لەو جێگایە بمێنێتەوە.

پوختەی قسان ئەوەیە کە فەقێ لە هەڵبژاردنی جێ خوێندن و مامۆستادا سەربەستە و دەتوانێ هەرکاتێک بۆ خۆی پێی خۆشبوو یان بە هەر هۆیەکەوە بێ، جێگای خوێندنی یان مامۆستاکەی بگۆڕێ و بۆ ئەم کارە دەتوانی تەنانەت ڕاوێژ[1] دەگەڵ هاوەڵەکانیشی نەکات و ئەو مافە بۆ سوختە و موستەعید وەک یەکە و هەردووکیان تێیدا بەشدارن.

بەجێ یە ئەو ڕاستەقینەش بدرکێنن کە هەرچەند ڕاوێژکردن «الشوری» لە ئایینی پیروزی ئیسلامدا بۆ هەر کارێکی دەق «نص»ی لەسەر نەبێ گرینگی یەکی زۆری پێدراوە و جێگای تایبەتی خۆی بۆ دیاری کراوە، هەندێک لە فەقێکان بۆ مەسەلەی ڕۆیشتن نەیانتوانیوە بە کەس مەشوەرەت بکەن بەتایبەت مامۆستا مەگەر وەختی خواحافیزی دەنا بە هیچ جۆرێک لە ڕۆیشتنی فەقێ ئاگادار نەکراوە. تەنانەت بازە فەقێیەک چ سوختە و چ موستەعید هەر بێ ماڵ ئاواییش ڕۆیشتوون و دەڕۆن.

جا هۆی ئەو دیاردەنا لەبارە هەرچی بێت بەرای من بەشی زۆری تاوان ڕوودەکاتە مامۆستایەکان چونکی تاقمێک لەوان، لە ڕاگرتنی فەقێ دا زۆرتر بەرژەوەندی خۆیان

---

١ - ڕاوێژ: مشورت.

مەبەستە و بۆ نێوبانگ و وەدەستهێنانی پلەی دنـیایی دەرس‌دەڵـێنەوە و ئـیتر ئـەوەندە خێرخوازنین کە دڵسۆزانە و بـە دڵـێکی ئـاوەڵا و سـنگێکی فـراوانـەوە دەگـەڵ فـەقێ ڕووبەڕووبن و قازانجی ئەویش وەبەرچاو بگرن، بۆیە هەتا ئـەو کـاتەی فـەقێ بـەلای خۆیانەوە دەرس‌دەخوێنی، ئەوە ڕێزی بۆ دادەنێن و هەڵی‌دەنێنەوە. بەڵام بە هەر هۆیەک بیهەوێ‌بڕوات ئیتر تـازە لە لایـەن مـامۆستاوە بـە کـەسێکی بـێ‌کـەڵک و نـازیرەک و تێ‌نەگەیشتوو و بگرە وەک ناحەزێک چاوی لێدەکـرێ، جـا بـۆیە فـەقێی ئـەمجۆرە مـامۆستایانە نـاتوانـێ مـەسەلەی ڕۆیـنەکـەی بـدرکێنی و نـاچارە تـەنانەت بـە دزی ئاوەڵەکانیشی‌یەوە بچێت جێگایەکی دی بۆ خوێندن بـدۆزێتەوە و ئـەگـەر وێـرای لە مامۆستا مالاوایی بکات و دەنا هەر بـە دزیـەوە شـتومەکـەکـانی کـە سـەرجـەم پـڕی بوخچەیەکن بپێچێتەوە و بە شانیان‌دادا و وەک دەرکراوان بـە دڵـی غـەمبارەوە بـەرەو خوێندنگەی تازە ڕێگا بگرێتەبەر.

وەکی باس‌کرا ئەوجۆرە بیروبۆچون و هەڵوێستە تایبەتی هەندێک لە مامۆستاکان بووە، دەنا بەشی زۆریان بەتایبەت مامۆستایانی ئێستا ئەو خوو و ئاکارەیان نییە و بگرە هەرکاتێک هەستیان بە وەڕەزی و ناکۆک[1]ی فەقێ کرد پرسیاری لێدەکەن و لە هـۆی نارەحەتی‌یەکەی دەکۆڵنەوە و بە پێی توانا هەوڵ‌دەدەن بۆ چارەسەرکردنی و دەنا ئەگەر پێویست بێ بە هۆی وەڵام و نامەناردنەوە جێگایەکی بۆ دەخوازنـەوە و زۆر بـەڕێز و ئیحترامەوە بەڕێی‌دەکەن و ئیتر پێوەندی دۆستانەشی دەگەڵ ناپچڕن و واهەیە دیدەنیشی لێدەکەن. کە لە مامۆستایەکی دڵسۆز و تـەواو مسـوڵمانیش هـەر ئـەوە دەوەشـێتەوە و چاوەڕوانی دەکرێت.

## جێ‌خوازتنەوە:

فەقێ بەرلەوەی لە جێگای خۆی هەڵقەنی و کۆچ و کۆچبار تـێک‌بنێ، تـەنانەت بەرلەوەش مامۆستا و ئاوەڵەکانی پێبزانن بە بـیانوێکەوە دەچـێ بـۆ سـەفەر و هـەوڵی

---

١ ـ ناکۆک: بێ‌کەیف، ناساز (هەنبانە)

مامۆستا و جێگای تازەی خوێندن دەدات و لە هەر جێگایەک و لە لای هەر مامۆستایەک پێی خۆش بێت و پێی وابێت سوودی لێ وەردەگرێت داوای جێی خوێندن دەکات.

## فەقێ لە لای چ مامۆستایەک جێ دەخوازێتەوە؟

فەقێ بەتایبەت ئەگەر فەقێیەکی وشیار و چاک و چالاک بێ بە هەموو جۆرە مامۆستایەک رازی نابێت بەڵکوو ئەگەر بۆی بگونجێ هەوڵی ئەوەدەدات لە لای مامۆستایەکی باش و بەنێوبانگ و زانا و دڵسۆز و پارێزگار جێ بخوازێتەوە و تێدەکۆشی مامۆستاکەی هەڵگری هەموویان هەندێکی ئەو مەرجانەی خوارەوە بێت:

**١-زانست و زانیاری:**

یەکەم مەرج کە فەقێ وەبەرچاوی دەگرێ و بە پێویستی دەزانی لە مامۆستایدا بێ ئەوەیەکە دەبێ مامۆستا لێهاتوو، باسەوادو شارەزا بێ، بۆ ئەوەی هەرچی دەیخوێنی زۆر بە باشی فێری ببێت و دڵنیابێ کە بە هەڵەی پێ ناگوترێت و کرێرەوەری یەکەی بە خۆڕایی ناڕوات.

هەڵبەت فەقێ زانست و شارەزایی مامۆستا تەنها لەو عیلمانەدا کە بە لایەوە دەخوێنی وەبەرچاو ناگرێ، بەڵکوو بە پێویست و بەجێی دەزانێ کە مامۆستا لە ئاگاداری گشتی «اطلاعات عمومی»یش دا، دەستێکی باڵای هەبێ هەتا بتوانێ جگە لە دەرس، لە هەموو بوارێکی زانست و زانیاریدا کەڵکی لێوەربگرێت و ئاستی زانینی خۆی پێهەڵلابەرێ.

فەقێ واهەبووە مانگێک بگرە زیاتریش بەدوای مامۆستایەکی شارەزا و زانادا خولاوەتەوە، تەنانەت وڵاتی خۆشی بەجێهێشتووە و بە شوێن دەرسبێژێکی زانادا زۆر گەڕاوە و زۆر ناوچەی پشکنیون و لەو پێناوەدا گیانی خۆی خستۆتە مەترسییەوە.

وەک دەگێڕنە لە رابردوودا فەقێی وا هەبووە کە بە شوێن مامۆستا و خوێندندا گەڕاوە، چوارپێنج ساڵان هەر ون بووە و چاوی بە ناوچەی خۆی و نێو چاوانی کەس و کارانی نەکەوتۆتەوە و زۆر وا هەڵکەوتووە پاش گەڕانەوەی، کەس و وارسەکانی نەیانناسیوەتەوە و تەنانەت هەواڵی فەقێیەکەی خۆیانیان لێ پرسیوە!

بەڵێ فەقێ هەوڵدەدا مامۆستایەکی وابدۆزێتەوە، نەک هەر باسەواد و شارەزابێت: بەڵکوو ئەو کتێبەی بەلایەوە دەیخوێنێت جاری‌دیکەش بە دەرس‌گوتبێتی‌یەوە و بە تەواوی لێی سەرڕاست بووبێت و وانەبێ خۆی لەویرا فێربکات.

شارەزایی مامۆستا بێجگە لەوەی کە بەناو و ناوبانگی خۆی و لە ڕێگای باس لێوەکرانی‌را دەزانرێ وەک دەڵێن عەتری چاک بوونی دەروا: فەقێ‌ی واهەیە بەوەندەش بەس‌ناکا و ناکەوێتەوە، بەڵکوو بە هەوەڵین دەرس مامۆستاکەی بە تاقی‌دەکاتەوە و ڕادەی زانیاری و ڕاوێژی زاری بڕێک وە دەردەخات؛ بەم شێوە کە یەک دوو دەرس لەوەی کە خوێندویەتی، بە بیانوی ئەوەی کە نەیخوێندووە یان فێری‌نەبووە، لە لای مامۆستای تازە، بەدەرس دەخوێنیتەوە. یان ئەوەتا چەند جێگای گرانی لەو کتێبانەی خوێندونی‌بە بیانوی ئەوەی کە گرانن و نایانزانی- لێ‌دەپرسێتەوە و بەم‌شێوە هەڵی‌دەسەنگێنی یان پێشەکی بە میوانی دەچێتە حوجرە و سەماعی دەرسی فەقێکان دەکات و بەم‌هۆیەوە ڕادەی زانیاری مامۆستا بە تاقی‌دەکاتەوە.

**٢ـ شێوەی دەرس‌گوتن و فێرکاری:**

دووهەم مەرج بۆ باشی مامۆستا ئەوەیە کە شێوەی دەرس‌گوتنەوە «روش تدریس» بزانیت و بشی‌هێنیتە نێو مەیدانی کردەوەوە.

دەبێ بڵێین بەداخەوە لەبەر لە ڕەسمییەت‌خرانی خوێندنی فەقێیەتێ و تێوەنەڕاونینی دەسەڵاتدارەکانی ڕۆژ لەو خوێندنە؛ شێوەیەکی ڕێک و پێک و تایبەتی بۆ دەرسبێژەکان دیاری نەکراوە و هەر مامۆستایەی بە پێی هەڵسەنگاندن «تجربە» و بۆلوان و سەلیقەی خۆی شێوەیێکی تایبەتی گرتۆتە پێش و ئیشی پێوەکردووە.

بەڵام شێوەیەکی کە بە زۆری مامۆستاکان بۆدەرس‌گوتنەوە دەیگرنە پێش و بە گشتی پەسندکراوە و لە لایەن فەقێیەکانیشەوە بە مەرج وەبەرچاودەگیرێت ئەوەیە کە لە چەند خاڵی دواییدا دەیخەمە بەرچاو بۆ ئاگاداری و بۆئەوەش ئەگەر تەواو و بەکەڵکهاتویە وە بەرچاو بگیرێ و ئەگەر ناتەواویشە تەواو بکرێ:

**(أ) موتالا «مطالعە»:**

مامۆستای دەرسبێژ هەرچەند زاناش بێت و ئەو کتێبە، بە فەقێ‌ی دەڵێت

زۆرجاری دیکەی گوتبێتەوە، بۆ ئەوەی لە کاتی دەرسگوتنەوەدا تێنەگیرێ و تووشی هەڵە نەبێت و مەبەستەکە باش و بە روونی دەفەقێ بگەیەنێ و هەروەها بۆ ئەوەی ئەگەر فەقێ لە پێوەندی دەرسەکەدا پرسیاری لێکرد تێ‌نەمێنی و زوو بتوانی وەڵامی راستی بداتەوە؛ پێش‌ئەوەی بێت بۆ دەرس‌گوتن موتالای تەواوی لە سەر دەکاو واهەیە ئەو مەبەستە لە کتێبی دیش‌دا تەماشا دەکات و لێکی‌دەداتەوە و بە سازی دێتە سەر دەرس و ماموستایەک ئەو خاڵە وەبەرچاو نەگرێ جا بە هەڵە دەرس‌بڵێت یان لە کاتی دەرس‌گوتن‌دا بکەوێتە موتالاً و حاشیە خوێندنەوە، ئەوە فەقێ لێی دەرەونەوە و رووی دەلاناکەن.

جگە لەوەش ئەگەر بێن بۆ لاشی، فەقێ مادام برێ زیرەک و هوشیار بێ دەگەڵی دەکەوێتە کێشە و دەمەدەمێ و چی کتێب هەیە پێی دێنێتە خوارێ و تا قسەکەی خۆی پێ نەسەلمێنی و یان بەڵگەی سەلمێندراوی پێ‌نەهێنینەوە یەخەی بەرنادات و لە کۆڵی نابێتەوە.

برێک ماموستای دوور لە ئینساف و بەدەمار هەن کە وەختێک دەگەڵ فەقێ دەکەونە کێشە بۆ ئەوەی قسەی خۆیان وەسەر خەن، بەڵگەی بەکەڵک نەهاتوو و نەسەلمێندراو دێننەوە و ئەگەر قسەی فەقێیەکە، وەک رۆژی روونیش وابێ لێ‌ی ناسەلمێنن و پێیان شورەیی‌یە وەک ماموستایەک خۆبەدەست شاگردوە بدەن و راکەی بە بەڵگەوە لێ‌وەربگرن.

ئەوجۆرە ماموستا لە راست هەق و ویژدان کەرانە، هەمیشە بۆ وەی خۆیان نەشکێنن فەقێ روشکێن دەکەن و قەت‌قەت نایەڵن شتێکی بەدەستەوە بێت و نەخشێکی هەبێ و مێشک و بیری گوڵ بکات و تەنانەت هەقیشی لێ‌ناسەلمێنن و هەمیشە لە کەلێنێن هەڵەیەک بکا و لێی لە هەرادەن و پێی پێ‌بکەنن و کەیفی پێبکەن.

وەکی گوترا، ئەو خوە پیس و جاهیلی‌یە لە تاق و لۆقی دەرسبێژەکان‌دا، وەبەرچاو دەکەوێ، دەنا بەشی هەرە زۆریان فرە بە ویژدان و دلاوا و بێ‌فیز و خۆ بە کەمگر و هەقخواز و هەقپەرستن، قەت ئێرەیی بە فێربوونی فەقێ‌وە نابەن و ئەگەر دەیان‌جاریش هەڵکەوێ کە قسەی فەقێ لە بەرانبەر قسەی واندا بەراست دەربچێ و رای وان بەرێتەوە پاش بە بێ خۆ لێرە و لەوێدان و پینە و پەرۆ لێی‌دەسەلمێنن و تەنانەت بە پێگوتنی

ئافەرینێک تەشویقیشی دەکەن.

ئەوان کە لە قوتابخانەی ئینسانسازی ئیسلامی پیرۆزدا پەروەردە بوون و خووخدەی ئیسلامی‌یان هەیە، ئاوات و ئامانجی هەمیشەیی‌یان ئەوەیە شاگردەکانیان هەرچی زۆرتر و زووتر لە زانست و زانیاری و تەقوا و پارێزگاری‌دا هەڵدەن و پلەی بالاّتر وەدەست‌خەن و قەت نایانهەوێ و پێشیان رەوانییە فەقێ روشکێن بکەن و بگرە ئەگەر شتێکیشی نەزانی یان بە هەڵە وەلاّمی‌دایەوە بۆی پینەدەکەن و بەجۆرێک کە بە خۆیدا نەشکێتەوە هەڵەکەی بۆ راست‌دەکەنەوە و بە هەموو شێوەیەک، بۆ تێگەیشتن و پێگەیشتنی هەوڵ‌دەدەن.



**بەرێز جەنابی مامۆستا مەلا «علی ربانی» و فەقێکانی لە ئاوایی «بوغدەکەندی» سەقز.**

**ئەم وێنەیە لە رێکەوتی ۱۳۴۵/۷/۲۵، لە نێو باغی پەنا ئاوەدانی گیراوە.**

**(ب) تێکخستنەوەی دەرسی تازە دەگەڵ بەشی خوێندراو:**

مامۆستای دڵسۆز و زانا بە مەبەستی باشتر حاڵیبوونی فەقێ، بەرلەوەی دەستبکا بە دەرسی تازە بەکورتی ئاماژەیەک بە دەرسی رابردوو دەکا و ئەگەر مەبەستەکان پەیوەندییان بە یەکەوە هەبێت بۆی تێکدەخاتەوە، کە بەم هۆیەوە فەقێ هەم دەرسی رابردووی باشتر رەواندەکا و هەم لە دەرسی داهاتووشی چاکتر تێدەگات.

**(ج) وێدانی پوختەی مەبەست.**

یەکی دی لەو دەستورانەی کە پێویستە مامۆستا لە شێوەی دەرسگوتندا بیپارێزی ئەوەیە کە بۆ باشتر لێحاڵیبوونی شاگرد، بەرلەوەی نوسراوەکەی بۆ بخوێنێتەوە و مانای بۆ لێکداتەوە، بە گوشراوی و بە کورتی پوختەی دەرسەکەی لێ حاڵی بکات جا دەرسەکەی پێبڵێت یان پاش تەواوبونی دەرسەکە پوختەیەکی بۆ بڵێتەوە.

**(د) راوەستان لەسەر فەقێ و گوێ بۆگرتنی:**

زۆر واهەیە بە دوای ئەوەدا مامۆستا وێژامەی کتێبەکەی خوێندنەوە و مانای لێکدایەوە، فەقێ بەتایبەتی سوختە بە مەبەستی ئەوە کە فێری دەرسەکەی ببێ یان بۆ ئەوەی بزانێ کە ئایا دەرسەکەی وەرگرتووە یان نا، دەیهەوێ بە شێوەی مامۆستا خوێندنەوەی عیبارەت و لێکدانەوەی ماناکەشی دووپاتە و چەندپاتە بکاتەوە. یان وا هەیە لە مەبەستێک حاڵی نابێ و دەیهەوێ مامۆستا بۆی دووپاتە بکاتەوە واش دەبێ لە پێوەندی مەبەستەکەدا پرسیاری بۆ پێش دێت و دەیهەوێ مامۆستا وەڵامی بداتەوە و ئەگەر گیر و گرفتێکی بۆ پێشهات بۆی بپەڕێنێ. جا لەوجۆرە پێشهاتانەدا پێویستە مامۆستا لە سەر فەقێرا بوەستێ و مەجالی پێبدا و گوێی بۆ بگرێت و ئەگەر پێویستی بە دووپاتکردنەوە بوو، بۆی دووپات بکاتەوە و رێگای پێبدات پرسیاران بکات و وەڵامی پێویستی بداتەوە. وە ئەگەر لەسەر شتێک کێشەیان لێ پەیدابوو و قسە و رای شاگردەکە راست یان لە راستی نیزیکتر بوو لێی بسەلمێنی و پێی شورەیی نەبێت. بە کورتی دەبێ

ڕێگای شاگردەکەی بدات کە پرسیار بکات و ڕەخنە بگرێت و ئیتر ئەگەر فەقێ شتێکی پرسییەوە، نەلێت. جا ئەوە چییە دەیپرسیەوە؟ خۆ زۆر سادەیە!!! چونکو ئەوەی دەیپرسێتەوە با زۆریش سادە و حاسان بێ حەتمەن نایزانێ دەنا بۆ دەیپرسێتەوە؟ جا دەبێ مامۆستا لە هەموو ئەوانە دامافی فەقێ بپارێزی و ئیتر هەر خۆی نەکاتە قسەکەری تەنیا (متكلم وحده).

(هـ) زمانپاراوی:

مەرجێکی دیکەی کە پێویستە لە دەرسبێژدا بێتەدی و فەقێ وەبەرچاوی دەگرێت زمانپاراوی و ڕەوانبێژی‌یە بەم‌شێوە کە مامۆستا لە بەیان‌کردن و ماناکردنەوەی دەرسەکەدا وشە و وێژەیەکی وا بەکاربەرێ کە فەقێ لێی تێبگا و ئیتر لە دەکارهێنانی وتەی نامۆ و ڕستەی نارەوان خۆ بپارێزێ، هەروابێتەوە بە بێ‌تێگیراوی دەرس بڵێ و دووری بکا لە گرێ و گوڵ و سستی و منجەمنج[1] و پێوەنانی و شەو ڕستەی زیاد و بێ‌کەلکی وەک: بەڵێ بەڵێی زۆر، بیلامانی، مەسەلەن، خولاسەی کەلام، لێ‌حاڵی‌بووی؟ دەی کاکە و ئەرێ وەڵلا و ئەوانە!!

سەرەڕای ئەوەش دەبێ درێژەپێدان و دووپات‌کردنەوەی دەگەڵ زەینی فەقێ بگونجێ و نە پێش حاڵی‌بوون لێی تێپەڕێ و نە پاش حاڵی‌بوون درێژەی بداتێ.

(و) دەنگ بەرز نەکردنەوەی لە ڕادەبەدەر:

شتێکی کە دەبێتە هۆی ماندوویی و سەرلێشێوان و زوو وەڕەزبوونی فەقێ لە سەر دەرس، دەنگ هەڵبرینی لە ڕادەبەدەری مامۆستایە لە کاتی دەرس‌گوتن‌دا.

برێک دەرسبێژ هەن هەرچەند فەقێ لە پەنای خۆیانە و ئەگەر بە دەنگی نزمیش دەرس‌بڵێن؛ نەک تەنانەت شاگرد باشتر حاڵی‌دەکەن، بەڵکوو گومان لەوەدا نییە کە خۆشیان و شاگردەکانیشیان ئاسودەتر و بێ‌ئازارتر دەبن؛ کەچی واش هێندە دەنگ بەرز

---

١ - منجە: قسەکردن بە لوت و بە خاوەخاو. فەرهەنگی (خاڵ)

دەکەنەوەکە بۆ خۆشیان زۆر ماندوو دەبن و دەرس خوێنیش زوو شەکەت و وەڕەز دەکەن، جا بۆیە فەقێ هەوڵی ئەوە دەدات کە مامۆستایەک بدۆزێتەوە ئەو خوەی نەبێت.

### ٣ـ پەروەردەکردن و ڕاهێنان بۆ دینداری:

شک لەمەدا نییە کە خوێندن و زانین بۆ دەعەمەل هێنان و ئیش پێ کردنە و عیلمی بێ‌عەمەل بە کەڵکی هیچ کەس نایە و بگرە هۆی بەدبەختی و ژانەسەری دوارۆژە، لە کۆنەوە گوتویانە زانای بێ‌کردەوە، وەک مێشی بێ‌هەنگوینە. هەروەکی پزیشکێک با زۆریش پسپۆر بێ؛ ئەگەر ئەو یاسا و دەستورانەی لەباری پاکی و خاوێنی و لەشساغی و شتی‌واوە دەیانزانی بەکاریاننەبات یان بە خەڵکی یان ڕانەگەیەنێ، هیچ کەڵکێک لە پیشەکەی خۆی نابات و زەحمەتێکی بە خۆڕایی کێشاوە. یان هەروەکی دارتاش یان بەننا، بە تەنها زانینی ئەو ئیشانە ناتوانن سودیان لێ‌ببەن؛ بەڵکوو دەبێ ئامرازی پێویست وەدەست‌بێنن و ئەو زانستەی خۆیان دەکارکەن جا سودی بۆیان دەبێ؛ عیلم و زانستی دینیش هەروەتر؛ ئەگەر بابای کە نێوی خۆی ناوە مسوڵمان، هەموو قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر«د» سەرلەبەر بزانێ بەڵام دەکاریان نەکات ئەوە لە نەزانێکی کە لێیان تێ‌ناگات چارەرەشتر و کۆڵەوارترە.

## زانین و کردەوە

ئەی بەندەی خوای خاوەن بەزەوی — جێ گری خوا لەسەر گۆی زەوی
بە چکەی ئادەم و حەوای، لە ژووری — بە پێی ڕەچەڵەک لە ئاژەڵ دووری
بەڵام بە مەرجێ خوا بپەرستی — دەنا لە ئاژەڵ کەمتری، پەستی
تۆ فێرت دەگەڵ ئاژەڵ بەدینە — بە عیلم و چاک و خراپ زانینە
دەجا بخوێنە، تێ‌بگە، بفامە — وەکوڵە: داخوا بەرپرسیت کامە؟
دەگەڵ ئەو هەموو عیلم و زانستە — بێزار لە خوێندن بێ‌زمان و دەستە
ئەو چاو و گوێیەی خوا بە تۆی داوە — ئەو مێشک و بیرەی بۆتی داناوە

پەڕاوی عاسمان دەفتەری هەستی    دەرفەتی عومرو پیّکرانی دەستی
ئەو زانکۆ و کۆڕ و قوتابخانانە    ئەو دەرسبیّژ و مامۆستایانە
هەموو ئامرازی عیلم و زانینن    گشتیان وەسیلەی خوداناسینن
دیسان فەرمانی خواوەندی زانا    کەوا بناغەی ئیسلامی دانا
لە سەر خویّندن و عیلم و زانیاری،    بیّژەی «اقرأ» بوو، یەکەمجار باری
یا خۆ فەرموویە، تەنها زانایان    لە خوا دەترسن لەوە هانایان
ئەمجار پیّغەمبەر «د» بە واژەی شیرین    فەرمووی بخویّنن بابش چن بۆ چین
یا خۆ بخویّنن بیّ پشوو نۆرە    ماوەی خویّندنیّ بیّشکە تا گۆڕە
بەڵام زانینی تەنها بیّ سودە    دەرد و بەڵایە و کاری بیّهودە
لە میّژە دەڵیّن زانای بیّ عەمەل    داری بیّ بەرە و میّشی بیّ عەسەل
بڕوانە قورئان زانای بیّ کردار    بەچی دەچویّنیّ؟ بە کەری بن بار[١]
یانی وەکوو کەر سوودی بۆ نایە    لەباری کتیّب ئەمیش هەروایە
یان وەک سەگیّکە بیّ دین لە زانا    کە هەر دەهانکیّ دەنگی دەی، یا، نا
ئیّستا، کە نەزان چاتر دەردەچیّ    کە زانای بیّ دین لە سە و کەر دەچیّ
پە ناوە بەر تۆ ئەی پەروەردگار    لە قسەی بیّ عەمەل لە عیلمی بیّ کار
خوایە بۆخاتر پلەی خوداییت    هەم بە عیزەت و توانای بیّ دواییت
ببەخشی پیّمان زانین و عەمەل    ئیمان و ئیخلاس تا کاتی ئەجەل
بەندەنی ساغ و دڵی دوور لە خەم    نانی حەڵاڵ و برایی هەردەم
«بریا» بە بریای خودا بووایە    ئەوەی فەرموتە بمان کردایە
ئەمجار بیّ ئازار، زوو بە دەست و برد    گیانمان ئەسپاردەی عیزرائیل دەکرد
جا بە دەستی پڕ بە هومیدی دڵ    بیّ ترس و خەفەت دەچووینە بن گڵ
وەڵامی قەبرن رەوان دەداوە    تا رۆژی مەحشەر سەرمان دەناوە
قۆناغەکانی سارای مەحشەرمان    دەبڕی سیّبەری خودا لە سەرمان

---

١ ـ هەڵبەت مەبەستی قورئان لەو زانایانەی بە کەر و سەگیان تەشبیە دەکا کەسانیّکن کە باوەڕیان هەر نیە جا لێی وردبەوە.

ڕێمان دەپێوا بەرەو بەهەشتێ     دەستماندەکردە سەیران و گەشتێ
ئێستاش هومێدم بە خودای وایە     بێ ئیمان نەڕۆین لە سەر دنیایە
بۆ ئەو مەبەستە وەرن وریابین     نەوەک گیرۆدەی خۆزگە و «بریا»بین
با ڕوو بکەینە تەقوا و دینداری     دڵ و دەست پاکی، هەم ئەمینداری
مەقامی تەقواش کە ڕاستێت دەوێ     هەر تەنیا بە نوێژ وەدەست ناکەوێ
تەقوا ئەمەیە: بۆ هەرچی ئیشە     ڕازیکردنی خوا بکەیتە پیشە
ڕووناک بێ یا خود ناریکەشەو بێ     پرست بە ئەو بێ ترست لە ئەوبێ
لە لای خەڵک بی یا لە جێگای چۆڵ     بە گەرمای بەتین یا بەسەر ماوسۆڵ
ڕووت و هەژار بی یا خۆ ساماندار     پلە و پایەت بێ یان وێڵ و بێکار
سەرۆکی هۆز بی یا نە، بێ نێو بێ     پیاوی مەجلیس بی یا شوانی کێو بی
زار و پەژار بی یا کەیف خۆش بی     لەش ساغ و بەهێز یا خود نەخۆش بی
لە مزگەوت بی یان لە بازاڕی     خەریکی ئیش بی یا خۆ بێ کاری
وەرزێر و جوتێر یا ئاژەڵدار بی     پیشەزانێک بی یان کرێکار بی
بچیە کاروانی یان دوکانت بێ     یان نا نەزگ بی و جەم و نانت بێ
چەرچی بی یانە داشقەی بگێڕی     یا نەحمباڵی یا خۆ دەسگێڕی
مەلای قوتابی فەقێی نووسەری     شاعیری یا خۆ خاوەن هونەری
گەسک بە دەستی لە شارەوانی     شۆڕشگێڕێکی یان بانەوانی
هەڵسووڕێنەری چاپخانەبی     یان دەرسبێژی قوتابخانە بی
موچەخۆرێک بی کاربەدەستێک بی     وێڵ و عەوداڵی هەر مەبەستێک بی
بە کورتی چبین چکارە و کێ بین     ئاوارە و بێ نازیان لە سەرجێ بین
جحێڵ و لاوبین، یا، کۆنەساڵ بین     لە ناو کۆمەڵدا یا خۆ لە ماڵ بین
لە ڕەفتاری ناو کۆمەڵ و تاکا     لە بەرخوردی گەڵ خراپ و چاکا
دەبێ دیندار و خودا پەرست بین     بۆ بکەومەکەی ئەوگوێ لە مست بین
دەبێ بە زمان و دەر و دەروونمان     بە ئەندامی لەش بە ژین و بونمان
لە یادی خودا قەت غافڵ نەبین     تا بێنازی ناو خانووی گڵ نەبین

بــیر و بــاوەڕ و گــوتە و کــردارن هەموو هەڵوێست و گشتی ئـاکـارن
دەبیّ بـە ویست و رەزای خـودا بـیّ بــیّ ئەملا و ئـەولا و پـیّچ و پـەنابیّ
هەمووئیشیّکمان بە پیّی شـەرع بـیّ هـەولّن بـۆ گـەینی پـلەی وەرع بـیّ
دنــیا بکــەینە وەســیلەی دیــنمان پاشە رۆژ ئامانج بۆ ئـەوبیّ ژیـنمان
دژی زۆردار و دۆســـتی هـەژاربین کــیّ‌ستەمکارە بـۆ ئـەو نـەیار بـین
ئەمجار مـردنمان بـەلەززەت دەبـیّ تیّکەڵ بە خۆشی و بە عیزەت دەبیّ
ریّــــزلیّگیراوی مــەلایک دەبــین لە بــــاتی مــــردن لەدایک‌دەبــین
ئەو کاتی جـەستەن دەبـەن بـۆ قـەبر لە خـۆشی بـەهەشت نـامیّنی سـەبر
لە خەڵکی گـریان لەمـەش پـیّکەنین بـەرابـردومان خـۆشحاڵ و خـەنین

## زانین و فیّرکردن

بیّجگە لەوە کە زانا لە سەری پیّویستە عەمەڵ بە عیلمی خۆی بکا دەبیّ تیّبکۆشی خەڵکیشی لیّ تیّبگەیەنیّ. چونکی لە روانگەی دیـنەوە فـیّرکردن و بـارهیّنانی خـەڵکی بەشیّکە لە عەمەلکردن بە عیلم و لە کردەوە باشەکان «الصالحات» حیسابە کە گوتیشمان عیلم و عەمەل لیّک جیانین و هیچ‌کامیان بە بیّ‌یەکتری کەڵکیان نییە.

بە کورتی ئـەرکی سـەرشانی هـەر ئـینسانیّک ئـەوەیە لە قـۆناغی یـەکـەمدا بـە کەڵک‌وەرگرتن لە چاو وگویّ و ئاوەز بڕوانیّتە «الایات المقروئە» نیشانە خویّندراوەکان و «الآیات المنظورە» نیشانە بینراوەکانی خوای میّهرەبان و زانا و راستی‌یەکان بدۆزیّتەوە و باوەڕیان پیّ‌بیّنی و رەواونارەوا لیّک هەڵاویّریّ و چاک و خراپ بـناسیّ و لە قـۆناغی دووهەمدا بـۆ خـۆی دەکـاریان کـاو لە قـۆناغی سـیّهەمدا خـەڵکیان لیّ‌تـیّبگەیەنیّ و پاریّزگاریشیان لیّبکات.

مەبەست لەو پیّشەکی‌یە ئەوە بوو کە بزانین ئەرکی سەرشانی مامۆستای دەرسبیّژە، کە ویّرای پیّهەڵلابردنی پلەی زانستی شاگـرد دەبـیّ لایـەنی ئـەخلاق و دیـنداریشـی وەبەرچاو بگریّ و تیّبکۆشیّ پەروەردەی بکات بە پەروەردەیەکی دینی، بەر لە هـەموو شتیّک لەوەی حالّی بکا کە فەقیّ بە کیّ دەڵیّن و ئەرکی سەرشانی چییە و بۆچی دەخویّنیّ،

سپەی رۆژی دەبێ چ بکات و چون ئەو دینەی بە خەڵک رابگەیەنێ، رێگای هێنانەوە مەیدانی دین و چەسپاندنەوەی سەر لە نوێی قورئان لە کۆمەڵدا چۆنە؟! لەو پێناوەدا چ کارێک کراوە و چ ماوە بکرێ؟! دوژمنانی ئیسلام و مسوڵمانان کێن و چ پیلانێکیان گێڕاوە و دەگێڕن؟! لە کوێرا دەبێ دەستبەکار بکرێ و بە چ شێوەیەک و...

جا بۆیە دەڵێن مەرجێکی دی لەو مەرجانەی کە فەقێ بۆ باشی مامۆستا وەبەرچاوی دەگرێ ئەوەیە کە نابێ مامۆستا تەنیا هەر گوێ بداتە لایەنی عیلم و زانستی فەقێ، بەڵکوو دەبێ تەنانەت پتر و پێشتر لەو لایەنە، پەروەردەکردنی ئەو لەباری خواناسی و خواپەرستی و ئەرکی راگەیاندن و بانگەوازی‌یەوە وەبەرچاو بگرێت، بۆ ئەوەی وەختێکی لە کۆتایی خوێندندا ئیجازەنامەی دایە، بەس بەڵگە نەبێ لە سەر زانست و زانیاری و تێگەیشتنی، بەڵکوو شاهیدێکیش بێ لەسەر تەقوا و دینداری و پێگەیشتنی.

### ٤ـ دڵسۆزی و فیداکاری:

چوارەم مەرج کە فەقێ بۆ باشی مامۆستاوە بەرچاوی دەگرێ ئەمەیە کە مامۆستا دڵسۆز بێت و دەرسی کەمتر بچوێنێت و بە بێ‌ئەمەی کارێکی گرینگی بێتە پێش و ببێتە هۆی فەوتانی دەرسەکەی کارێکی وا نەکات کە بە بێ‌بەهانە و یان بە بەهانەی کارێکی کە زۆر پێویست نییە دەرسی فەقێیەکە بچوێنی و بەم‌شێوە هۆی دواکەوتنی لە خوێندن و تێپەڕبوونی تەمەنی بە خۆڕایی پێک‌بێنێت.

دەبێ پێ لەو راستی‌یەش بنێین کە مەلای کوردستان لەبەر چەند هۆیەک یان ناتوانن «تدریس» بکەن یان ئەگەر بشی‌کەن ناچارن بازەوەختێکان دەرسی فەقێ بچوێنن و بە قەولی فەقێیەکان بۆ خۆیان دەڵێن دەرسەکانی بەرنە بەر بابی «فات‌یفوت»وی.

ئەو هۆیانەش بریتین لە:

### ١ـ خەریکبوون بە ئەنجامدانی کاری ماڵ:

ئەوەی وەزعی مەلایەتی لە کوردستان بزانێ لێی روونە کە زۆر لە مەلاکان ناچارن

بۆ گەڕان بە دوا پیشەی مەلایەتی‌دا هەردوای ژنهێنان لە دایک و باب و کەس و کاریان جیا ببنەوە و هەتا کاتێک مندالەکانی‌یان بۆ پێدەگەن بە یەکتەنی و پڕکاری ژیان بەرنەسەر. بۆیە مەلا ئەو کارانەی پێوەندیان بە پیاوەوە هەیە چ هی نێومال و چی هی دەرەوەی مال تەنیا لە ئەستۆی خۆنی. جا مەگەر کارێکی کە بە تاقە کەسێک نەکرێ و پێویستی بەگەلە کۆمەگی بێ و خەلکی ئاوەدانی بە هەرەوەز بۆی‌بکەن. یان جێرانێک بە خێری خۆی حەواجێکی بۆ جێبەجێ‌بکات.

## ٢ـ ئەنجامدانی نیش و کاری خەلکی:

لە گشت لایەک روونەکە مەلا بێجگە لە کارەکانی پێوەندیدار بە مەلایەتی وەک پێشنوێژی و وتاردان و تەمێ و ئاموژگاری خەلک و... دەبێ لە زۆر کاری خەلکیش‌دا وەکی شایی و شین و ژن و ژنخوازیی و رێککەوتنەوە و پرسە و سەرخۆشی و سەردان لە نەخۆش و ژنمارەبڕین و... بەشداری بکات.

## ٣ـ هەولی بژیودان:

وەک دەزانین مەلای کوردستان موچە و بەراتی لە لایەن خەلکەوە بۆ دابین‌دەکرێت بەلام لەبەرئەوەی زۆر لە مەلایەکان بە هۆی کەمی دێ و بەرات یان زۆربوونی خێزان و شتی‌واوە بە تەنیا بەرات بە رێ ناچن، ناچارن بۆ پەیداکردنی بژیوی پێویست روو لەملاولابکەن و حوجرە و تەدریس بەجێ‌بێلن.

ئینجا ئەو سێ ـ چوار مەرجانە بە زۆری بۆ ماموستای دەرس‌بێژ وەبەرچاو دەگیرێن. دەنا ماموستا هەر تەنیا بەو مەرجانە بە باش دانانرێ بەلکوو مەرجی دیکەی زۆرمان هەن‌کە پلەی دلسۆزی و ماموستایەتی دەرسبێژ دەبەنە سەرێ و فەقێ ئەگەر بۆی بگونجێ ماموستایەک پەیدادەکات کە ئەو مەرجانە، یان برێک لەوانیشی تێدا هەبن: وەکی ئەوە بە پێی توانا و هەلگرتنی فەقێ دەرسەکە، کەم یان زۆر بکات، لە سەعاتی دیاری‌کراو دابێت بۆ سەر دەرس، لە هەموو بارێکەوە نەسیحەت و ئاموژگاری فەقێکان بکات، بە

یەکچاو لە ورد و چوکیان بڕوانی، لە گوتنی دەرسەکەدا لە رستە و وشە گـەلێک کـەڵک وەربگرێت کە بێ ئیحتیرامی و بێ ئەخلاقی نەگەیەنن.

لە شل و توند رۆیین‌دا رادەی زەوتکردنی فەقێ وەبەرچاوبگرێ، بە باری کەل و پەل و بژیوی حوجرە رابگات و... .

دەمانگووت:

خوێنەری خۆشەویست بڕێک لە ئەسڵی مەبەستەکەمان دوورکەوتینەوە و خەریکە لەبیرمان بچێتەوە کە لە جێ دەدواین بەڵام ئەمانە پێوەندیان بە باسەکەوە هەیە و دەبوو بگـوترێن و لێـرەش‌دا دەچـینەوە سـەر مـەبەست و ئـەگـەر لەبـیرمان بـێ بـاسی جێ‌خواستنەوەمان دەکرد و گوتمان فەقێ بە هەر هۆیەکەوە بیهەوێ جێگا و مامۆستاکەی بەجێ‌بێڵێت بەشێوەیەکی پەنامەکی و بە بێ‌ئەوەی ئەو رازە لەکن کەس بدرکێنی‌مەگەر لە لای ئـاوالێک یـان دۆسـتێکی بـاوەرپێکراوی خـۆی‌دەچێت هـەوڵی مـامۆستایەک و جێگایەکی‌تر دەدات و جا ئەگەر بۆی بلوێ ئەوە مامۆستایەک پەیدادەکات کە هەموو ئەو مەرجانە یان لانی‌کەم هەندێک لەوانی تێدا هەبێت.

لەکاتی جێ‌خواستنەوەدا مەگەر مامۆستا فەقێی‌تری لەلا نەبێت دەنا ئەوکەسەی بۆ جێ دەچێت قەت بۆ خۆی داوای جێ ناکات و بەرلە هەموو شتێک ئەگەر سوختە بێت پرس بە سوختەکان و ئەگەر موستەعیدیش بێت پرس بە موستەعیدەکان دەکات و وەک رێز بۆ دانانێک رەزامەندی‌وان وەردەگرێت و پاشان سوختە بۆ سوختە لە لای موستەعید و موستەعیدیش بۆ موستەعید لە لای مامۆستای گەورە جێ‌دەخوازێتەوە.

جا ئەگەر جێگای پێدرا ئەمجار دەچێتەوە شتومەکەکانی لە بوخچەی گۆرینەوە دەپێچێت و بە شانیان‌دا دەدات و دەیـان‌هێنێت بـۆ جـێی تـازە و لەوێ دادەمـەرزێ و دەست‌دەکات بە دەرس‌خوێندن و ئاواڵ و دوستەکانیشی ئەوانەی لەوێـن پـیرۆزبایی جێگای تازەی پێدەڵێن و ئەوانەش کە دوورن لە شەوێکی پشـوودان «تـعطیل»دا دێـنە دیدەنی و پیرۆزبایی لێدەکەن و ئەویش لەوانەیە لە هەلێک دادیدەنیان لێبکاتەوە.

بەڵام سەرلێدان بۆ پیرۆزبایی زۆرتر بۆ موستەعیدەکانە و ئەوان بۆ پیرۆزبایی‌کوتن

بە ئاواڵی موستەعیدی خۆیان دەچنە دیدەنی، دەنا سوختەکان ئەو کارە سەبارەت بە یەکتر ناکەن.

جاری وا هەیە فەقێ بە بازێک هۆوە بە توندی بڕیاری ڕۆیشتن دەدات و بەرلە پرس و ڕاو جێگا خواستنەوە شتومەکان دەپێچێتەوە و دەڕوات.



**فەقێیەک، بۆ ئاواڵی، لە مامۆستا داوای جێ دەکا**

**حوجرەی مزگەوتی «محمدی» لە بانە**

لەوجۆرە ڕۆیشتنەدا فەقێ بچێتە هەرجێیەک زۆر واهەیە بوخچەکەی نیشانی مامۆستا و فەقێی ئەو جێگایە نادات بەڵکوو لە شوێنێکی نێزیک ئاوەدانی یان لە ماڵێکی قەراغ ئاوەدانی دایاندەنێت و خۆی تەنیا دەچێت وەزعی حوجرە هەڵدەسەنگێنی و جا ئەگەر پێی باشبوو بەوشێوە کە باسمانکرد جێگا دەخوازێتەوە و ئەگەر جێگای پێدرا دەچێت دەستدەداتە بوخچە و دەیباتە حوجرە، یان یەکێک لە فەقێکان دەچن شتومەکەکانی بۆ دێنن.

لە جۆری پێشووشدا کە فەقێ شتومەکەکانی لە حوجرە بەجێدێڵی و پاش

جێ‌خواستنەوە بۆیان دەچێتەوە وا هەیە ئەگەر مەبەستی خواحافیزی و شتی‌وا نەبێ یەکێک لە ئاواڵە تازەکانی بە نامەیەکەوە یان هەر ئاوادەنێری و شتومەکەکانی بۆ دێنێ.

بازێک لەو فەقێیانەی دەم و پەلی جێ‌خواستنەوەیان نییە، یان دەخۆیان رانابینن جێیان پێ‌بدرێ وەکوو بازێک لە سوختە و موستەعیدە تازەکارەکان بە هۆی باب، برا، یان خزمێکیانەوە داوای جێی خوێندن دەکەن و خۆ دادەمەرزێنن.

## بوخچە

ئەوا بۆ چەند جار ناوی بوخچەم برد و ناوەرۆکیشم دەرنەخست کە چییە و چی تێدایە و رەنگە خوێنەرێکی کە بوخچەی نەدیتبێ چاوەڕوانی ئەمە بێ بوخچەی بۆ لێک وەکەین و باسێکی بۆ لێوەبکەین.

جا بۆیە دەڵێم بوخچە پەڕۆیەکی چوار قولیخچکەیە فەقێ لە کاتی رۆیشتن‌دا لەباتی باوەڵ و شتی‌وا شتومەکانی تێوەدەپێچێت و هەروەها لە نێو حوجرەش‌دا لەجیاتی یەغدان و سندووق و شتی‌وا کەڵکی لێ‌وەردەگرێ و هەر کەل و پەلێکی هەیەتی، تێی وەدەپێچێت و لە گۆشەیەکی حوجرە هەڵی‌داوەسێت.

واش هەیە هەندێک فەقێ کە سەرینیان پێ‌نییە لەجیاتی سەرین لە بوخچە کەڵک‌وەردەگرن؛ بەوشێوە کە فەقێ پۆشاکێکی زیادی کە هەیبێت یان بەرگی بەری کە لە کاتی خەوتن دایدەنێت، لە بوخچەکەی وەدەپێچێت و سەری غەریبی لەسەر دەنێتەوە.

ئەوەی راست بێ ئەگەر تەماشایەکی شتوومەک و ئامرازەکانی فەقێ بکەین بۆمان دەردەکەوێ کە هەر بوخچەیان لێدەوەشێتەوە و شتی‌دیکەیان وەکی باوەڵ و یەغدان و ئەوانە لێ‌خەسارە. لەبەرئەوەی بوخچە هەرچەند هەڵماسیاو و رازاوەبێت سوێندیشی بدەی زیاتر لە لێفەشرێک یان پەتۆیەک و چەندکتێب و دەستەبەرگێکی زیادی ئەگەر ببێت و چەند وردەشتی پێویستی دیکە هیچی تێدا نابینیتەوە!![١]

---

١ ـ ئێستا، بوخچە بەرەو نەمان چووە و جێی خۆی داوە بە شتی تازەی وەک: ساک، کارتۆن، تەلیس و شتی وا.

## مامۆستا، چ فەقێیەک رادەگرێت؟

ئاشکرایە کە چینی فەقێ وەک هەموو چینێکی تر هەموو جۆریان تێدا هەیە؛ هەیانە زرینگ و وریا و هۆشیارە، هەشیانە بێ‌مێشک و کەودەن و کۆڵەوارە. فەقێی واهەیە ماندویی نەناس و تێکۆشەرە، ئی‌واش هەیە دەرس‌نەخوێن و لە ڕێ لادەرە. هەندێکیان بە دم و دوو و چەلەنگن بازێکیان بەلەنگاز و بێ‌دەنگن[1] بڕێکیان لە زووەوە بە تەقوا و دیندارن، تێشیان داهەیە کە لەو بارەوە بێ‌مبالات و لاسارن.

بەو پێیە مامۆستای دەرسبێژ تووشی هەموو جۆرە فەقێیەک دەبێت و هونەر و ئازایەتیش لەوەدایە فەقێی دەرس‌نەخوێن و خۆبوێر هان‌بدرێ و ئی‌کەودەن و نازیرەک فێرە خوێندەواری بکرێ و هەروەها ئی بێ‌مبالات و کەمدین پەروەردە بکرێ، بەڵام بە پێی سروشت و ویستی دڵ هەر کەسێک هەوڵی ئیشی ئاسانتر دەدات و ڕێی ڕاست و نزیکتر دەگرێتەبەر، هەر بۆیە بابای دەرسبێژیش چ مامۆستای گەورە و چ موستەعید هەوڵی ئەوە دەدەن فەقێیەک رابگرن و کاری لەسەر بکەن کە هەم لەباری فێرکردن و هەم لەباری پەروەردەکردن و بارهێنانەوە زەحمەتێکی چەندانی نەوێت و بە ماوەیەکی کەم لە هەردوو بواری زانین و دین‌دا سەرکەوێت بێتە سەر گۆڕەپانی خزمەت و راژەی گەل.

ئەو مەرجانەی کە دەرسبێژ لە فەقێ‌دا، وەبەر چاویان دەگرێ بە زۆری بریتین لە: تەقوا و دینداری، زیرەکی و وشیاری، هەوڵدان و فیداکاری، بە نەزمی و لەباری و گوێ‌رایەڵی و بێداری.

بەڵێ هەر مامۆستایەک بۆی بگونجێ هەوڵ‌دەدا فەقێیەک رابگرێ کە ئەو مەرج و تایبەتمەندی‌یانە، یان لانی‌کەم بڕێک لەوانەی تێدابێت. بەڵام لەبەر چەند هۆیەکان وەکی کەمی فەقێ، یان تازەکاری و لەسەرێ نەبوونی پلەی دینداری و زانیاری و فێرکاری مامۆستا، یان چەپەکی و دورەدەستی شوێنەکەی، یان ناخۆشی جێ و ڕێی حوجرەکەی، مامۆستا لەو مەرجانە، چاوپۆشی دەکا و ناچارە هەموو‌جۆرە فەقێیەک رابگرێ، دەنا بێ‌فەقێ و تەدریس دەبێت، چونکی هەروەکی مامۆستا لە فەقێی باش دەگەڕێ فەقێش

---

١ ـ بەدم و دو: وریا لە راگەیاندنی مەبەست‌دا. چەلەنگ: چوست و ئازا. بەلەنگاز بەستەزمان. (هەنبانە بۆرینە)

عەودالی مامۆستای باش و جێ و ڕێی خۆشە.

## پرس و را

ئەگەر فەقێیەک لە لای مامۆستای گەورە جێ بخوازێتەوە واهەیە مامۆستا بەرلەوەی جێی پێبدات لەبەر مەسەلەی ڕەفیقایەتی و بوون و نەبوون و جێ و ڕێی حوجرە پرس بە موستەعیدەکان دەکات، هەروەها موستەعیدیش بۆ جێگا بە سوختەدان، دەگەڵ ئاوەڵەکانی و تەنانەت جاریواهەیە دەگەڵ مامۆستای گەورەش ڕاوێژدەکات.

جا فەقێ کە بە مەبەستی جێ خواستنەوە بچێتە حوجرە جاریوا هەیە بۆ حاڵیبوون لە باروودۆخی حوجرە و ڕادەی زانست و مامۆستایەتی مامۆستا لە جێخواستنەوە پەلە ناکا و ڕازی دڵی نادرکێنی بەڵام هەم مامۆستا و هەم فەقێکان بەشێوەی دانیشتن و قسە و ڕەفتاری لێی حاڵیدەبن و دەزانن لە چ دەگەرێ و بەرلەوەی بە ڕاشکاوی داوای جێبکات ڕاوێژدەکەن و بریاردەدەن. جا ئەگەر داوایکرد جوابی پێویستی دەدەنەوە.

## ماڵاوایی خواستنی فەقێ

فەقێ بە هەر هۆیەکەوە بڕوات بە مەرجێ بێ دڵئیشی و بە ئاشکرا بێ لە مامۆستا و ئاواڵەکانی ماڵاوایی دەکا و گەردنی خۆیشیان پێ ئازاددەکات و ئەوانیش لە بەرانبەردا دوعای بەخێری بۆدەکەن و داوایلێدەکەن گەردنیان ئازادبکات.

ماڵاوایی کردنیش چەند شێوەی هەیە: یان ئەوەتا خۆی شتومەکەکانی دەبات کە لەم شێوەدا ڕۆیشتنەکەی ئاشکرا دەبێ و ڕاستەوخۆ ماڵاوایی و گەردنئازایی دەخوازێت. یان بە بیانوێکەوە دەڕوات بۆ سەفەر و جێگا دەخوازێتەوە و یەکێک لە فەقێکان دەچێت شتومەکەکانی بۆدێنێ و تازە بۆ خۆی ناچێتەوە حوجرەی پێشوی کە لەم شێوەدا بە هۆی نامەیێکەوە ڕێی و ڕەسمی خواحافیزی و گەردنئازایی جێبەجێدەکات.

چ موستەعید چ سوختە ئەگەر ڕۆینەکەی ئاشکرا بوو، لە لایەن مامۆستاوە هۆی

ڕۆیشتنەکەی لێدەخوازن و لێی‌دەپرسن لەبەرچی دەڕوات بۆ ئەوەی ئەگەر گلەییەکی چارەهەڵگری ببێت پێشگیری لە ڕۆینەکەی بکەن و هەروەها بۆ ئەوەش لە کەموکوڕی خۆیان و گیروگرفتی حوجرە و ئەوانە حاڵی ببن و خۆیان ڕێک بخەن. فەقێش ئەوەی کە پێی بەجێ و بەکەڵکهاتووبێ پێی‌لێدەنێ و دەیدرکێنێ.

هەڵبەت هۆی ڕۆیشتنی فەقێ هەمیشە بوونی گلەیی و کەموکوڕی نییە، بەڵکوو جاری واهەیە لەبەر زۆر مانەوەیان هەر شتێکی‌تر، وەرەزی و بێوازی ڕوی‌تێدەکا و ئیشتیای خوێندنی نامێنێ و بە مەبەستی ساریژ بوونەوەی توانای خوێندن و تازەبوونەوەی ئیشتیا، ئەو شوێنە بەجێ‌دێڵێت.

دوایین قسە لێرەدا ئەمەیە کە موستەعید لە کاتی ڕۆیشتن‌دا هەرچەند سوختەی بەلاوە هەبێ ئەگەر بۆ خۆیان وازیان لێبێ، دەگەڵ خۆیان دەبات. جا بۆیە دەبێ لە کاتی جێ‌خواستنەوەدا باسی ئەمانیش بکا، داخوا جێگایان دەبێتەوە یان نا. جا ئەگەر ئەوانیش لەباری خواردەمەنی و جێ و ڕێوە حەوانەوە باشە، دەنا دەبێ موستەعید هەر لەو حوجرەی کە لێی دەڕوات یان لە هەر حوجرەیەکی‌تر دەرس و جێگای خوێندنیان بۆ پەیدا بکات بۆ ئەوەی سەرگەردان و بێ‌دەرس نەمێننەوە.

## دەرکران

دەبێ دان بەوەش‌دا بنێین کە فەقێ، مانەوە و ڕۆیشتنی تەنیا هەر بە دەست خۆی نییە. واتە وا نییە کە خووخدەی هەرچلۆنێک بێت و لە خوێندن‌دا تێبکوشێت یان نا، ئەرکی سەرشانی ئەنجام‌بدا، یان خۆی لێ‌ببوێرێ؛ کەس لە سەری نەبوڵێنی و ڕەخنەی لێ‌نەگرێ، نەء. بەڵکە ئەگەر لە دەرس‌خوێندن‌داکەمتەرخەم بێت یان ڕەوشت و ئەخلاقی ئیسلامی ڕەچاو نەکات، یان ئەرکی سەرشانی بە تەواوی بەڕێوە نەبات. چ سوختە و چ موستەعید ماموستا مافی ئەوەی هەیە دەری‌بکات و نەهێڵی لە حوجرەدا بمێنێتەوە. بەڵام ئەو دەرکردنە پاش ئاگادار کردنەوە و سەرکۆنە و ئامۆژگاری کردنیەتی. دەرکردن وەک سزادانێک بۆ فەقێ دانراوە و بۆ ئەوەیە تەمێ ببێ و کەم‌وکوڕی‌یەکانی لە هەر بارێکەوە وەلابنێ و تەمەڵ و نەزان و بێ‌ئەخلاق بارنەیەت.

## چای شیرینی ئاکام تاڵ

فەقێی دورە کام واهەیە بێ‌پێچ و پەناو بە راشکاوی دەردەکرێ واش هەیە بە چایی‌یەکی شیرین لە مەبەست حاڵی دەکرێ. بەم‌شێوە؛ ئەگەر بریاری دەرکرانی درا، بۆ ئەوەی شتەکە برێک رواڵەتی شۆخی بە خۆیەوە بگرێت و سەیرێکی لێ‌پەیدا بێت و لە ئاکام‌دا سزادانێکی گیانی فەقێش بێت کە دوای ئاگادارکردنەوە و ئاموژگاری کردن تەمێ نەبووە و هەروەک خۆی ماوەتەوە، لە لایەن مامۆستاوە بە چایی تێکەر دەستوور دەدرێت کە بە بێ‌ئاگاداری ئەو، چایی‌یەکی بۆ شیرین بکا و چایی‌گێڕیش لە پێشی‌دا بنێت، فەقێی بێچارەش بە لێدانی هەوڵ قوم لە خۆی حاڵی دەبێ و هەرچۆنێک بێ تازە، چایی‌یەکە تەواو دەکات. جا ئەگەر زۆر خۆڕاگر و بەورە نەبێت خەجاڵەت دەبێتەوە و کە سەر دایدەگرێت. چونکی ئەوان پێی پێ‌دەکەنن و گاڵتەی پێدەکەن، دەنا دەگەڵ وان دەست دەکات بە پێکەنین و زۆر وەسەرخۆی نایەنێت و لەوکاتەڕا لە هەوڵی پەیداکردنی جێگەی خوێندن‌دا دەبێت.

ئەما دەرکردنی بە چایی‌شیرین زۆرتر بۆ سوختەیە و مامۆستای گەورە ئەو کارە سەبارەت بە موستەعید ناکات، مەگەر رەفیقەکانی بە مەبەستی شۆخی و جەفەنگ شتێکی ئاوابکەن.

لەبەر ئەوەی راگەیاندنی مەبەستێک بە شێوەی بریتی «کنایە» رەساتر و شوێن‌دانەرترە لە شێوەی راشکاوی «صراحت»، بۆ دەرکرانی فەقێ بەتایبەت بۆ دەرکردنی سوختە لە بریتی زۆر کەڵک وەر دەگیرێت.(١)

---

١ ـ دەگێرنەوە جارێکیان لە حوجرەیەک بریاری دەرکردنی سوختەیەک دەدرێت و مامۆستا دەستوور دەدات کە بە بێ‌ئەوەی هەست پێ‌بکا شتومەکەکانی بۆ بپێچنەوە و بیانبەنە ماڵێکی دوور لە حوجرە، هەتا بۆ خۆی پێ‌دەزانێ و لێ‌حاڵی دەبێت و دەڕوات.
بەڵێ بە دەستووری مامۆستا ئەوکارە دەکرێت. بەڵان وەختێک فەقێکە پێ‌دەزانێ لەبەر سادەیی و ساویلکەیی خۆی لە مەبەستی مامۆستاکەی حاڵی نابێ و لە کینایە و شتی‌وا تێناگات و دەڵێت: جا مامۆستا ئەوەی بۆچیە؟ بۆ بە
[illegible]

## مەلایەتی لە فەقیَیەتیدا

زۆربەی فەقیَیەکان لە مانگی رەمەزانداکە پشوودانە و دەرس ناخویَندریَ دەچن لە جیَگایەک مەلایەتی دەکەن.

ئەو مەلایەتییە بۆ تیَکرای سوختە و موستەعیدانە و هەرکام لەوان بڕیَک شتی پیَویست لە قەدەر ئەو مانگە بزانن وەکی دەستوراتی پیَشنویَژی، جومعە و جەماعەت، وتاری رۆژانی هەینی و رۆژی جەژن، ئادابی نویَژی تەراویَح و ئامادەکردنی مردو و ناشتنی و ئەوانە بزانیَت مەلایەتی رەمەزان دەکات.

بۆ مەلایەتی رەمەزان بەتایبەت وەختیَک دیَی بیَمەلا کەم هەبن فەقیَ دەبیَ زوو وەخۆکەویَ و واهەیە دوو مانگ بەر لە هاتنی رەمەزان هەولَی جیَی مەلایەتی دەدات.

هەندیَک لەو دیَیانەی بیَمەلان هەر بە نزیکبوونەوەی مانگی رەمەزان خۆیان هەولَی مەلا دەدەن و دەچنە لای مەلا دەرسبیَژەکان و بەلَیَنی ئەوەیان لیَوەردەگرن کە مەلا رەمەزانیَکیان بۆ بنیَرن.

جاریواش هەیە مەلا خۆی وەلاَم دەنیَریَ بۆ خەلَکەکە سەبارەت بە ناردنی فەقیَیەک بۆیان هەتا دلَنیا بین و بەلَیَنی بە کەس نەدەن.

دامەزرانی مەلا رەمەزان دوو جۆرە: یەکەم ئەوەیە فەقیَیەکە دەلَیَ ئەو مانگەی دیَمەلاتان و ئەرکی مەلایەتیتان بەخیَراخۆم بۆ ئەنجام دەدەم و ئیتر داوای موچە و بەرات ناکا و خەلَکەکەش بیَقەرار و بڕیار سەرفترەی دەدەنیَ.

جۆری دوهەم ئاوایە کە فەقیَ لە بەرانبەر زەحمەتی ئەو مانگەدا داوای نەختە دراویَک دەکا و ئەوانیش هەر مالَەی ئەندازەیەکی بۆ دادەنیَن و وەختی خۆی خڕی دەکەنەوە و دەیدەنیَ بۆ سەرفترەش دەتوانن بە بیَبڕیار بیدەن بە هەرکەسیَک پیَیان خۆشبیَت بەلاَم بە زۆری سەریان هەر بە مەلاچاک دەکەنەوە.[1]

مەلایەتی رەمەزان بۆ خەلَکیش و بۆ ئەو فەقیَیەش سوودی زۆرە. جاریَ بۆ خەلَک

---

١ - دیَی واهەیە بە هەر هۆیەکەوە بیَ تەنیا بۆ جیَبەجیَکردنی ریَ و رەسمی جەژنەکان بە دوای فەقیَدا دەچن کە بەو فەقیَیەش دەلَیَن مەلاجیَژن.

قازانجی ئەوەیە کە ئەو دێیە لەوانەیە لەبەر کەمی ماڵەکان قەت مەلای یەکجاری‌یان پێ‌رانەگیرێت و لە ئاکامدا لە ڕێنوێنی ئایینی و فێربوونی دەستوراتی دینی بێ‌بەش بن، بەڵان فەقێ لەو مانگەی‌دا سەرەڕای پێشنوێژی و وتاری هەینی و یاسین و تەڵقین و بانگ و سەڵا و نوێژی تەراوێح و جەژن و ئەوانە. ئامادەیە «موعظه»شیان بۆ بکا و لەباری ئایینەوە ئەوەندەی لەدەستی‌بێ ڕێنوێنیان بکا و دیسان بۆ هەموو کارێکی دیکەی پێوەندی‌دار بە مەلاوە ئامادەیە.

بۆ فەقێش قازانجی ئەوەیە کە لە لایەکەوە مەشق «تمرین» کردنێکە بۆ کاتی مەلایەتی یەکجاری و خۆی پێوە رادێنێت و لە لایەکی دیشەوە بژیوێک بۆ خۆی پەیدا دەکات و لە پێویستی‌یەکانی وەک کڕینی بەرگ و کتێب و کرێی ڕێیە و ئەوانەی خەرج‌دەکات.

مەلای ڕەمەزان خواردن و جێ و ڕێشی هەر لە سەر خەڵکی‌یە و هەر شەوەی ماڵێک بەربانگ و پارشێو، بانگهێشتنی دەکات. جێ‌ی دایمیشی یان مزگەوتی ئاوەدانی‌یە یان ئەوەتا وەتاغێکی بۆ تەرخان دەکەن بۆ جێگای خەوتن و موتاڵاکردن.

مەلا لەبەر سەڵاکردنی پارشێو دەبێ شەوانە بەخەبەر بێ و پارشێویش سەڵا دەکا و بە کوتانی تەپڵ و خوێندنەوەی شێعر لە سەربانان خەڵکی وەخەبەردێنێ. مەلا لە دانیشتنی شەوانەدا وا هەیە بە تەنیایە و واش هەیە تاقمێک لە لاوەکانی ئاوەدانی دەگەڵی بەخەبەر دەبن و لە سەڵاکردنیش‌دا یارمەتی دەدەن و بەتایبەت لە شەوەکانی قەدر «لیالی‌القدر»دا زۆرێک لە خەڵکی دەگەڵی دادەنیشن.

## کار و بەرنامەی شەو و ڕۆژی پشوودان

لە ڕۆژەکانی حەوتودا دوو ڕۆژی سێ‌شەممە و هەینی بۆ پشوودان «تعطیل» دیاری کراون، کە پشوودانی ڕۆژی هەینی لایەنێکی ئایینی هەیە و باش وایە هەموو مسوڵمانێک بە مەبەستی دینداری و تەقوای زیاتر و بەشداری‌کردنی ڕێک‌وپێک‌تری ڕێ و ڕەسمی نوێژی هەینی و هەروەها بە مەبەستی حەسانەوە و هێنانە دی مافی گیان و لەش «حـق

النفس و البدن» و ئەنجامدانی سیلەی روحمێ، هەر ئیشێکی هەیەتی وەلای بنێ.[١]

بەلام پشوودانی رۆژی سێشەممۆ ئەوەندەی من بزانم لایەنی دینی نییە و تەنها فەقێ و مەلایەکان بۆ راگەیشتن بە ئیش و کاری جیا لە دەرس‌خوێندن و دەرسگوتن و هەروەها بۆ حەسانەوە دایان‌ناوە.

هەرچی بێ فەقێ لەو دوو پشوودانانەی حەوتووداکاتی خۆی بە شێوەی خوارەوە بەرێوە دەبات و ئەو ئیشانە ئەنجام دەدات:

**١ـ راگەیشتن بە پاک و خاوێنی لەش و جل و بەرگ«النظافة»:**

گوتمان لە هەندێک شوێن مجێوری فەقێیان جگە لە شوشتنی هەوڕ و هۆڵ و خاوێن‌کردنەوەی ژور و دەرک و بانی حوجرە، جل و بەرگی فەقێیەکانیش بەتایبەت هی موستەعیدەکان دەشوات. ئەمما لەو شوێنانەی فەقێ مجێوری تایبەتی‌یان نییە، یان ئەو ئیشەی پێ‌نەسپێردراوە دەبێ فەقێیەکان بۆ خۆیان جل و بەرگی خۆیان بشۆن. جاوەکی گوترا تا بیست سی ساڵێک لەمەوبەر سوختە ناچار بووە شیو وکوڵ بۆ موستەعیدەکانیش بکات. بەلاّن ئێستا، مەگەر لە رووی رێز و پیاوەتی‌وە دەنا هەرکەس دەبێ شیوی خۆی بۆ خۆی بکات.[٢] زەمانی پینە و پەڕۆیان کەمەکینەی بەرگدروویی هەر نەبوو، فەقێ پینە و پەرۆ و لیباسدروونەوەی لە ئەستۆی خۆی بوو، فەقێیەکان هەمیشە دەرزی و دەزویان

---

١ ـ دروست و بە جێیە، رۆژی هەینی دەرس گوتن و دەرس خوێندن تەحتیل بکرێ. چونکو ئەو رۆژە جەژنە و دەستوور دراوە بە خۆ خاوێن کردنەوە لە چلک و بۆنی ناخۆش و زوو چوونە مزگەوت و پارانەوە، تا ئاوا بوونی رۆژ، بە هیوای توش بوونی ئەو دەمەی پارانەوەی تێدا گیرا دەبێ. هتد. فتواکانی «ابن حجر» وە لە کتێبی «الایعاب»دا هاتووە کە حەزرەتی عومەر (خ) ماوەیەکی زۆری لە سەفەر پێچوو و خەڵکی زۆری تامەزرۆ بوون و کاتێک گەرایەوە بۆ مەدینە، بە پێشوازیەوە چوون و لە پێش هەموانیش‌دا منداڵەکانی کەلاسی قورئان پێی گەیشتن و ئەویش لە پاداشی ئەوەدا بریاری‌دا: کەلاسی قورئان لە نیوەرۆی رۆژی پێنجشەممۆرا هەتا رۆژی شەممۆ تەحتیل بکرێ و دۆعای کرد لە وکەسەی ئەو یاسایە تێک بدات.

«بغیة المسترشدین» ل ٨٣ باسی سوننەتەکانی هەینی.

٢ ـ لە دەورانی سوختەیی من‌دا شیوکردن بۆ موستەعید لە زۆر شوێنان وەک ئەرکی پێویستی سەرشانی سوختە چاوی لێدەکرا.

دەگەڵ خۆیان دەگێڕا و ئیشی خۆیان پێ ئەنجام دەدا. جا مەگەر پینە و پەڕۆیەکی وا کە سەریان لێدەرنەچوبا کە ئەمەیان ـ ئەگەر دەستیان وە ماڵی خۆیان رانەگەیبا ـ دەسپاردە مجێور یان ئافرەتێکی دیکەی خێرخوازی ئاوەدانی.



**فەقێیەکان شیو دەکەن «حەمامیانی بۆکان»**

**٢ـ خوێندنەوەی «القصیدة البردیة»:**

بەمشێوە کە دوا بە دوای تەواوبوونی جەمی شێوان و نوێژی جەماعەتی خەوتنان، فەقێیەکان خڕ دەبنەوە سەریەک و کەسێک یان دوو کەس لەوان کە دەنگیان خۆش بێ شێعرەکانی قەسیدە دەخوێننەوە و ئەوانی دیش تێکڕاو یەکدەنگ بە سەربەندی «مَولای صلّ» لەبەریان دەگێڕنەوە و بەمشێوە یەک ـ دوو بەند دەخوێندرێنەوە؛ پاشان بە خوێندنی دوعـایەک کـۆتایی پـێ دێت.[1] لە خـوێندنەوەی قـەسیدەدا مـامۆستای گـەورەش

---

١ ـ قەسیدە سێ پارچە هۆنراوەی ئیمام «محمدالبوصری»یە یەکیان بە ناوی «بردة المدیح» یان «القصیدة البردیە»یە کە دەبەندە و بەریز باس‌دەکەن لە ١ـ غەزەل و سکاڵای ئەوینداری ٢ـ پرینگاندنەوە لە ئارەزۆی نەوس. ٣ـ پەسنی پێغەمبەر «د». ٤ـ لەدایکبوونی پێغەمبەر «د». ٥ـ کشگێرەکانی پێغەمبەر«د» (معجزات النبی). ⇦

جاری‌واهەیە خۆی تەنیا، یان دەگەڵ چەند کەس لە ئەهلی مزگەوت کە لەگەڵیا دێن بۆ حوجرە، بەشداری دەکەن و فەقێیەکانیش بە چایی یان بە شەوچەلە پەزیرایی‌یان لێ دەکەن.

## ٣ـ بەکتێبدا چوونەوە:

فەقێیەک کە لە ڕۆژەکانی دەرس‌خوێندندا، لە کاری دەرس و دەور، پاش کەوتبێ، یان هەر زۆر بە هەوڵ و تەقالا بێ و بیهەوێ زیاتر خەریک بێ لە کاتەکانی پشوودانیش کەڵک وەردەگرێ و بە کتێباندا دەچێتەوە و تاودەداتە کتێب و دەرس و دەورکردنەوە.

## ٤ـ جزوبەند و شیرازەکردنی کتێب «صحافی»:

وەک باسمانکرد زەمانی پێشوو، کتێب و چاپەمەنی لەوپەڕی کەمی‌دا بووە، هەر بۆیە فەقێیەکان ناچاربوون پارێزگاری‌یەکی زۆر لە کتێبەکانیان بکەن و کۆنە کتێبان بە پینە و پەڕۆ، قەیار بکەنەوە. جا یەکێک لە ڕێگەکانی پارێزگاری بریتی بووە لە جزووبەند و شیرازەکردن. کە جزووبەند بریتی‌یە لە بەیەکەوە دروونی پاژ «جزء»ەکانی کتێب بە هۆی گشتەک و سیرمە و شتی‌واوە. هەروەها شیرازەش ئەوەیە کە پاش ئەوەی کتێبەکە جزووبەند کرا ئەمسەر و ئەو سەری بنەکەی بە داوێکی جوانی وەک ئاوریشم یان مەرگە بچندرێ کە ئەو کارە سەرەڕای قایمبوونی کتێبەکە و پێشگیری‌کردن لە، لەبەریەک

---

⇦ ٦ـ گەورەیی و پەسنی قورئانی پیرۆز. ٧ـ شەورەوی پێغەمبەر (الاسراء). ٨ـ شەڕی چەکداری پێغەمبەر «د» (الجهاد). ٩ـ دەستەودامێن بوون بە پێغەمبەر «د» (التوسل بالنبی ص). ١٠ـ پارانەوە.

لەم پارچەیان خۆی لە ئاخرەمین شێعردا فەرموویەتی سەد و شێست شێعرە بەڵام ئەم چاپانەی کە ئێستا بەدەستەوەن بە بژارتە دەکەنە سەت‌وشێست و حەوت شێعر.

دووهەمیان «القصیدة‌المضریه»یە و چل و یەک شێعرە و ناوەرۆکەکەشی سڵاوەت دانە لە سەر پێغەمبەر و پارانەوەیە.

سێهەمیشیان «القصیدة المحمدیه»یە کە شانزە شێعرە و لە مەحتی پێغەمبەردایە «د».

ئەم سێ قەسیدەیە لە زۆربەی بۆنە و ئاهەنگەکاندا وەکی مەولودی و نێوڵێنانی منداڵ و جەژنی کۆری ئیجازە وەرگرتن و... دا پاش قورئانی پیرۆز بە شێوەی سەرەوە دەخوێندرێتەوە.

هەڵوەشانی دەبێتە هۆی جوانی و پەسندیشی.

ڕێگایەکی دیکەی پارێزگاریکردن لە کتێب ئەوە بووە کە کتێبی دڕاو و پەڕپووت و لەبەریەک هەڵوەشاویان بە هۆی نوسەک «چەسپ» و سریش و ئەوانە چاککردۆتەوە.

کارێکی تری کە لەسەر کتێبەکان کراوە بێجگە لە نووسینەوە و خۆشکردنیانکە لە پێشەوە باسکرابریتییە لە ڕەنگکردنی کتێبی پەرسپی بە ڕەنگی زەرد و قاوەیی، بە کەڵک وەرگرتن لە زەردەچێوە و شتیوا.

هۆی ئەو کارەش ئەوەیە کە بە بڕوا و ئەزموونی فەقێیەکان ڕوانین بە سەر کتێبی پەرسپیدا زیانی هەیە بۆ چاوان و ماندویان دەکات، بە پێچەوانەی ڕەنگی قاوەیی یان زەرد. کە ڕەنگە ئەو مەسەلە بگەڕێتەوە سەرکەمی و زۆری نووری پەرەکان بە هۆی بوون و نەبوونی ئەو ڕەنگانەوە.

### ئامرازی مەنگەنە

دوا قسەی پێویست لەو باسەدا ئەوەیە کە بۆ بەشی زۆری شێوەکانی کتێب چاککردن لە ئامرازی مەنگەنە کەڵکوەردەگیرێ، کە مەنگەنەگیرەیەکە پێکهاتووە لە دوو تەختەداری قایم و دوو پێچ و مۆرە، کە لە کاتی کارپێکردندا کتێبەکە دەخرێتە ناو هەردوو تەختەکە و بە هۆی پێچ و مۆرەکەوە تەختەکان بە یەکەوە دەگوشرێن و بەمشێوە کتێبەکە توند و ڕاست ڕادەگیرێ بۆ کار لە سەرکردن و ئیشک بوونەوە و ئەوانە.



**ئامرازەکانی کتێب چاکردن**

**٥ـ سەفەرکردن و دیدەنی:**

بۆ پێشگیریکردن لە فەوتانی دەرس، هەر سەفەر و دیدەنی و وەدەرکەوتنێک هەبێ بۆ کاتەکانی پشوودان هەڵدەگیرێ.

**٦ـ شەڕە پرسیار:**

شەرەپرسیار ئەوەیە کە دوو کەس یان دوو تاقم لە فەقێیەکان بۆ پرسیارکردن دە بەریەک رادەچن و لە هەموو بابەتێکی خوێندراو پرسیاران لێکدەکەن تالایەکیان لایەکی دەبەزێنییان وەڕەز دەبن.

ئەو کارە کە زیاتر لە شەو و ڕۆژی پشووداندا ئەنجام دەدرێ قازانجی زۆرە و دەتوانین بڵێین جێی تاقیکردنەوە «امتحان»ی ڕەسمی دەگرێتەوە و فەقێیەکان هاندەدات بۆ هەوڵ و تێکۆشانی زیاتر و پترملدانە خوێندن.

وەکی باس‌دەکەن شەڕە پرسیار لە رابردوو دا زۆرتر بووە و تەنها هەر فەقێی حوجرەیەک خۆبەخۆ ئەنجامیان نەداوە، بەڵکوو لە شەوانی پشووداندا بە میوانی‌چوون بۆ لای یەکتر و وێرای سەردان و دیدەنی‌کردن بارنامەی شەڕە پرسیاریشیان هێناوەتە گۆڕێ و لە راست یەکرا هاتوون.

دەستە فەقێیەک، ویسبێتیان بچن بۆ شەڕە پرسیار دەگەڵ فەقێی حوجرەیێکی‌تر هەر ئاوا بە سادە و ساکاری و بێ‌خۆ تەیارکردن ملیان پێوە نەناوە؛ بەڵکوو وەک دەستەیێکی نیزامی کە دەچن بۆ شەڕ دەگەڵ دوژمن خۆیان ساز و ئامادەکردووە. بەمشێوە کە لە ناو کتێبەکان گەڕاون و چ مەسەلە و بەست و مەبەستێک سەخت و چەتوونە دۆزیویانەتەوە پرسیار و وەڵامەکانیان لەسەر ئامادەکردووە و ئەمجار بە سازی بەرەو شەڕگەکەوتوونە رێ.

کاتێک قۆڵە فەقێیەک میوان بووبن لە پێشدا پرسیارکردن مافی وان بووە و فەقێیەکانی خانەخوێ وەک رێزلێگرتنێک هەتا ئەوان پرسیاریان نەکردوەبشیان زانیبێت بۆ شەڕی پرسیاران هاتوون‌هیچیان نەپرسیوەتەوە. جا ئەگەر میوانەکانیش هەر بێدەنگ بووبن ئەوە دنەیان داون و پێشنیاری بەرنامەی پرسیار و وەڵامانیان پێ‌کردوون و ئەمجار بەرەوڕووی یەک وێستاون و شەڕیان گەرم داهێناوە و هەردوک دەستە کەڵکێکی زۆریان لەو شەرە ئاخیرخێرە وەدەست هێناوە.

هەرچەند لە راستی‌دا شەڕە پرسیار و باس و کێشە و دەمەدەمێ لە سەر شتێک دەبێ بە نیازی روون بوونەوەی ئەو شتە بێ و بۆ ئەوەبێ ئەو کەسانەی لە شتەکە دەدوێن یان تەماشاکەری دوانەکەن کەڵک وەربگرن و ئەوەی دەیزانن بە یەکتری بڵێن. بەڵام بەداخەوە وەکی باس‌دەکەن زۆر وا هەبووە شەڕە پرسیار بە مەبەستی شکاندنی لایەنی رووبەروو و بۆ خۆ هەڵکێشان و نیشاندانی رادەی زانیاری خۆ بووە.

وەک دەگێڕنەوە شەڕە پرسیاری زەمانی زوو زۆر جاران سەری کێشاوەتە سەر شەڕەکوتەک و دوژمنایەتی‌یەکی زل، لە ناودا پەیدا بووە و مەترسی‌یەکی زۆر کەوتۆتە ئاراوە و هێمنایەتی و ئاسایشی حوجرە جێی خۆی داوە بە ترس و نائەمینی. چونکی لە وەها کاتێک فەقێکان خۆیان بە چەکی سارد و گەرم تەیارکردووە و هەر نەبێ بیور و

**تەوراس و کەچە خەنجەریان لە لای خۆیاندا ناوە!!!**




**فەقێیەکان خەریکی شەڕە پرسیارن**

جاری‌وا هەبووە دوو قۆڵە فەقێ کە لە جومعانەی دەرەوە گەڕاون، تیکهەڵەنگوتون و دەستیانکردوە بە شەڕە پرسیار و لەناو خۆشیاندا مەرجیان بەستوە کە هەر لایەکیان بەزین ئەوکەل و پەلەی لە جومعانە خڕیان کردۆتەوە خڕی بدەن بە لایەکەی‌تر و بە شکاوی و تـالانکراوی بـەرەو حـوجرەی چـاوەڕوانـی ڕۆن و قـەند و چـایی ڕەوان بـبنەوە و دەفروتورەکەکانی جومعانە بە بەتاڵی بە سینگەکانی دیواری خێچ و خواری حوجرەدا هەڵواسنەوە.

شەڕەپرسیار ئێستاش هەر باوە و کەڵکی لێ‌وەردەگیرێت بەڵام وەک سەردەمی زوو، زۆرنییە و خۆشبەختانە بە زۆریش بە مەبەستی فێربوون و فێرکردن ئەنجام دەگرێ نەوەک بە ئامانجێکی‌تر.

هەڵبەت ئیستاش تاق و لۆقە فەقێ‌ی وا هەیە بە مـەبەستێکی نـارەوا و نـامرۆڤانە پرسیاران دەکات. بەڵام وانیە سەر بکێشێتە جەنگ و لێکدان. هەرچـەند دڵئـێشاوی و لێکدابڕانی لێپەیدا دەبێت و قەتیش بۆ دۆڕان و بردنەوە، ماڵ و شتی‌وا بە مەرج ناگیردرێت

وەک زەمانی پێشوو ئەو کارە کراوە.

### ٧ـ شەڕە شێعر:

شەڕە شێعریش یەکێکە لەو کێبەرکێیانەی لە کاتی پشوودان لەبەینی دوو نەفەر، یان دوو دەستە فەقێدا بەڕێوەچووە و ئێستاش کەمکەم وەبەرچاوە دەکەوێت.

شەڕە شێعر بەمشێوە بووە کە دووکەس یان دوو تاقمە فەقێ لە بەرانبەر یەکدا دانیشتوون و لایەکیان گوتویەتی «قل هوالرفیق» ئەویتریشیان کوتویەتی: «وبه التوفیق» ئەمجار پێویست بوو: لایەنەکەی تر شێعرێک بێنیتەوە؛ پیتی هەوەڵی وەک پیتی ئاخیری رستەی «وبه التوفیق» قاف بێت؛ بۆ نموونە وەک ئەو شێعرە فارسی یە:

«قلم گفتا که من شاه جهانم قلمزن را به دولت می‌رسانم»

ئەمجار ئەوی دی شێعرێکی هێناوەتەوە کە وەک ئەم شێعرە پیتی ئاخری میمە پیتی هەوەڵی میم بووە و هەر بەم شێوە درێژە دراوە هەتا لایەکیان لایەکەی دی بۆڕ داوە، واتە بەزاندوویەتی.

جۆرێکی دیکەی شەڕە شێعر ئەوەیە کە لایەنێکی جەنگ شیعرێک لە لایەنەکەی تر داوادەکات کە تایبەتمەندیەکی ببێت و ئیتر لەم شێوەدا پیتی ئاخری شێعر، جۆری شێعری داوا کرا و تاعین ناکات. بۆ نموونە لایەنێک دەڵێت:

«قل النون قل النون قل النون برایم بگو شعرهای دوازده نون»

بەو پێیە دەبێ تەرەف شێعرێکی بۆ بێنێتەوە، دوازدە نونی تێداهەبێت وەکی ئەم تاکە شێعرەی شێخ سەعدی شیرازی:

«آن نه من باشم که روز جنگ بینی پشت من

آن منم کاندرمیان خاک و خون بینی سری»

یان ئەوە تا بە شێعرداوای هێنانەوەی شێعرێکی لێکردوە کە لە کاتی کوتنی‌دا لێوان لیک نەدات بۆ نموونە کوتویەتی:

«منم منم ملا محمد گَزَنی شعری برایم بگو که لب به لب نزنی»

ئەویش بۆوەی نەدۆڕی دەبوو شێعرێکی وای بۆ بینیتەوە کە پیتێکی وای تێدا

نەبێت بۆ گوتنی پێویستی بە لێکدانی لێوان بیێت وەک:

«چون این دو شوند ز تو خرسند          خـــرسند شـود ز تـو خـداونـد»

یان وەک ئەو شێعرەی کە دەڵێ:

«هـــر طـــفلی قـــدر وقت خـود دانست          دانســـتن قـــدر وقت خـــود تـوانست»

یان لە شەڕەشێعردا داوای شێعرێک کراوە کە لەو سەر لەو سەران رابخوێندرێتەوە جا یان هەردوک لەتکی شێعرەکە وان وەک:

شو همره بلبل بلب هر مهوش          شکر بـترازوی وزارت بـرکش

یان بە هەرتک لەتەکانی سەراوبن دەکرێ وەک:

مــــودتەتدوم لکــل هــول          و هــل کــل مــودته تـدوم

یان ئەوەتە داوای شێعرێکی بێنوختە کراوە و زۆر جۆری دیش.

هەڵبەت دوو لایەنی شەڕە شێعر جاریواهەیە مەرج دادەنێن کە هەر بە زمـانێک شێعر بڵێن واش هەیە ئەو مەرجەوە بەرچاوناگرن و ئازادن بە هەر زمانێک چ کوردی، چ فارسی، چ عەرەبی و چ ئازەری شێعر بێننەوە ئەوەندە هەیە، مەرجە هەر شێعرە، کەڕەتێک بگوترێ و ئیتر لەیەک شەڕەشێعردا هەقنییە شێعرێک دوپات بکرێتەوە.



فەقێیەکان خەریکی شەڕە شێعرن

**٨ـ گەڕەلاوژە:**

گەڕەلاوژە ـ کە بریتی یە لە گوتنی گۆرانی لە لایەن دانیشتووانی کورێکەوە بە نۆبە ـ زەمانی زوو لە کاتەکانی پشوودان‌دا ئەنجام‌دراوە. بەم‌شێوە کە فەقێیەکانی حوجرە بە سوختە و موستەعیدەوە بە ریز دانیشتوون و پشکیان هاویشتووە و هەرکامیان تێ کەوتبێ گەڕەلاوژە، لەورا دامەزراوە و هەرکەس بە ناچاری لە نۆبەی خۆی‌دا شتێکی گوتوە. جا لە گۆرانی رابگرە تا خوێندنەوەی شێعرێک بە دەنگ‌یان گێرانەوەی قسەیەکی خۆش. دەنا کەسێک بە یەکێک لەم شتانە نۆبەی خۆی بەسەرنەبردبێ زۆری‌یان لێ کردووە کە دەگەڵ گەسکێ زۆرەوانی بگرێ یان قمێک ئاو بجوێ یان کارێکی دیکەی سەیر ئەنجام‌بدات و بەمشێوە زۆری پێ پێکەنیون و پێیانەوە گوزەراندوە.

ئەگەر لە کاتی گەڕەلاوژەدا کەسێک میوانی فەقێیان بوبێت یان مامۆستای گەورە ئامادەی ئەو کاتە بوبێت ئەوانیش هەر وەبەرهاتون و هەڵناوێراون، بەلاَم ئەگەر تێش‌کەوتبن سزانەدراون.

هەڵبەت بە خۆشی‌یەوە ئێستاکە گەڕەلاوژە نەماوە و جێی خۆی داوە بە شتی دیکەی بەکەڵک.

**٩ـ یاری و گەمە:**

لە کاتەکانی پشوودان‌دا بێجگە لەو شتە باسکراوانە برێک یاری هەن کە فەقێیەکان دەیانکەن و وا هەیە مامۆستای گەورەش بە شداری‌یان تێدا دەکات وەک توپێنە، جوغزێن، گورزی کوێری، یان رەمەزان و شەعبان، کێلەشکێنە، هەمزەل، مس‌فرۆشی، قەسابی، سۆفی و حاجی، لۆتی و مەیمون، گەنم گەنمێن و قەلفرو ئەم‌جۆرە یاری‌یانە.

پێویستە بڵێین کە ئەم کایە و گەمانە تەنها تایبەتی کاتەکانی پشوودان نین بەڵکوو لە ئاهەنگی ئیجازەوەرگرتن و زەماوەندی فەقێ و ئەوانەش‌دا کەڵکیان لێ وەرگیراوە.

بە خۆشی‌یەوە دەتوانم بڵێم کە یاری و کایەکردن لە بۆنە و مەراسیمەکاندا هەر هەتا بەر لە هاتنی شۆڕشی ئێران باوبوون و ئیتر لەو کاتەڕا وردەوردە وەلانران و ئێستا کە،

فەقێیەکان کاتی ئاهەنگەکانی خۆیان بەوانەوە ناگرن و لە جیاتی یاریکردنکات بە باس و لێکۆڵینەوەی زانستی بەسەردەبرێ و وتاری جۆراوجۆر پێشکەش دەکرێ.

## داوەتی فەقێیان:

لە نێو فەقێیەکاندا بە زۆری دوو جۆرە هەڵپەرکێ و گۆبەند وەبەرچاو دەکەوێت کە لە ئاهەنگ و رێ و رەسمی ئیجازەوەرگرتن یان زەماوەندی فەقێیاندا بەرێوە دەچێت جۆری یەکەمیان بە رۆینە[1] بە ناوبانگە و سەربەندی گۆرانییەکەشی ئەو تاکە شێعرەی «هەی ئاغا لەر دیوانە لەرشەمع یا نر پەروانە لەر»ە کە بە زمانی ئازەرییە و لێکدانەوەی ماناکەشی دەخەمە ئەستۆی ئەو خوێنەرانەی زمانی ئازەری دەزانن چونکی سەرەدەرێی لێ دەرناکەم.

ئەمجۆرە دیلانە[2] بەمشێوەیە کە فەقێیەکان بە ریز قامکە تیتەیان دەبەریەک هەڵدێنن و لاقی راستەیان لە دوایە و پاژنە پێی چەپەشیان لە پێشەوە لە سەرزەوی دەچەقێنن و ئەمجار لاقی راستە دێننە پێشەوە و خۆی دەدەنە سەری و پاشان لاقی چەپە، ئەما بەرلەوەی بە تەواوی خۆی بدەنە سەری بەو ئەندازەی هاتوونە پێشی دەچنەوە دواوە هەتا دەکەونەوە سەر حاڵ و چۆنیەتی هەوەڵێ، ئەمجار دووبارە ئەو کارە دەکەنەوە و وێرای ئەم چوونە پێش و هاتنەوە دوایەش دەگەڵ هەرجۆلانێک هەڵبەزێک دەکەن و وردەوردەش بەلای دەستی راستدا دەسورێن و دووکەسی دەنگخۆشیش لە سەرکێش «وزن»ی سەربەندی «هەی ئاغا لەر دیوانە لەر...» گۆرانی دەڵێن و بۆ یەکتری دەستێننەوە.

---

١ - ئەم جۆرە هەڵپەرکێیە تایبەتی فەقێیان نیە بەڵکە داوەتێکی کوردییە.

٢ - دیلان: هەڵپەرکێ داوەت. (هەنبانە)



**دیلانی «پێدا، پێدا»ی فەقێیان لە یەکێک لە دێیەکانی سوێسنیانی سەردەشت**

جۆری دووهەمیشیان «پێدا پێدا»ی پێدەگوتری کە ئەو نێوە دەرهاتووە لە سەربەندی گۆرانی ئەو دیلانە کە دەڵێ:

«هەی پێدا پێدا تەمووره پێدا یا خوا نەبارێ یارم لەرێدا»[١]

شێوەی داگیرساندن و گێڕانی شایی پێداپێداش ئاوایە کە فەقێیەکان بە بێ‌دەست و پەنجە تێک‌گرتن لە حاڵێک‌دا کە هەرتک دەستیان دەبەر کەلەکەیان دەنێن بە ماوەی یەک هەتا دوو هەنگاوان لە یەکتر دوور ریز دەبن و دەست‌دەکەن بە رۆیشتن بە لای راستدا؛ بەم‌شێوە کە لە بەرەوە پێ‌ی راستیان دەبەنە پێش و پاشان لاقی چەپ و جارێکی دیش لاقی راست و ئەمجار لاقی چەپ هەڵدێننەوە و دەگەڵ ئەوەی‌داکە تۆزێک بە لای چەپ و ژووری شایی‌یەکەدا دەسووڕێن، بڕێک بە توندی لاق لە زەوی دەدەن و وێرای ئەوکارەش

---

١ پێداپێدا: بە شوێن یەکدا:(هەنبانە بۆرینە).

چەپڵەیەک لێدەدەن و دوایە دەست دەخەنەوە بەر کەلەکەیان و پاش ئەوەی کە بـڕێکی دیش هەر بەو لایەدا سوڕان لاقی چەپیان دەبەنەوە دوایە و ئەمجار لاقی ڕاستیان لە زەوی دەدەن و دەگەڵ ئەو لاقلە زەوی‌دانەش چەپڵەیەک لێدەدەنەوە.



وێنەیەکی تری «پێدا، پێدا»ی فەقێیان لە ئاهەنگی ئیجازەدا

لەوجۆرە گۆبەندەش‌دا دووکەسی دەنگ‌خۆش لەسەر کێش و هەوای سەربەندی «هەی پێداپێدا...» گۆرانی دەڵێن و لەبەر یەکتری دەگێڕنەوە.

دوبارە دەڵێم بە خۆشی‌یەوە داوەتی فەقێیان بـە هـەموجۆرەکـانی‌یەوە وەکـوو گەڕەلاوژە باوی نەماوە و یەکجاری وەلانراوە و فەقێیەکان لەوجۆرە کۆڕ و کۆبوونەوانەدا وەختی خۆیان بە هەڵپەڕکێ و شتی بێ‌کەڵکەوە نا بە نەسەرێ و بە زۆری خەریکی وت و وێژ و باس لە سەر یاساکانی ئیسلامن و قسە لە دەرس و دەور و مەسەلە کۆمەڵایەتی‌یەکان دەکەن و بە نۆرە لەبارەی مەبەستگەلی جۆراوجۆرەوە وتاردەدەن، یان ئەوە تا شانۆگەلی خۆش و سەرنج‌ڕاکێش پێشکەشی دانیشتوان و بەشداران دەکەن و بە هۆی ئاراستەکردنی ئـەو شـانۆیانەوە هـەندێک لایـەن و بـابەتی دیـنی ڕوون‌دەکـەنەوە و دیـاردە نـاحەزە

کۆمەڵایەتی یەکان دەکوتن و ترۆیان دەکەن.



**وێنەیەکی «پێدا، پێدا» بە بەشداری مامۆستاکان**

## جل و بەرگی فەقێیان

بەرگ و پۆشاکێک کە تایبەتی مەلا و فەقێیانە و خەڵکی تر کەڵکی لێ وەرناگرێت بریتی یە لە: مێزەری سپی، کەوای شۆرە، سەڵتە، جبە و عەبا.

ئاشکرایە کە شکڵ و شێوەی ئەو سیپاڵانە تایبەتی عارەبانە و هاورێ دەگەڵ خوێندن و خوێندەواری فەقێیەتی بە میرات گیراوە و وردەوردە رەسمییەتی پەیداکردوە و بۆتە لیباسی تایبەتی مەلا و فەقێی کوردەواری و غەیری ئەوێش. ئەوەندە هەیە ئەو بەرگە لە شێوەی برین و دروندا گۆڕانی بەسەرداهاتووە و هەموو تایبەتمەندی «ویژگی»یەکی پێشوی پێوە نەماوە. بەتایبەت مێزەر کە هەر رەنگی لەدەستنەداوە دەنا بە برین و هەڵبەستن و هەڵپێچان و لەسەر نان بە تەواوی چۆتە سەر بیچم «شکل»ی پێچی کوردی.

ئێستا فەقێیەکان هەتا ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرن کەم واهەیە بێجگە لە مێزەر لەو

پۆشاکە تایبەتی یەکەڵک وەربگرن. لە سەر نانی مێزەری سپیش زۆرە و بەلاٚم بە مەڵبەند و ناوچە جیاوازی هەیە. بۆ نموونە لە ناوچەکانی لاجان و شنۆدا زۆرە و لە هەرێمەکانی بانە و سەقز و سنەدا بەکەمی دەبیندرێت و لە مەڵبەندی سەردەشت و سابلاٚغدا مێزەری سپی و ئاغابانوش هەیە بەلاٚم لەو دواییانەدا ئاغابانو زۆرتربووە.



دەستە فەقێیەکی سەردەشتی (ساڵی ١٣٥٥) «حوجرەی خانەقای سەردەشت»



قۆڵێک فەقێی سەردەشت و دەور و بەری (ساڵی ١٣٧٩) حەوشەی مزگەوتی نێزەڕۆ



تیپێک فەقێی سابلاغی، نەغەدەیی، شنۆیی و پیرانشاری



پۆلێک فەقێی پیرانشاری لە حوجرەی پەسوێ



**دەستە فەقنیەکی بانەیی**



**پولێك فەقێی ئوستانی کوردستان**

## حوجرە و ڕەوشتی بەرز:

حوجرەکانی کوردستان هەروەکوو مەکۆی زانیاری و خزمەت بە خەڵک و ڕێنمایی گەلی کوردی مسوڵمان بوون، هەر ئاواش کانگای خووخدەی باش و نوێنگەی ڕەوشتی بەرزبوون. ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر دوو هۆی سەرەکی کە یەکەمیان بریتی یە لە مادده دەرسی یەکان و ناوەڕۆکی کتێبەکان: شیکراوەی ئەم مەبەستە ئەوەیە کە وەک دەزانین لە حوجرەکاندا دەرسی خواناسی و دینداری و خووخدەی ئیسلامی دەبێ بخوێندرێت و هەر فەقێیەک تێبگەیەندرێت کە دەبێ سپەیرۆژی نوێنەرێکی ئایین و نموونەیەکی بەرچاوی مرۆڤی ڕێزان و ڕێبین بێت هەتا وێڕای زمان و وتار بە کردەوە و ڕەفتاریش ببێتە دیلمانجێکی ڕاست و ڕەوان. جا بۆیە فەقێ، تێدەکۆشی هەر لە سەرەتاوە بێجگە لە باوەڕ و بیروبۆچوونی ئیسلامی، کردەوە و ئاکار و خووخدە و ڕەفتاری ئیسلامی یانەش لە خۆیدا جێبکات. کە ئاشکرایە مەبەست لە خوێندنەکەشی هەر ئەوەیە و هەر بۆ ئەوەش کاری لە سەر دەکرێت. هۆی دوهەمیش ئەوەیە چونکی لە زۆربەی حوجرەکاندا ڕادەی دانیشتوان لە دە ـ دەوازدە کەسان زیاتر نابێ و زۆر جار لەبەر هەندێک هەل و مەرج ڕادەیان لە دوو ـ سێ نەفەر ناچێتە سەر، زەوتکردن و پەروەرینیان هاسانترە و خراپ و خراپەیان زوو بە چاو دەنگێوتری و چاری دەکرێ.

جا بۆیە لە ناوەندی حوجرەدا هەل و مەرجێک پێکدێت کە هەرکەس ماوەی مانگێک ـ دوو مانگان تێیدا بمێنێتەوە، لە باری کەسایەتی ئەخلاقی و ڕێزگرتن و هەستان و دانیشتن و بزوتنەوە و دوان دەگەڵ مامۆستا و هەواڵ و خزم و بێگانە و هەروەها لە سەرورووو و چۆنیەتی جل و بەرگ و تەنانەت لە شێوەی بەڕێگادا ڕۆیشتنیش‌دا، گۆڕانکاری یەکی وای بەسەردا دێت کە ئەگەر لە دنیای فەقێیەتیش بچێتە دەرێ بەکەمێک مانەوە و دوان دەگەڵی بۆت روون دەبێتەوە کە ماوەیەک فەقێیەتی هەر کردوە و لە کەش و هەوای حوجرەدا ماوەتەوە.

هەڵبەت ڕەوشتە ئەخلاقی یەکان گەلێکن بۆ نموونە: لێبوردن، ڕێزگرتن، دلۆڤانی، دڵاوایی، هێمنی، خۆراگری، زمانپاکی، داوێن‌پاکی، وەفاداری، ڕاستبێژی، بە خۆدانە

شکاندنەوە، شەرمکردن، چاوپۆشی، رقخواردنەوە، تورە نەبوون، خۆ بە کەم گرتن، سپاس دەربڕین، دادپەروەری، ئێرەیی نەبردن، ئەمینداری و پیٚزانین و ئەمەگناسی و... و... و دەبیٚ هەر مسولمانیٚک بە پیٚی توانا هەولبدا ئەمانە دە خۆیدا بینیٚتەجیٚ. بەلاٚم بابای فەقیٚ بە تیٚروانین لە ئەرک و ئیشەکەی چاوەڕوانی زیاتری لیٚدەکریٚت؛ کە خۆشبەختانە فەقیٚیەکان لەو مەیدانەدا بە سوارچاک دەرچون و ئەگەر هەندیٚک دەغەل و سەرکۆتەلیان لیٚوەلانیٚین هەمیشە جیٚ متمانەی خەلک بوون و تەنانەت بە مەلائیکەی سەر ئەرز نیٚویان براوە.

زۆر کەبانوو کە زانیویانە لە کاتی راتبەکردندا لە مال نابن کلیلەی دەرگایان لە لای فەقیٚیان داناوە تاکو بۆ خۆیان لە کاتی پیٚوستدا بچن دەرگا هەلگرن و نان و پیٚخور بیٚنن بۆ حوجرە!!

ئەوە لە کاتیٚکدا کە وەک لە تویٚی پیٚنجەمدا باسکرا یەکیٚک لەو مەبەستە پیویست و گرینگانەی کە دەبیٚ دەرس و کتیٚبی سەربەخۆی تیٚدا بخویٚندریٚ و بەلاٚم لەمشیٚوە خویٚندنی ئیٚستای ولاٚتی ئیٚمەدا وەبەرچاو ناگیری دەرسی ئەخلاق یان «علم التصوف»ە.

ئەو دەرسە نەک هەر دەبیٚ لە بەرنامە دەرسییەکاندا جیٚی بۆ وەکریٚ و بە تەسەلی بخویٚندریٚ؛ بەلکوو دەبیٚ هەر لە سەرەتای خویٚندنەوە ئیشی پیٚبکریٚ و هەول بدریٚ هەر فەقیٚیەک لە خۆیدا جیٚ کا و لە ژیانیدا بیچەسپیٚنیٚ.

## رەواندنەوەی تەمیٚک

لەوانەیە هەرکەسیٚک ئەم کتیٚبەی لە سەرەتاوە تا ئیٚرە خویٚندبیٚتەوە، پرسیار بکا و وەک رەخنەگریٚک بلیٚت: جا ئەگەر حوجرەکەش و هەوایەکی ئاوای هەیە و فەقیٚیەکان ئاوا رەوشت بەرز باردیٚن ئەدی ئەو زیٚف و ستەمە چییە کە لە سوختەکان کراوە و تەنانەت زۆر مافی رەوایان لیٚ زەوت کراوە؟

لە وەلاٚمدا دەلیٚین: ئەو رەخنە لە جیٚی خۆیدا هیٚنراوەتەگۆڕیٚ و ئیشەکە مەحکوم کراوە، لیٚرەشدا پیٚیوەدەنیٚین و دەلیٚن: ئەو سەردەمەی ئەو ئاکارە نالەبارە هەبووە هەندیٚک موستەعید نەبی کەس بە رەوای نەزانیوە و نەیکردوە؛ ئەوانەش کە هەلگری ئەو رەفتارە

دوور لە دادپەروەرییە بوون یان کەسانێک بوون کە نەیانتوانیوە خووخدەی نێو حوجرە هەڵبگرن و لێی بەهرەمەند بین و ئیتر کۆمەڵێکی ئاوا زۆریش وەک هەموو کۆمەڵێکی دیکەی ئینسانی نابار و کوێرەی هەردەبێ؛ یان ئەوەتا کەسانێک بوون کە لە راستیدا بەهەڵەدا چوون و بەرای خۆشیان دڵسۆزانە جوڵاونەوە و پێیانوابووە ئەگەر زۆر روو بدەنە سوختە و بێڵن بە ئازادییەکی تەواوەوە بژیت و هەرچۆنێک پێی خۆش بێ دانیشی و بنوێ و بروا و بخوا و... ئیتر ترسێکی لە مامۆستاکانی نەبێ، چاوورووی دەبێتەوە بە باشی دەرس ناخوێنی و تەمەڵ و نەزان و بێکارە باردێت.

## یەکسانی لە سەر سفرە

بەر لەوەی باسی یەکسانی سەر سفرە بکەین با جارێ بزانین سفرەی فەقێیان چی لە سەر دەبێ؟

فەقێ ئەگەر راتبەی بکەن لە هەمووجۆرە چێشتێکیان بۆ دێ؛ جا لە ماست و پەنیر و هێلکاو مزرۆکە و لە پاو و پەتاتە و تەماتە و تیسوی ئاو و ترخێنە و ماشێنەوە بگرە هەتا گۆشتاو و پلاو و قاورمە.

جێی خۆیەتی بڵێین راتبەکردن تەنیا دوو تایبەتمەندی باشی هەیە:

یەکیان ئەوە: کە فەقێ بە چێشت لێنانەوە ماندوو نابن و وەختیان ناگیرێ، یەکیشیان ئەمە کە پێخۆرەکانیان هەمە رەنگ «متنوع»ن. هەڵبەت جاری واش هەیە یەکدوگەرەکان راودەکەن واش تێرە خۆری خۆیان بۆنایە و ناچارن بە نانی ویشک و چای شیرین یان بە نان و دۆ، ئەگەر هەبێ قنیاتێ بکەن.(١)

---

١ ـ لە بەهاری ساڵی ٥٤ی کۆچی هەتاویدا لە دێیەک بەناوی قوڵنجی دەرسمدەخوێند. ئەو دێیە یەکێک لە شارەدێیەکانی سەر بە ورمێیە کە لە سەر جادەی ورمێ بۆ سەڵماس هەڵکەوتووە، ئەو کاتی ٥٠٠ ماڵ دەبوو، دوو مزگەوتی تێدابوو، خەڵکەکەشی تاق و لوقێک نەبێ، ئازەری و حەنەفی مەزەب بوون و دەگەڵ فەقێیانیش زۆر باش بوون.

کاتێک دەچوین بۆ راتبە هەوەڵ ماڵ کە دەچوین لێیان دەپرسین کە چەند کەسین و ئیتر هەرچەند کەس باین نان و پێخوری تەواوی ئەو جەمەیان دەداینێ و ماڵی دی نەدەچوین.

⇦



**فەقێیەکان و سفرەی سادە**

فەقێ ئەگەر مانگانەیان هەبێ یان شتێکیان دەستکەوێ و بۆ خۆیان لێی بنێن بە نۆبە شێوکەری «ئاشپەزی» دەکەن و چی خوا، دای سفرەی پێدەڕەنگێنن.

لەو شوێنانەی کە نیوەڕۆیان ڕاتبە ناکرێ یان ڕاتبە بەشی تێربوون ناکات فەقێ بۆ پەیداکردنی بژیو دەچنە سەر مووچە و لای ئاژەڵدارەکان و داوای سەوزی و تەڕەکار و سپیایی دەکەن و بۆخۆیان کەڵکی لێوەردەگرن.

بازەماڵێک هەرکە شینا ورد و شتیان پێ گەیی فەقێیەکان ئیزن دەدەن کە بە بێ پرسی خاوەنەکان بچنە ناو مەزرا و بە پێی پێویست شت بێننەوە.

فەقێی هەر شوێنێک بە بێبونە «مناسبت» و بە بۆنەگەلی جۆراوجۆرەوە وەکی ژن مارەکردن، زەماوەند، مەولوودی خوێندنەوە، خانوو سازکردن، نێولێنانی منداڵ و ئەوانە وە لە دێ بە زۆری لە فەسڵەکانی پاییز و زستاندا و لە شاریش لە چوار فەسڵی ساڵدا دەگەڵ مامۆستای دەرسبێژ، یان هەر خۆیان بانگهێشتن دەکرێن و بەم شێوە ڕێزیان

⇦ ئەگەر هەرکەسێکیش تەنیا لە ماڵ باکە دەچوو بۆ ڕاتبە بانگیان دەکردە ژوورێ و دەگەڵ وان نان و چایی دەخوارد و دەگەڕاوە حوجرە.

لێدەگرێت.

خەڵکی هەندێک شوێن، لەو کاتانەدا بۆ بانگهێشتنی فەقێیان پێشبڕکێ لە یەکتری دەکەن و بۆوەی لەو کارە خێرە بێبەش نەبن نۆبە دادەمەرزێنن و یان پێشتر نۆبە وەردەگرن.

بازێک لە ئاژەڵدار و وەرزێرە دینپەروەرەکان لە چاخی کار و کوێرەوەریدا فەقێیان بانگهێشتن دەکەن بۆ سەر مووچە و ئەگەر هەبێ شتێکیان بۆ سەردەبڕن، دەنا بە کەلانە و شتیوا پەزێراییان لێدەکەن.

ئەمجار با بێینەوە سەر باسی یەکسانی سەر سفرە: بەڵێ یەکێک لە رەوشتە بەرز و پڕ لە دادپەروەرییەکانی نێو حوجرە یەکسانییە لە سەر سفرە کە زۆر بە وردی وەبەرچاو دەگیرێت؛ بەمشێوە کە هەر خواردەمەنییەکی وەدەستیان بکەوێ جا لە نان و پێخۆرەوە بگرە هەتا میوە و هەموو جۆرە خوراکێکی دیکە، ئەوەندەی خوا بە نسیبی بکات، وێکڕا دەیخۆن و ئیتر نە هیچیان بێبەش دەکرێن و نە فەرقیان پێدەکرێت. تەنانەت لە نێوان موستەعید و سوختەشداهەرچەند سوختەی کەمتەمەن پێویستی کەمتری بە خۆراک هەیەجیاوازی دانانرێ و لە حوجرەدا رادەی دانیشتوان چەندکەس بێت بەو پێیە کەمترین شت بەشبەش دەکرێ و هەرکەس بەشی خۆی هەڵدەگرێ، تەنانەت بە مەبەستی ئەوەی لە هەڵگرتنی بەشەکانیشدا ناهەقی لە کەس نەکرێ فەقێیەکان بۆ وێدانیبەشەکان لە جۆرێک پشک (قورعە) کە «دەو»ی پێدەڵێن کەڵکوەردەگرن.

## دەو

دەو، یان دە، جۆرێک ژمارەیە کە لە نێو چەند کەساندا دەکرێت بەمشێوە کە دوو کەسیان، هەریەکە، بە مەیلی خۆی چەند قامک دێننە پێش و لەگەڵ ئەوەشدا یەکیان دەڵێ: «دەولەتۆ» یان «دەولەمن» ئەمجار قامکەکان لێکدەدەنەوە و دەژمارەی دیشی دەخەنە سەرێ و کردیە هەرچەندێک لەو کەسەوە کە دەوی لێکراوە فەقێیەکان کە بە ریز و بە شێوەی ئاڵقەیی دانیشتوون بە لای راستدا دەبژێرن و لە هەر کەسێک تەواوبوو ئەوە دەوەکە بە نێوی ئەوی دەردەکەوێ و دەبێتە مەلا (یەکەم). ئەویش بە مەیلی خۆی بەشێک

لە بەشەکان هەڵدەبژێرێت و پاشان کەسی دوای وی بە تەرتیبی بژارتنە کە بەشێک هەڵدەگرێت و هەر بەو شێوە هەتا دەگاتە سەر قڕە و ئاخرەمین بەش.

هەندێک ڕێسای دیکەی سەرسفرە بریتی یە لەوە کە فەقێیەکان بە ڕیز و بە زۆری لە سەر لاقی چەپ دادەنیشن و چۆکی ڕاستیان هەڵدەنێن. هەرکەس کەوچکی خۆی پێیە و دوای هەموو پارویێکیش لە پێش خۆی و لە سەر پەلکە نانێک دایدەنێتەوە و ئیتر نایخاتەوە ناو دەفرەکە؛ یەکەم لە بەر وەبەرچاوگرتنی چەمکی پاکی و خاوێنی و لەشساغی، دووهەم لەبەر ئەوەی جاری واهەیە هەشت‌نۆدە کەوچک دادێنە دەفرێکی، جا ئەگەر هەمویان لەو دەفرە باوێژرێنەوە چما، چ ڕوودەدات.[١]

ئەگەر پێخۆرێک کەم بێ و هەمووشیان حەزی لێبکەن بە نۆبە پاروی لێدەدەن و ئیتر هەرکەس نۆ بە پاروی لێدا، دڵیشی بتۆقێ تا نۆبەی نەگاتەوە سەرێ ناتوانێ دەستی بۆ بێنێ.

ئەگەر ژمێرەی فەقێیەکان زۆر بێت واهەیە هەر لە دەوری یەکەمدا پێش تێوەر سوڕانی دەور، پێخۆرەکە دەبرێ و هەندێکیان بێبەش دەبن و ناچارن وەسەر خۆ نەهێنن و ڕۆ بێنە قاپێکی دی.[٢]

دابی نان‌خواردنی فەقێیان وایە هەتا گشتیان کۆنەبنەوە کەس هەقی دەست‌پێ‌کردنی نییە، بۆ دەست‌پێکردنیش تێکرا «بسم‌الله»ی[٣] دەکەن و بە تەرزێک کە نەبێتە هۆی ناشکوری و ناهەقی نان دەخۆن جا ئەگەر پێخۆرەکان زۆر و جوراوجۆر بن ئەوا هەرکەس چی پێ‌خۆش‌بێ لێی‌دەخوات، بۆ تاقی‌کردنەوەشیان لە پێشدا هەریەکەی پارویێکیان لێدەدەن، ئەگەر پێخۆریش کەم‌هەبوو یان هی خۆشی کەم تێدابوو ئەوا، بە نۆبە

---

١ ـ مەتەڵەیە دەڵێن: ئەوەچییە: فەقێ نۆ، بوون کەچک دە یەکیان بە پاروو خنکا!

٢ ـ بازە فەقێیەکی قۆشمە ئەگەر پێخۆرێکی بەکەیفێ بێت بۆ ئەوەی بە تەنێ بیخوات تفی تێدەکا و ئەوانی تریش قیزیان لێی‌دەبێتەوە و بۆیان ناخورێ جا ئەگەر لێی بوردن باشە دەنا ئەوانیش بە تف تێکردن یان بە هەر شێوەیەکی دی لێی پیس دەکەن و نایەڵن بیخوات و ئیتر بەمشێوە ئەمشێوە بێ‌شێوە لە کیس هەموانیان دەچێت.

٣ ـ دوعای تەواوتر بۆ دەست‌پێ‌کردنی خواردن ئەوەیە لە پێش بسم‌الله کردن‌دا بگوترێ «اللّهُمَّ بارِكْ لَنا في ما رزقتنا وقِنا عذاب النّار».

لێی دەخۆن.[١]

**دەو، لە «ساقط»**

جاری وا هەیە شتێکی زۆر کەمیان دەبێ کە بەسەر هەمواندا، دابەش ناکرێ و تەنیا هەندێکیان دەتوانن کەڵکی لێ وەربگرن، وەک قاچە مریشکێک لە فرِوجاودا یان کفتەیەک لە شۆرباو کفتەدا کە لەم حاڵەتەدا «دەولە ساقیت»ی لێ دەکەن، واتە دەوێک کە هەندێکیان تێیدا «ساقط» و بێبەش دەبن، بەمشێوە کە شتەکە بە بەشێک‌یان ئەگەر برِێک هێند بێ بە چەند بەش دای‌دەنێن و ٠٠دی لێ‌دەکەن و دە و بە نێوی هەر کەسێکەوە دەرکەوت ئەوە لەورا دەست پێ‌دەکرێ و بە ریز هەرکام بەشێک هەڵدەگرن تا بەشەکان تەواو دەبن و ئیتر بەمشێوە بازێکیان ساقیت و بێ‌بەش دێنە دەرێ و لەباتی بەشە گۆشت دەبێ هەر ئاوی زاریان قوت‌دەنەوە!!

بۆ دابەش‌کردنی ئیش و کاری نێو حوجرەش بە سەر سوختەکاندا و هەروەها بۆ ئەنجامدانی کارێک کە پێویستی بە هەموانیان نەبێت و بیانهەوێ کەسێک یان چەند کەسی بۆ دەستنیشان بکەن هەر لەمجۆرە دەوە کەڵک وەردەگرن. (وەک پێشتریش باسمانکرد)

---

١ ـ لە رابردودا ئەگەر فەقێیەک پێخوری رشتبێ تەمێ کراوە، تەمیانەکەشی ئەوە بووە کە لە سەرسفرە هەڵیان‌ستاندوە و حوکمیان لێ‌کردوە دەورێکی حوجرە بدات و جا بێتەوە سەر نان خواردن، لە کاتێک‌دا کە ئەوان درێژەیان بە نانخواردن هەرداوە، جا ئەگە حوجرەیەک لە گەرەکە خانوودا بووبێ وا هەبوە فەقێ تا دەورەی ئەو هەموو گەرەکە هەڵاتوە بەشی براوە یان هەر کەمێکی بەرما و بۆماوەتەوە!!

## تویی حەوتەم: ماوەی خوێندنی فەقێ

لەبەر ئەوەی کە لە خوێندنی فەقێدا بەرنامەیێکی ڕێک و پێک نییە و نەزم و دەستوارتێک کە بۆ خوێندنگە ڕەسمی یەکان هەیە وەک پۆل‌پۆل‌کردنی خوێندنەکە بە پۆل «کلاس»ی ١ و ٢ و... یان، دابەشکردنی بە سەر قوناغەکانی سەرەتایی، ئامادەیی و... دا، بۆ ئەو خوێندنە دیاری‌نەکراوە و لە ئاکامدا وێکڕا و وەک یەک و پێکەوە دەرس‌خوێندن و تێکڕا پشوودان و هەروەها بە یەکەوە دەست‌کردن بە کتێب و دەست لێ بەسکردنی لانی کەم فەقێی حوجرەیەک ناگونجێت وە هەرکەس لە جێیەک و لە لای ماموٚستایەک و لە کتێبێک کە بۆ خۆی پێی‌خۆش‌بێت و لەبارەی هەر زانستێکەوە ئارەزۆی لێ‌بێت دەخوێنێت و هەر ڕۆژێک وازی لێ‌بێت بە سەفەر دەچێت و یان ماموٚستای دەگۆڕێت، مرۆڤ ناتوانێ بڵێت کە فەقێ بە ئەوەندە وەختە دیاری کراوە لە خوێندن دەبێتەوە و ئیجازە وەردەگرێ بەڵکوو زۆری و کەمی ماوەی خوێندن پێوەندی بە زیرەکی و نازیرەکی، تەمەڵی و ئازایەتی، زۆر خوێندن و کەم خوێندنی دەرسی ڕۆژانە و زۆر ماتڵ‌بوون و کەم ماتڵ‌بوونی فەقێ وە هەیە.

خۆشبەختانە لەو دواییانەدا بڕێک لە دەرس بێژەکان نەزم و یاسایەکی ڕێک و پێکیان لە هەموو بارێکەوە بۆ حوجرەکانیان دیاری کردوە و تەنانەت دەرسەکانشیان کردوەتە ئاڵقەیی و بەو شێوە بەرهەمی کاریان بۆش‌تر و باش‌تر بووە.

دەتوانم بڵێم کە فەقێیەکان بە شێوەیەکی مام‌ناوەندی بە هەژ نۆ دە ساڵان کۆتایی بە خوێندن دێنن بەتایبەت ئێستا، کە بڕێک لەو کتێبانەی لە ڕابردودا دەخوێندران وەک: سبزواری، گلنبوی برهان، خلاصة الحساب و الهندسه، مطول، شرح الشمسیه، تهذیب الکلام، تشریح الافلاک، شرح المقاصد و ئەوانە وەلانراون و زۆر بە کەمی دەخوێندرێن، خوێندن زووتر کۆتایی دێت.(١)

---

١ - وەکی لە مێژووی ژیانی زانایانی کورد دەردەکەوێ، فەقێیەکانی کوردستان تا نزیکەی نیو سەدە لەمەوبەر

هەڵبەت ئەو ماوەیەش کە فەقێ لە خوێندندا دەمێنێتەوە وانییە کە بەردەوام و ⇦راوەستان هەر بخوێنێت بەڵکوو لە راستیدا ئەگەر لە سەریەک و بێ پسانەوە بخوێنێت مەگەر یەکێ زۆر نازیرەک و تەوەزەل بێ دەنا هیچ فەقێیەک بەو مەرجەی هەر ئەوەندە عیلم و کتێبانە بخوێندرێن حەوت سالی پێ ناچێ لە خوێندن دەبێتەوە.



مامۆستا دەرسی ئاڵقەیی دەڵێت
حوجرەی بەردەڕەشی بانە

وە ئەو هەژنۆدەساڵانەی لە خوێندندا بەسەردەبرێت بەتایبەت لە وڵاتی ئێمەبەشی زۆری پشوودان و بێدەرسی یە چونکی لە هەر حەوتوویکدا دوو رۆژ واتە رۆژەکانی سێشەممۆ و هەینی «جمعه» پشوودانی رەسمین و ئەگەر لێکی بدە ینەوە لە ساڵدا سەد رۆژ زیاتر دەگرێتەوە. هەروەها مانگی رەمەزان و لانیکەم پێنج رۆژ لە پێش و پێنج رۆژ لە پاش ئەو مانگەش هەر پشوودانە، ئەمە نێزیکەی پێنج مانگ، ئەمجار دەگەڵ

⇦ پازدە تا بیست ساڵان بکرە زیاتریش لە خوێندن داماونەوە.

پشوودانەکانی دیش وەکی پشوودانی جەژنی قوربان و جەژنی مەولوود و سەفەرکردنی فەقێ و مامۆستا و هەندێک گیروگرفتی دیکەی وەک میوانهاتن و نەخۆشی و سەرئێشی و ئەوانە ئەگەر هیچ نەگرێ حەوت مانگ هەر دەگرێ و ئەنجامی ئەو لێکدانەوە ئەوەیە کە فەقێ نیوەی ساڵ پتر بێ دەرسە و لە پشوودان و ماتڵبوون دایە و ئەگەر نیوەش بێ هەر زۆرە و واش ماوەی خوێندن هەر دوو بەرابەر دەکات و ئەگەر فەقێ بێجگە لە رەمەزان و رۆژانی هەینی و دوو جەژنەکان پشوودانی نەبێت و لەسەریەک دەرس بخوێنێت ئەوەندە شتانەی ئێستا دەخوێندرێن بە چوارساڵ ئەوپەڕەکەی بە پێنج ساڵ کۆتاییان پێدێنێ و ئیجازە وەردەگرێ و مەگەر لەباری ئەزموون و ئاگاداری گشتییەوە دەنا هەر ئەو مەلایەش دەبێ کە دە ساڵ لە خوێندندا دەمێنێتەوە و پێی دەڵێن مەلای دوازدە عیلم.

## مەلای دوازدە عیلم

ئەو زاراوەیە وا دەگەیەنێ کە عیلم هەر دوازدە لکی هەبێت و ئیتر مەلای هەرەباش ئەوەیە ئەو دوازدە عیلمانە بزانێت و لەوە زیاتر شتێک نییە بخوێندرێت بەڵام واقیعو راستەقینە شتێکی ترە و علیم ئەوەندە زۆرن کەس لە دنیادا هەڵناکەوێ لە هەموانیان بەلەد بێ.

ئەدی زاراوەی (دوازدە عیلم) چۆن پەیدا بووە؛ ئەوەندەی من بزانم زاراوەیەکی تەقریبی و بڕیار لە سەر دراوی ناوچەیی‌یە و لە هەل و مەرجێکی کاتی و وڵاتی وادا سازبووە کە دەدوازدە عیلمی تێدا خوێندراوە یان دوازدە عیلم بە تەوەرەی کار ناسراون و گرینگی پتریان پێدراوە. چونکی دە ـ دوازدە وشەدان (فرهنگ) و زانستنامە (دائرةالمعارف)م لە سەر تەماشاکردن هیچیان بەلایەوە نەچوون.

لێرەدا جێی خۆیەتی بزانین لە دنیای ئیسلام و لە نێو شارستانیەتی ئیسلامی‌دا چەند عیلم پەیدا بوون و خوێندراون و دوایە چ گۆرانکاریەکی چەندیەتی و چلۆنیەتی (کمی و کیفی) یان بەسەرداهاتووە و ئێستاکە، لە زانستگەکانی نێونراو بە (حوجرە)دا چەندیان ماون.

## لە دایک بوونی عیلم

بەڵام جارێ با مێژووی لەدایکبوونی عیلم و هەڵدان و پەرەسەندنی بە گشتی لە نێو کۆمەڵی مرۆڤ دا باس‌بکەین و پاشان دەچینەوە سەر مەبەست.

شتێکی حاشا هەڵنەگر و ئاشکرایە کە دەگەڵ سەرهەڵدانی یەکەم مرۆڤ‌لەسەر ئەم زەویە زانست و زانیاریش پێی ناوەتە مەیدانەوە. تەنانەت وا دەردەکەوێ کە بەر لە دروست‌بوونی مرۆڤیش بوونەوەرێک بووبێ کە هەڵگری جۆرە زانیارییەک بووە.

بەڵێ خوای گەورە، بە بەرداکردنی بەرگی عیلم و زانین، گەورەیی بابادەم و تێکڕای نەوەکانی بە فریشتەکان سەلماند و ناچار بوون رێزی لێبنێن و ئامادە بین هەر لەو کاتەرا کە دەسپێردرێتە منداڵدانەوە تا دەخرێتە ناو دڵی خاک بە شێوەگەلی جۆراوجۆر خزمەتی پێبکەن و بی‌خەنە ژێر چاوەدێری و پارێزگاری.

مرۆڤیش بەرەبەرە زیادی کردووە و هەتا زۆرتر و پیرتریش بووە زانست و زانیاری پتری وەدەست هێناوە، کە سەرچاوەی زانستەکەشی لە روانگەی دینەوە دوو شت بووە:

یەکەم خوای گەورە و کاربەجێ لە هەر دەورەیەکدا و بۆ هەر بەرەیەک لە مرۆڤ لە لایەن خۆیەوە بە هۆی سروش (فریشتەی وەحی)ەوە بە پێی پێویست رێنوێنی و زانستی بۆ کەسێک یان چەند کەسیان کە پلەی پێغەمبەر رایەتی پێداون، ناردووە و ئەوانیش ئەو کۆمەڵە زانست و رێنوێنییەیان بە تەواوی راگەیاندوە، کە ئەو بەشە لە عیلم، زانستە گێڕراوەکان «العلوم النقلیه» دەگرێتەوە و مرۆڤ‌خۆی یان هەر نایانزانێ و رێیان ناباتە سەر. یان بشیان‌دۆزێتەوە جۆرێکن کەم و کوڕ و بە زیانی تاک و کۆمەڵ و پێچەوانەی راستەقینە.

دووهەم سەرچاوەی عیلم و زانین بۆ مرۆڤ ، عەقڵ و ئاوەز و ئەزموون و تاقیکارییەکانی خۆیەتی؛ کە لەو رێیەشەوە مرۆڤ دەستکەوتێکی زۆری بووە و توانیویەتی جێ و رێی خۆی خۆش بکا و کەل و پەلی زیاتر وە دەست‌بێنی و بە زۆرێک لە راز و نهێنییەکان پەیبەرێ و دەریایەک لە گرێ کوێرەکانی ژیانی بە ژانی بکاتەوە و ئەم جیهانە پان و بەرین و فراوانە لە پێوەندی بە یەکەوە بووندا بکاتە دێیەکی گەورە؛ کە ئەو دەستەش

لە عیلم و زانستی مرۆڤ، بە زانستە ئاوەزی یەکان «العلوم العقلیه» نێودەبرێن.

دیارە هەر دوو بەشەکەش پێوەندی یەکی نەپچڕاو و تەنگاوتەنگی یان بە یەکترەوە هەیە و هەردووکیان بۆ یەکتر پشتیوان و ڕێنوێن و دان پیانەرن. بۆیە هەرکاتێک مرۆڤەکان لە هەر دوو سەرچاوە کەڵیان وەرگرتبێ، واتا وێڕای کەڵک وەرگرتن لەو زانست و زانیاری یانەی بە ئاوەز پێیان گەیون، گوێیان بۆ زانستە ئاسمانیەکان و ڕێنمایی پێغەمبەران ـ د ـ ڕاداشتبێ و بناغەی ژیانی تاکی و کۆمەڵایەتی خۆیان لەسەر هەر دوکیان دامەرزاندبێ و بە تەواوی و بە بێ بادان و لێ قرتاندن و هەڵپاچین کەڵکیان لێ وەرگرتبن ژیانێکی خۆش و پیرۆز و پڕ لە بەختەوەری یان بووە و پێوەندی نێوانیان لەسەر بناغەی سوودگەیاندن بە یەکتر و پارێزگاری لە یەک و ڕێزدانانی دوو لایەنە و لێکبوردن، دامەرزاوە. هەر کاتێکیش هەر لە لایەک بەهرەیان وەرگرتبێ و لایەکەی تریان وە پاش گوێ دا بێ یان وەک پێویست وەبەرچاویان نەگرتبێ ئەوا تووشی دواکەوتوویی زۆربوون و چ بۆ دنیا، چ بۆ دوارۆژ زیانی قەرەبوو نەکراوەیان لێ کەوتووە.

هەروەکی لە دنیای ئەمڕۆدا دەبینین بەشی هەرە زۆری حکوومەت و کۆڕ و کۆمەڵە مرۆڤی یەکان لەبەر هۆگەلی جۆراوجۆر، وەکی هەوڵنەدان بۆ تێگەیشتن لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام، دنیا و نەوس و هەوەس پەرستی، ڕازی نەبوون بەژینی یەکسانی و کۆمەڵی بێ چین و توێژ، خۆفرۆشتن و نۆکەرسفەتی و خۆ بە زل زانین و گوێ بە هەق نەدان؛ ئەو دوو بەشە زانستەیان لێکدا بڕیوە و زانستە گێڕراوەکانیان لە ڕەسمییەت و برە و خستووە و وەک تاک یان کۆمەڵە و میری پشتیان بە زانستە ئاوەزی یەکان بەستووە و لە ئەنجامدا کۆمەڵی مرۆڤ گیرۆدەی ئەو هەمووگیروگرفتە ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابوری و... بووە و دەر و دەروونی تووشی نەخۆشی هاتووە و پێوەندی مرۆڤەکان لە سەر بنچینەی زیاندان لە یەکتر و چەوساندنەوە و پەروەردەکردنی هەستی تۆڵەسەندن و شکاندن، بنیات نراوە، مرۆڤ لە پلەی مرۆڤایەتی دا بەزیوە و دەگەڵ خۆی و هاوچەشنەکانی وەک ئاژەڵ ڕەفتاردەکات. ئەوەتادنیا شاهیدی ئەو هەموو کوشت و بڕ و ماف پێشێل کردن و خوێن ڕشتنەیە. بەشێکی زۆری خەڵک نەک هەر مافی ڕەوایان لێ زەوت کراوە؛ بەڵکوو لە سەرەتایی ترین پێواویستی یەکانی ژین بێ بەشن.

ئەو هەموو هێزە سەربازی‌یە و زلهێزە خـۆ بـە زۆر زان و لە خـۆبایی و خـۆ بـە مرۆڤدوست نوێنە هەن؛ کەچی کەسیش نییە لە سەر زۆر لێکراو و ماف خوراو و لە برسان مرودوان هەڵقرێ. تەنانەت بۆ چاوبەستن و لەبەر، بەرژەوەندی خۆیان نەبێ هەر لە دەزگا راگەیەنەرە گشتیەکانیشیاندا نێویان نابەن و باسێکیان لێوە ناکەن!!

یەکێک لە گوڤارە رۆشنبیریە گشتی‌یەکان لە ئازاری (١٩٩٦) لە ژێر نـاونیشانی «جیهانی سێ»دا، نووسی: «...وڵاتانی جیهانی پێشکەوتووکە ژمارەیان ٢٤ وڵات دەبێت و رێژەی دانیشتوانیان ١٨٪ی سەرجەم دانیشتوانی سەرزەمینە، بەڵام ٦٥٪ی بەرهەمی جیهانی دەخۆن و ناوەندی داهاتی تـاک تـیایاندا خـۆی لە (٥٠٠٠) دولار دەدات لە ساڵێکدا، کەچی وڵاتانی جیهانی سێ (١٢١) وڵات دەبن و بـەرە و زیـاتریش دەرۆن، رێژەی دانیشتوانیان نزیکەی ٧٠٪ی سەرزەمینە وکەمتر لە ٢٠٪ی بەر و بوومی جیهانی دەخۆن. ناوەندی داهاتی تاک تیایاندا ناگاتە (٣٠٠) دولار.

رێژەی زیادبوون لە جیهانی سێیەمدا بەرچاوە و زۆرجار بە پێ‌ی نەخشە و پلانی دارێژراونی‌یە. لە ساڵی (١٩٨٢)دا (٤/٨) ملیارکەس بوون، وا پێشبینی دەکرێت تا ساڵی «٢٠٥٠» ببن بە «١٠» ملیار و (٨/٤) ملیاریان لە جیهانی سێیەمدا نیشتەجێ دەبن.

رێژەی منداڵان، ئـەوانـەی لە (١٤) سـاڵ کـەمترن لە جـیهانی سـێدا (٥٠٪)ی دانیشتوان دەبن، بەڵام لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا لە (٢٥٪) تێپەڕناکەن.

رێـژەی زیـادبوونی دانـیشتوان لەم وڵاتـانە دوو هـێندەی رێـژەی زیـادبوونی دانیشتوانی وڵاتە پێشکەوتوەکان دەبێت و لێکۆڵینەوە دیموگرافی‌یەکان وای دەخەمڵێنن لەکۆتایی ئەم سەدەیەدا ٨٠٪ی جیهان پێکبهێنن.

لە جیهانی سێدا ئەگەرچی رێژەی زیادبوونی بەرهەم زیاترە لە رێژەی زیادبوونی دانیشتـوان، بۆ نموونە لە ساڵی (١٩٦٨) تا (١٩٨٠) بەرهەم (٢/٦٪) زیـادی کـردووە بەڵام دانیشتوان (٢/٤٪) زیادیانکردوە، واتا داهاتی هەر تـاکـێک (٠/٢٪) زیـادی کردووە، بەڵام ئاستی شتهێنان لە وڵاتانی‌ترەوە هەر لە زیادبووندا بووە.

ژمارەی برسیەکان تیایاندا زیاتر لە (٥٠٠) ملیۆن کەس دەبن. لە زۆر وڵاتانی وەک گـامبیا و غـانا و مـۆریتانیا و سـەنغال و مـوزەنبیقدا کـەمتر لە (٢٠٪)ی پـێویستی‌یە

سەرەکیەکانی خەڵک دابین دەکرێت. تەنیا لە بەنغال‌دا و لە ساڵی (١٩٤٤)دا (١٥) ملیون کەس لە برسان مردوون، ساڵی (١٩٧٩) کە بە ساڵی منداڵ پارێزی ناوبرا زیاتر لە (١٧) ملیون منداڵ لە جیهانی سێیەمدا مردوون!!»[١]

بێگومان ئەوە هەمووی بەرهەمی تاڵی لێک هەڵاواردنی دووبەشی زانستی (معقول و منقول) و رەسمیەت‌دان بە یەکەمیان و لە برەو خستن و دەست‌تێوەردانی ئەویتریانە کە ئەمەش خۆی یەکێک لە ئاکامەکانی پیلانی هە لاواردنی دینە لە سیاسەت، کە بەداخەوە لەسەرمسوڵمانان ئەنجام‌دراوە و کاری خۆشی کردووە و ئێستاش زۆر مسوڵمان هەن کە داوای رابەری و چاوساغی خەڵک دەکەن کەچی درێژەدەری ئەم پیلانەن و بە ئەنقەست یان لە رووی نەزانی‌یەوە بانگەوازی بۆ دەکەن.

با بچینەوە سەر باسەکەمان و بڵێین: مرۆڤ هەمیشە دەگەڵ جەهل و نەزانین شەڕی بووە و ئەوەندەی بۆی کراوە پەرەی بە زانست داوە و دژی نەزانین جەنگاوە، هەرچەند زۆر وا رووی‌داوە کە لە نێو شەڕ و هەرای مرۆڤەکاندا گەلێک کتێب و زانست کە بەرهەمی رەنج و تێکۆشانی دەیان و سەدان ساڵی زانا و زانستگەکان بوون؛ بەڵام چونکی نیشانی پێشکەوتنی دوژمن بوون بە تاڵان براون و بە دیل گیراون، جایان هەر شوێنە ونکراون، یان ئەوەتا لە پێش چاوان بە ناخی ئاو و توونی ئاگردا دراون و بەو پێیە زیانی زۆر لە بەرەی مرۆڤ‌دراوە و بە چەند سەدە بەرەو پاش گێردراوەتەوە.

بێجگە لەمە زۆر شتی‌دیکەش بوونەتە هۆی ئەوەکە رێگا لە هەڵدان و فراژوو بوونی عیلم و زانایان بگیرێت یان ئەوانی هەشن لەناو ببرێن و بەمشێوە خەڵکان بۆ دەورانی سەرەتایی نەزانی و بێخەبەری تەس بدرێنەوە؛ لەوانە زاڵبوونی فەلسەفەی ئەرەستوو و دەسەڵاتی بیر و باوەڕە دینی‌یە دەست‌لێدراوەکان لە ئوروپا لە سەدەکانی ناوڕاست‌دا، واتا لە (٤٠٠) تا (١٥٠٠)ی زایینی.

گومان لەوەدا نییە کە مرۆڤ تێکڕا چ پەیڕەوانی ئایینە ئاسمانی‌یەکان و چ بێخەبەران لە ئایین و چ بێ‌باوەڕان، وەک تاک یان کۆمەڵە یان میری بەتایبەت میری‌یە

---

١ ـ گۆڤاری پەیامی راستی ژمارە (٢٤).

گەورەکان راژە و خزمەت و داهێنانێکی زۆر و بەرچاویان بۆ عیلم و زانین بووە، بەڵام پەیڕەوانی ئایینە ئاسمانییەکان تا ئەو کاتەی ئایینەکەیان دەستی خۆ ویست و هەلپەرستانی نەگەیوەتێ و نەگۆڕاوە؛ لەبەرئەوەی ئایینەکەیان سەرەڕای بەشی «منقول» بەشی «معقول»یش بە رەسمی دەناسێ و داکۆکی زۆری لە سەر دەکات و تەنانەت وەکی باسمانکرد ئەو دوو بەشە لە زانست بە پاڵپشت و سەلمێنەری یەکتر و بگر وەک دوو رووی سکەیەک دەزانێ؛ خزمەتیان بۆ عیلم زیاتر بووە، بەتایبەت مسوڵمانان وەک تاک و تاقم و میرییەکان لەو بوارەدا بە پێ‌لێنانی خۆیی و نامۆیان ئاسەوارێکی زۆریان هەیە و گەلێک عیلمیان بنیات ناون یان پێیان گەیاندوون. گەورەترین هۆی ئەم دیاردەش ئەمەیە کە موعجیزەی هەر پێغەمبەرێک لەو شتانە بووە کە لە ناو خەڵکەکەدا رەواجیان بووە و دەگەڵی ژیاون زۆری لێدواون و بە دەورەیدا هاتوون و چوون؛ وەکی مۆسیقا لە دەوری حەزرەتی داود، سیحر و جادوو لە چاخی حەزرەتی موسا، پزیشکی لە سەردەمی حەزرەتی عیساداسەلامی خوایان لەسەر بێت‌نەک لە شتانێک کە لێیان بێ‌خەبەر و نابەڵەدبن کە هێنانیان لە لایەن پێغەمبەرەوە نرخی موعجیزەی نابێ.

خەڵکی چاخ و سات و شوێن و وڵاتی بە خەڵات هاتنی قورئانی پیرۆزیش لە وێژە و ئەدەبدا دەستێکی والا و هەستێکی بالایان بوو، باو باوی رەوانبێژی و راستبێژی و شێعر هۆنینەوە و وێژامەی کەس نەوێژتوو دۆزینەوە و وتاردان و وشەی جوان لە قەتاردان بوو. ئەو شاعیر و وێژەوانانەی ببوونە پێشەنگ و کەس تۆزی نەدەشکاندن، بەرهەمەکانیان دەست بە دەست دەگەڕان و لە شار و بازاران هەڵدەواسران و بە یەکەم دەناسران و بەو پێیە هۆی شانازی و سەربلێندی هۆز و عاشیرەتەکانیان پێک‌دەهێنا، کە «السبعةالمعلقه» واتا حەوت شێعرە هەڵواسراوەکان نموونەی ئەو بەرهەمە پەسندکراوانە بوون و لە بازاری «عکاظ» هەڵواسرابوون.

لە سەرێکی دیشەوە قورئان موعجیزەیەکی کاتی و تەنیا هەر بۆ خەڵکی ئەو سەردەم نەبوو بەڵکوو دەبوو بۆ هەتا دنیادنیایە و کێشەی هەق و بەتاڵ لە ئارادایە کە مرۆڤ بەوپەڕی پلەکانی گونجاو لە علیم و زانین دەگات موعجیزە بێ و وەڵامی تەواوی پرسیار و رەخنەکانی هەموو زانا و زانستگەکان بداتەوە، هەر بۆیە کە بناغەی دینی ئیسلام لە سەر

عیلم و زانین دامەزراوە و یەکەم ئایەتی کە بۆ پێغەمبەر-د- نێردرا دەستوور بە خوێندنەوە دەدات و پاشان باسی قەڵەم و فێرکردن دەکات. لە زمانی پێغەمبەرەوە-د- گێڕدراوەتەوە کە خوای گەورە یەکەم شت قەڵەمی ئافەریدە کردووە. هەروەها پێغەمبەری مەزن-د- داوای کردووە کە مرۆڤ تەواوی ژیانی خۆی بۆ فێربوون، تەرخان بکات و هەر لە سەر پشتی لانکەوە هەتا دەخرێتە نێو گۆڕیچە، هەر بخوێنێ و بە دوای زانیندا بڕوا. تەنانەت پاش مردنیش سوننەتە یەکێک لە مسوڵمانان رووبەڕووی گۆڕی مردووەکە دابنیشێ و کەمێک دەگەڵ گیان «روح»یدا بدوێ و هەندێکی لەو شتانەی فێریانبووە و لەوانەیە لە گێرەوکێشەی گیانکێشاندا فەرامۆشی کردبن وەبیری بێنێتەوە و بڕێک شتی تازەشی فێر بکا، جا بەجێی بێڵن و بیدەنە دەست فریشتەکان بۆ پرسیارلێکردنی.

بەڵێ لە دەق «نص»ە دینی‌یەکاندا چ ئایەت و چ حەدیس سەبارەت بە عیلم و زانین و زانایانەوە دەستوردان و پێهەڵگوتن و داکۆکی‌یەکی زۆر هاتوە، هەروەکی لۆمە و هەڕەشەیەکی زۆر لە مەڕ «جهل» و جاهیلانەوە هەیە.[1] بۆیە لەو سەردەمانەدا کە ئایینی

---

١ - زۆرجاران کە لە ئاهەنگ و کۆبوونەوەکاندا لەبارەی گەورەیی (علم و علما)دا قسەدەکرێ و هێرش دەبرێتە سەر (جهل و جهال) و بۆ ئەم مەبەستانەش لە ئایەت و حەدیس و وتەی زانا پایەبەرزەکان بەڵگە دەهێنرێتەوە؛ هەندێک لە خۆشک و برا نەخوێندەوارەکان وا تێدەگەن کە (عالم) واتا خوێندەوار و (جاهل) واتا نەخوێندوو، جا بۆیە بە پێویستی دەزانم بۆ دەرخستنی مانای راستەقینەی ئەم وشانە و رەواندنەوەی تەمی خەمی ئەم خۆشک و برایانە کەمێک ئەو وشانە لێک بدەمەوە: نە لەو شەدان «فرهنگ»ی عەرەبی‌دا و نە لە زاراوەی قورئان و حەدیس‌دا (علم و علما) بە مانای خوێندەواری و خوێندەواران و (جهل و جهال) بە واتای بێ‌سەوادی و بێ‌سەوادان نیە، بەڵکوو (علم) بە مانای زانین و (علما)ش کۆ (جمع)ی (عالم)ە و (عالم)یش یانی زانا، جا زانستەکەی لە رووی دەرس‌خوێندن و چوونی قوتابخانە پەیداکردبێ یان نەخوێندەوار بێ و بەڵام لەم و لەوی بیستبێ ئەوە هەر زانایە و رێز و نرخی خۆی هەیە. وە هەروەها (جهل) بە مانای بێ‌سەوادی نیە بەڵکوو بە مانای نەزانینە بەتایبەت نەزانینی حەقیقەت و راستەقینە کە هەر لە دین‌دا خۆی دەنوێنێ و (جاهل) کە لە سەر کێشی (جهال، جهله، جهلاء و جُهَّل) کۆدەکرێتەوە واتای کەسێکە دینی ئیسلامی وەرنەگرتبێ و باوەری پێی نەهێنابێ، جا باخوێندەواریشی هەبێ و زانستگەشی تەواوکردبێ. هەر ئەوەشە کە هەندێک لە نووسەرە مسوڵمانە هاوچاخەکان بۆ تەرزی بیروبۆچوون و فەرهەنگ و هەڵوێستی چینی خوێندەواری ئەمرۆڤ سەبارەت بە دینی ئیسلام؛ زاراوەی (جاهلیةالقرن العشرین) واتا نەزانی سەدەی بیستەم بەکاردەبەن، ئەگەرچی خوێندەواری و سنعەت لەم سەدەیەدا بەرەوپێش چوون و سەرکەوتنێکی زۆریشی‌یان بەدەست‌هێناوە و تەنانەت

⇦

پیرۆزی ئیسلام لە سەرکار بوو و دین و سیاسەت هێشتا لێک جیا نەکرابوونەوە عیلم و سنعەت پێشرەفتێکی زۆری کرد و بە پێچەوانەی ئێستا ولاتانی غەیرە مسولمان بۆ فێربوونی زانست و پیشەسازی دەستی نیازیان بۆ لای مسولمانان درێژدەکرد.

ئەمجار جێی خۆیەتی لێرەدا ناوێک لەو عیلمانە بەرین کە لە چاخی دەسەلاتداریەتی مسولمانان و گەشەکردنی شارستانییەتی ئیسلامی‌دا خوێندراون و هەولیان بۆ دراوە و ئیشیان پێکراوە.

بەلام بەر لە نێوبردنی ئەو عیلمانە با رایگەیەنین کە بۆ پێشگرتن لە درێژبوونەوەی باسەکە لە وەرگێرانی ناوی یەکەیەکەی عیلمەکان بۆ سەر زمانی کوردی و هەروەها لە ناساندن «تعریف» یان خۆ دەپارێزن. بەتایبەت کە لە توێی چوارەمی ئەم کتێبەدا نۆزدە عیلمیان ناسێندراون.

## عیلمە ئیسلامی‌یەکان

١ـ علم الادب. ٢ـ علم اللغة. ٣ـ علم التصریف. ٤ـ علم المعانی. ٥ـ علم البیان. ٦ـ علم البدیع. ٧ـ علم العروض. ٨ـ علم القوافی. ٩ـ علم النحو. ١٠ـ علم قوانین الکتابه. ١١ـ علم قوانین القرائه. ١٢ـ علم المنطق[1]. ١٣ـ العلم الالهی. ١٤ـ علم النوامیس. ١٥ـ علم القرائه. ١٦ـ علم الحدیث. ١٧ـ علم التفسیر. ١٨ـ علم روایة الحدیث. ١٩ـ علم اصول الدین. ٢٠ـ علم اصول الفقه. ٢١ـ علم الجدل. ٢٢ـ علم الفقه. ٢٣ـ العلم الطبیعی. ٢٤ـ علم الطب. ٢٥ـ علم البیطرة و البیزرة. ٢٦ـ علم الفراسه. ٢٧ـ علم التعبیر. ٢٨ـ علم احکام النجوم. ٢٩ـ علم السحر.

---

⇦ رێژەی نەخوێندەوارانی هەندێک لە ولاتانی جیهان لە ٢٪یش کەمتر بوتەوە و لەوانەشە ولاتی وا هەبێ نەخوێندەورای هەر تێدا نەمابێ. کەوابوو (جاهل و عالم) بە مانای نەخوێندەوار و خوێندەوار نین بەلکو لە زمانی عەرەبی‌دا بۆ خوێندەوار وشەی (القاری) و بۆ نەخوێندەواریش وشەی (الامی) بەکاردەبرێت. تەنانەت لە قورئانی پیرۆزدا پێغەمبەری ئازیزدبە (امی) واتە نەخوێندەوار نێوبراوە و لە عەینی حالیش‌دا ئەو بەرێزە خۆی بە (مدینةالعلم) واتا شاری زانیاری نێو دەبات.

١ ـ مەنتیق لە بنەرەت‌دا عیلمێکی یۆنانی‌یەکە هاتوتە نێو مسولمانان و کاری لە سەر کراوە و کاریشی پێکراوە.

٣٠ـ علم الطلسمات. ٣١ـ علم السيمياء. ٣٢ـ علم الكيمياء. ٣٣ـ عـلم الفـلاحه. ٣٤ـ عـلم الهندسه. ٣٥ـ علم عقود الابنيه. ٣٦ـ علم المناظر. ٣٧ـ علم المرايا المحرقه. ٣٨ـ علم مركز الاثقال. ٣٩ـ علم المساحة. ٤٠ـ علم انباط المياه. ٤١ـ عـلم البـنكامات. ٤٢ـ عـلم الآلات الحربيه. ٤٣ـ علم الالات الروحانيه. ٤٤ـ علم الهيئة. ٤٥ـ علم الزيجات. ٤٦ـ علم المواقيت. ٤٧ـ علم الارصاد. ٤٨ـ علم تسطيح الكرة. ٤٩ـ علم الآلات الظلية. ٥٠ـ علم العدد. ٥١ـ علم الحساب المفتوح. ٥٢ـ علم حساب التخت و الميل. ٥٣ـ علم الجبر و المقابله. ٥٤ـ علم حساب الخطأين. ٥٥ـ علم الدور و الوصايا. ٥٦ـ علم حساب الدرهم و الدينار. ٥٧ـ علم الموسيقى. ٥٨ـ علم السياسة. ٥٩ـ علم الاخلاق. ٦٠ـ علم تدبير المنزل.[١]

---

١ ـ ناوی ئەو عیلمانەم لە «دائر معارف القرن العشرین»ی فرید وجدی وەرگرتووە.

## تویی هەشتەم: ئیجازە وەرگرتن

پاش ئەوەی فەقێ بە هێزی بیر و باوەڕ و ڕەنج و کوێرەوەری و تێکۆشانی بێوچان، هەوراز و نشێوی پڕ لەکەند و کۆسپی فەقێیەتی بڕی و بە یەکەیەکەی پلەکانی زانستەکاندا سەرکەوت و لە خوێندن بۆوە لە لای هەر مامۆستایەک پێی خۆش بێ «اجازە» وەردەگرێت واتا ودمی مەلایەتی و ئەنجامدانی هەموو، یان هەندێک لە ئەرکەکانی پێدەدرێ و بەو بۆنەشەوە کۆڕێکی گەورە پێکدێت؛ بەمشێوەی کە باسی دەکەین:

ئەو مامۆستایەی کە فەقێ داوای ئیجازەی لێدەکا پێویستناکا دەرسی زۆر بەو فەقێیە گوتبێت، تەنیا ئەوەندە هەیە دەبێ مامۆستا لە رادەی زانست و زانیاری فەقێ تێبگات و بزانێت کە ئایا شیاوی مەلایەتی هەیە یان نا؟ هەروەها دەبێ بۆی روونببێتەوە داخوا توانای بەڕێوەبردنی کامە ئەرکەی هەیە لە ئەرکەکانی مەلایەتی، وەک پێشنوێژی، وتاری هەینی، داوەری «قضاوت»، فتوا و دەرسدان و ئەوانە؛ جا بۆ ئەوەی مامۆستا لەوانە تێبگات پێویستە فەقێ ماوەیێک لە لای بمێنێتەوە و هەندێک شتی لەلابخوێنی.

فەقێ ئەگەر بۆی ڕێکەوێ لە لای مامۆستایەک ئیجازە وەردەگرێ کە سەرەڕای تەدریس و زانیاری تا رادەی ئیجازەدان، مامۆستایەکی نێو بە دەرەوە و زۆر لە خواترس و پارێزگار «متقی» بێت و ئیجازەی زۆریشی لەلا وەرگیرابێت.

### ئیجازە نییە ئیجازەبدەی

بەداخەوە ئەمڕۆکەمشت لە جێی خۆیدا ماوە، زۆرکەس لە ئەنجامدانی ئەرک و بەرپرسایەتیدا کز و بێوزە و داماوە؛ زۆرشت بە نێوشتە نەک بە نێوەرۆک، گەلێکن ئەوانەی وەک هەن خۆنابینن و ئیدیکەش بە هیچ دەزانن. نازانم چ بڵێم و چ بنوسم! دەڵێن تف هەڵاوێی رووی خۆت دەگرێتەوە، بەڵام دەردەکان هێند زۆر و گرانن ناکرێ لێیان بێدەنگ بین، بەتایبەت ئەم دەردەی کە دەمهەوێ لەسەری بنووسم ئەگەرچی دەردی

تاقمێکە بەڵام ژان و زیانی بۆ هەموانە؛ دەردی زوو ئیجازەدان و زوو ئیجازە وەرگرتن کە پەرەی‌ستاندووە و زەبری زۆری وەشاندووە، هەروا لێی گەڕێین تەشەنە زیاتر دەکات و ئەوکات وەک نەخۆشی قرژاڵە[١] چارەکردنی دژوار دەبێ، پێشم وانییە ئەم نوسین و زڕاندنە کەڵکێکی وا بەرچاوی هەبێ؛ بەڵام لانی کەم یەکەم هەنگاوە و نەخۆشیش، ئەگەر خەڵک بە نەخۆشیەکەی بزانێ و باوەڕی پێ‌بکەن ئازاری کەمترە و بێ‌خەمترە.

بۆیە ناچارم بیدرکێنم با بۆ هاوتەمەن و هاوەڵانم پەند و بۆ مامۆستا و سەروەرانیشم رادەربڕین و سکاڵابێ، قەیدێ‌ناکا خۆ شکور، هەموویان وانین، ئەوەی دەنگوێش جێی خەبەتی، پیاو خۆ و خۆیی نەشکێنی، چ دەگەڵ نامۆ و لاوەکی بکا؟ ئەدی بۆچی‌ئەو بە مەبەستی گەورەکردنەوەی درۆیینی کەسایەتی ئاسایی خۆی لە قازانجی دینی و دنیایی گەل چاو دەقونجێنێ؟ خۆ لەو نووسینەدا ئەگەر هەندێکیش توڕە و دڵگیر ببن برێک هەر هەن بیسەلمێنن و تەنانەت ئەگەر خۆشیان لە سوچداران بن، دین و ویژدانیان سەرکۆنەیان بکەن و پێ لە هەڵەی خۆیان بنێن و لێی ژێوان بینەوە و بڵێن: کوڕە دەستی‌خۆش‌بێ، وەڵلاهی راست‌دەکا، هیچ رەسم و یاسایەک نەماوە! هەرچی راست‌بۆوە «ئیجازە» دەدات! کەس لە کەس ناپرسێتەوە، ئەوەی پێی بڵێی وانابێ پێی ناخۆشە، وادەزانی ئێرەیی[٢] پێ‌دەبەی!

نازانی بەرپرسایەتی ئیجازەدەر لەمەر کارەکەیەوە چەند گەورە و گرانە و ئیجازە پێدراوی ناشی و نەگورا و چ تینێکە[٣] بودین و چ زیانێکە بۆ ژیان.

بۆیە بە راشکاوی دەڵێم: بازێک لەو مامۆستا بەڕێزانە شایانی ئەو پلە و ئیشە نین و دەبێ بەسەر نەوسی خۆیاندا زاڵ بن و تا پێی نەگەن ئیجازەی ئیجازەدان بە خۆیان نەدەن. چونکی ئیجازەدان واتای: من بە پێی ئاگاداری و تاقیکاریەکی لە سەر ئەم فەقێیە هەمە لە سەردەستی ئێوە ئامادە بووان شاهیدی دەدەم کە شیاوی مەلایەتی کردنە و سەرەڕای زانینی زانستەکان تا رادەی دەرس‌گوتنەوە و وەڵامدانەوەی پرسیارە

---

١ -سەرەتان، شێرپەنجە.

٢ - ئێرەیی: حەسادەت.

٣ - تین: تون، ئاگردان.

جۆراوجۆرە دینی‌یەکان و داوەری «قضاوت» و هەموو ئەرکەکانی دیکەی مەلایەتی؛ پیاوێکی دیندار و پارێزگار و دڵسۆز و بەرپرسیارە بۆ دین و دەکرێ بنێردرێتە سەنگەر «محراب»ی مەلایەتی و خزمەتکردن بە دین و دنیای خەڵک.

پێم‌وایە ئێوەش دەگەڵمن لەوەیدا کە «موجیز و موجاز» دەبێ چەند مەرجێکیان تێدا بێ جا بە پایەی پێوەندیدار دەگەن: یەکەم، ئیجازەدەر لەو عیلم و زانستانەدا کە دەخوێندرێن دەستێکی باڵای هەبێ و ئەگەر داگر (جامع)ی هەموو عیلمەکانیش نەبێ، لانی‌کەم ئەوانی دەخوێندرێن و تەدریس‌دەکرێن بە چاکی و بێ گرێ وگوڵ بزانێ و ئەگەر تێشیاندا خاوەنی‌رای تایبەتی نەبێ، هیچ نەبێ چەندجاران بە دەرس‌گوتبنیەوە و بتوانێ، بێ‌موتالای دوبارە و بێ‌هەڵە و پەڵە، بە فەقێ‌یان بڵێتەوە یان لە ئەزموون و تاقی‌کردنەوەیان دەربچێ، دەنا زانینی کتێبی خوێندراو، بە موتالا و پێداچوونەوە چ هونەرێک نییە. ئێمە زۆر مامۆستامان بوون کە بێجگە لە چەمک و مانا و مەبەست، وێژامەی بەشی زۆری کتێبە دەرسی‌یەکانیان ئاگالێ‌بووە و بێ کتێب و هەر لە بەرڕادەرسیان گوتوە، هەروەها بوومانە ئەگەر هەموو زانست و کتێبەکان لەناوچووبان سەر لە نوێ دەیانوسینەوە. کەچی ئەمجۆرە موجیزانە نەک هەرکتێبەکانیان لەبەر نین بگرە پاش موتالا لێ کردنیش بە تەواوی بۆیان ساغ نابنەوە و بە هەڵە دەیانڵێن، جا بابای فەقێش‌یان شەرمێونە و دەنگ‌ناکا، یان لە مامۆستا کوڵەوارترە و راست و هەڵە لێک‌ناکاتەوە.

لە ئاهەنگەکانی ئیجازە وەرگرتن‌دا زۆرمان بینیوە: مامۆستای ئیجازەدەر ئیجازەنامەی خوێندۆتە گەلێک هەڵەی رێزمان (صرف و نحو)ی تێدابوون کە مامۆستا هەستی پێ‌نەکردوون!! زۆر حەیفە مامۆستایەک نەتوانی پێشەکیەکی دروست و بێ‌هەڵە بە زمانی عەرەبی بۆ ئیجازەنامە بنوسێ و داوای پلەی ئیجازەدانیش بکات! دەبێ ئەو مامۆستایە چۆن بزانێ فەقێیەکەی سەوادی هەیە یان نا؟!!!

دووهەم: ئیجازە وەرگر «موجاز» دەبێ هەموو زانستە پێویستەکان بخوێنێ و بتوانێ لە تاقی‌کردنەوە «امتحان» یان دەربچێ کە ئەو کات دەتوانێ بشیان‌لێتەوە. هەروەها دەستورەکانی سەرەتایی مەلایەتی، وەکو پێشەوایە «امامە»تی هەموجۆرە نوێژەکان بە دوعا و وردیاتەوە، وتاری هەینی و جەژنەکان، رێ و رەسمی مردووناشتن و پرسە و

سەرەخۆشی، مارەبڕینی ئافرەت، ئادابی کۆمەڵایەتی و هەستان و دانیشتن دەگەڵ خەڵک بزانێت. ئاگاداریی لە هەندێک رەوا و نارەوا «الحلال و الحرام» و یاسا شەرعییەکان، لانیکەم باسی پەرستن «عبادة» هەبێ. لە بابەت پارێزکاری و دینداری‌یەوە دەرچووبێ، پیاوێکی دەست و دڵپاک و بەختەمام بێ، دڵسۆز دینپەروەر بێ و خەمی دینی لەبەر بێ، دۆست و دژمن‌ناس و وریا بێ، لە خۆبوردوو و ئارام و مەندبێ وەکوو دەریابێ. تێبگات کە مەبەست لە مەلایەتی خۆژیاندن نییە، بەڵکوو ئامانج خزمەت بە دین و مسوڵمانانە. جا ئەگەر ئەوانیش لە بەرانبەردا یارمەتی دەدەن ئەوا یارمەتی دینە و ئەرکی سەرشانە. بە کورتی و بە کوردی مەلا دەبێ سوارچاکی مەیدانی زانین و کردەوە بێ جا خەڵک وەدوای دەکەوێ.

لەوانەیە بگوترێ: ئەدی ئەگەر بابای فەقێ بە گوێی نەکردین و پەلەی کرد، یان تێنەکۆشا و خۆی ماندوو نەکرد، یان هەر لێهاتوویی نەبوو و پێ‌ی نەدەخوێندرا، ئەمجار چی لێبکەین؟

وەڵام ئەمەیە کە ئەوکەسە ئەگەر لێ‌هاتوویی نەبێ ئەوا هەرکاتێک روون بۆوە دەبێ ماموستاکەی دەگەڵ کەس و کاری راوێژ بکا و دەستی پێ لێ‌هەڵبگرن و رووی پێ‌بکەنە ئیشێکی تروەکوو لە پێشەوەش باسمانکردئەگەر لێهاتوییشی بێ ئیتر بیانوو و عوزری بێ یان نا، ئیجازەپێدانی دروست نییە. باشتر ئەوەیە کە بڵێین خوێندن وەلادەنێ. دەنا مەگەر لە قوتابخانە و خوێندنگە رەسمی‌یەکاندا کەسێک توانای خوێندنی نەبێ، یان تێنەکۆشی و هەوڵی خوێندن نەدا، یان هەر دەست‌هەڵبگرێ، کارنامە «شهادە»ی دەدەنی؟!

کە مایەتی و بێ‌مباڵاتی‌یەکی دیکەی ماموستاکان ئەوەیە کە هەندێک لە ئیجازەدەرەکان ئەگەرچی بۆ خۆشیان زۆر زانا و هەڵکەوتوون، تەنانەت لە دینداری و خواپەرستن‌دا بە پلەی پارێز «ورع» گەیون؛ بەڵام بۆ ئیجازەوەرگرەکانیان تەنیا لایەنی سەواد و زانست وەبەرچاو دەگرن و ئاورێک لەباری کردەوە و رادەی دینداری و دڵسۆزی‌یان نادەنەوە، هەروەکی لە دەورانی دەرس‌پێگوتن‌دا مبالات بەو لایەنە ناکەن‌ئەگەرچی پێشوونە چاکە «سەلەفە صاڵحە»کانی ئێمە هەر دوو لایەنی عیلم و

عەمەلیان هەر لە سەرەتای خوێندنەوە تاکۆتایی وە بەر چاو گرتووە ئیتر بێ‌مبالاتی و خاتر و خواهیش نەبووە و فەقێیەک ئەگەر لە هەردوو لایەنەوە لە ئەزموون و تاقیکاری دەرنەچووبێ، ودمی مەلایەتی و ئیجازەی ڕێنوێنی «ارشاد»ی خەڵکیان پێ‌نەداوە.

چونکی یەکەم: خوای گەورە کاتێک لە قورئانی پیرۆزدا باسی مەبەست لە ناردنی پێغەمبەر دەکا و وەک چاکە و نیعمەتێکی خۆی بەسەرچاوماندا دەداتەوە؛ دەفەرموێ: «یُزَکِّیهِم وَ یُعَلِّمُهُم الکِتابَ و...» واتا پێغەمبەر خەڵکی لە باوەڕ و خوو و کردەوەی خراپ پاک دەکاتەوە و قورئان و... شیان فێردەکات. کەوایە بارهێنان و فێرکردن دوو ئیشی سەرەکین بۆ، پێغەمبەران و میراتگرانیشیان هەروا.

دووهەم: ئەوەندەی کردەوە و خوو خدە و هەستان و دانیشتنی مسوڵمانانەی مەلاوەک ڕاگەیێنەری دین و بانگەوازیی‌کەری ڕێگای ئیسلامەتی‌لە سەر خەڵک و بانگکراوەکان شوێن دادەنێ، هەرگیز قسە و وتار ئەوەندە کاریگەر نییە. بەڕای من مەلایەک لە شوێنی خۆی‌دا هیچ قسەو بانگەوازی‌یەک نەکا، بەڵان بۆ خۆی دیندار و ئەهلی کردەوە بێ زۆر پڕسوودترە لە مەلایەک کە بەردەوام دەڵی و دەنووسێ، ئەما بۆ خۆی تێدانییە و قسە و کرداری تێک ناکەنەوە!

ئەگەر بەراورد و پێک‌گرتن «مقایسە»یک، لە نێوان ئیجازەنامەی مەلایەتی و ئەو ئیجازەنامەی لە تەریقەتەکاندا، بۆ ڕێنوینی «ارشاد» دەدرێت؛ بکەین دەبینین هەتا چەند پشتان وێکرا دێنە خواری و لێک جیانین، ئەما پاش چەند ئاڵقان لێک هەڵدەبڕێن و بە مەرەدی دین و سیاسەت و دووبەشی «منقول و معقول» لە زانستەکان دەچن[1] و پیرانی تەریقەت زیاتر بە دوای «تزکیە»دا دەچن و داکۆکی پتر لەسەرکردەوە و خاوێن‌کردنەوەی

١ ـ بەو پێیە دەتوانین بڵێین مێژوو نیشانی‌داوە و بە ئەزموون و ئاوەز سەلمێندراوە کە جیاکردنەوەی سێ شت لە سێ شت زەبری گەورەی لە مسوڵمانان داوە و بەم ڕۆژە ڕەشەی گەیاندوون: یەک: پیلانی جوداکردنەوەی دین لە سیاسەت. دوو: دابڕینی «العلوم النقلیە» لە «العلوم العقلیە» و لە ڕەسمییەت خستنی بەشی یەکەم. سێ: هەڵاواردنی فێرکردن و پەروەردە لە یەکتر.
جا ئەوەی زۆر سەیر و جێی داخە ئەمەیە کە ئەگەر پیلانی یەکەم لە لایەن دوژمنانەوە بووە و پیلانی دووهەمیش ئاکامی حەتمی و تەواوکەریەتی؛ پیلانی سێهەم ڕاستەوخۆ بە دەستی مسوڵمانان دارێژراوە و پەرەی پێدراوە!!

دەروون دەکەن و لایەنی «تعلیم» و خوێندەواری وەک پێویست وەبەرچاو ناگرن. مەلایەکانیش بە پێچەوانە، چاودەبڕنە باری زانین و خوێندەواری فەقێیەکان و ئاوڕێک لە چۆنیەتی دەر و دەروونیان نادەنەوە و لە ئاکامدا هیچکام لەو دوو دەستانە نەیانتوانیوە شوێن دابنێن و داهاتی زۆریان ببێ. چونکە یان باڵی عیلم، یان باڵی تەقوایان بێ‌هێز بووە، خەڵکیش لێیان نامۆ و دوورە پەرێز بووە و بە تەنیا باڵی ماونەوە و تەنانەت کەوتوونە سەر کۆنە و دژایەتی یەکتریش.



**بە بۆنەی ئیجازە وەرگرتنی یەکێک لە فەقێیەکانی جەنابی مامۆستا «سید حسام‌الدین قریشی» لە ڕێکەوتی ١٣٤٨/٥/٢٧ی کۆچی، هەتاوی لە مزگەوتی «دوو منارە»ی سەقزگیراوە و موجاز لە لای چاپی موجیز دەبیندرێ.**

هەڵبەت ئەمەی گوترا بۆ هەندێک کات و هەندێک وڵات و بازە کەسێکی کەمتەرخەم و بێ‌مبالات بووە؛ دەناسپاس بۆ خوائەگەر بە گشتی باس‌بکەین بەشی زۆری زاناکانمان هەم ئەهلی عیلم و فێرکردن بوون، هەم ئەهلی عەمەل و بارهێنان و مێژوو و

دەیان و سەدان زانای کوردمان پێ دەناسێنێ کە پاڵە[1]ی عیلم و پاڵەوانی کردەوەشن.

## کۆڕی ئیجازە

بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگی ئیجازەدان سەرەڕای خزم و کەس و کاری فەقێ ی ئیجازە وەرگر لە تەواوی فەقێ و مەلای دەوروبەر دەگێڕدرێتەوە، تەنانەت ئەو مەلا و فەقێیانەی پێوەندی و دۆستایەتێکی تایبەتیان دەگەڵ ئیجازەدەر یان ئیجازەوەرگر هەیە لە دوریشڕا بانگهێشتن دەکرێن. غەیری مەلا و فەقێیانیش، جگە لە خەڵکی ئەو دێیەیان ئەو گەڕەکەی ئیجازەی تێدا وەردەگیرێ، لە هەندێک خەڵکی دەوروبەریش دەگێڕدرێتەوە.

میوانەکان لە لایەن خەڵکەوە میوانداریان لێ دەکرێ و هەموو بەڕێچوونێکیان تا دوایی هاتنی ڕێ و ڕەسمی ئیجازە -کە واهەیە دوو شەو و ڕۆژ دەخایێنی لە سەر خەڵکی دێ یان ئەو گەڕەکە شارەیە کە بەسەر مزگەوتی مامۆستای ئیجازە دەرەوەیە.

---

١ - پاڵە: شاری گەورە. (هەنبانە بۆرینە).



ماموستای ئیجازەدەر بە پیر میوانەکانیەوە چووە / بەردەڕەشی بانە



ماموستای موجیز و خەڵکی ئاوایی بە پێشوازی میوانانی کوڕی ئیجازەوە چوون



**وێنەیەک لە هاوکاری گیانبازانەی خەڵکی ئاوایی بەردەرەشی بانە**

**بۆ پێکهێنانی کۆڕی ئیجازە**

ئەگەر مامۆستا دەست ڕۆیشتوو بێت، بەرگی مەلایەتی وەک کەوای شۆرە و عەبا و مێزەری سپی، بە دراوی خۆی بۆ فەقێ دەکڕێ و بۆیشی بە دروون دەدات، دەنا ئەو کارەش هێندێک کەس یان کەسێکی دەست ڕۆیشتووی ئاوەدانی وەستۆی خۆی دەگرێت.

## ئاهەنگی ئیجازە

پاش هاتنی بانگهێشتن کراوەکان ڕێ و ڕەسمی ئیجازە بەم شێوە دەست پێ دەکات و بەڕێوە دەچێت: لە سەرەتادا چەند کەسێک وەک ئەنجومەن یان هەیئەتی بەڕێوەبردن بە بەشداری موجیز و موجاز دیاری دەکرێن، ئەو هەیئەتەش کەسێکی لێهاتوو وەک بەڕێوەبەر «مجری» دادەنێت.

ئاهەنگەکە ئەگەر لە شەو یان ڕۆژێک زیاتر بخایەنێ لە دوو یان چەند بەش دا ڕێک

دەخرێ و هەر بەشەش بەڕێوەبەری خۆی هەیە، یان هەموو بەشەکان هەر کەسێک بەڕێیانەوە دەبات. زۆربەی جارانیش ئەنجومەن پێکنایە، بەڵکوو هەر مامۆستا و موجاز، کەسێک یان چەند کەس وەک بەڕێوەبەری بەرنامە دیاری دەکەن.



**بەشدارانی کۆڕی ئیجازە**

**مزگەوتی بیلالی حەبەشی نەغەدە ساڵی (١٣٧٦)**

بەڕێوەبەری بەرنامە بەڕاوێژ دەگەڵ ئەنجومەن یان موجیز و موجاز و هەرکەسێکی دیکە ی لێزان، بەرنامە، ڕێکدەخات؛ بەمشێوە ناوی ئەوکەسانەی دەیانەوی قسە بکەن و وتار بدەن یان هەڵبەست و مەبەستیان هەبێ، دەنووسێ، ئەگەر کەسانێک هێشتا ئامادە نەبووبن و لەوانەبێ وتاریان هەبێ جێیان بۆ هەڵدەگرێ، وتاردەران وا هەیە بۆ خۆیان داوای وەخت دەکەن و رادەگەیەنن کە وتاریان هەیە، هەندێکجاریش بەڕێوەبەر رایدەگەیەنێ؛ هەرکەس وتار، یان هەر مەبەستێکی هەیە رایبگەیەنێ تا ناوی بنوسرێت، هەندێک بەشداران کە لە دوان و وتارداندا بەهێزن و تارەکانیان بە پێزە و کەڵکی زۆری لێوەردەگیرێتوتاردەر زۆر بن یا کەمداوای وتاردانیان هەر لێدەکرێت.



**وێنەیەکی تر لە بەشدارانی ئاهەنگی ئیجازەدان**

**گوندی مووسالانی سەردەشت**

**بەڕێوەبەر پاش نووسینی ڕیزی بەرنامە، بە خوێندنی چەند ئایەت لە قورئانی پیرۆز ئاهەنگەکە دەکاتەوە. هەڵبەت دەگەڵ ڕێکخستنی بەرنامە قورئانخوێنێکی دەنگخۆش دیاری دەکرێ. دوای قورئان لە لایەن کەسێک یان دووکەسی دەنگخۆشەوە. کە لە پێشەوە دیاری دەکرێن. بەندێک «قصیدە بردیە» دەخوێندرێتەوە. ئەمجار ئەگەر کەسێک بە نوێنەرایەتی خەڵکی دێیان گەڕەک بەخێرهاتنی میوانان بکا دەنا یەکەمکەس وتاری خۆی پێشکەش دەکات.(١)**

**لە نێو بەرنامەکەدا نێوە نێوە و بەتایبەت دوای هەر وتارێک، سرودێک یان بەستە هەڵبەستێکی خۆش پێشکەش دەکرێ، جارجاریش بە شیرینی و شەربەت یان بە چایی، یان ئەگەر هەبێ بە میوە پەزێرایی لە بەشداران دەکرێ.**

---

١ - بەڕێوەبەری بەرنامە بە پێی توانا تێدەکۆشێ وتارەکان جۆراوجۆر بن و دووپات نەکرێنەوە و بۆ خۆشی نێوەنێوە شتێکی خۆش باسدەکا و بەرنامەکەی پێ دەرەنگێنی.



دەستەی سروود، سروود پێشکەش دەکەن



کۆڕێکی تری سروود (مزگەوتی حەمامیان ـ بۆکان)



**وێنەیەکی تری دەستەی سروود خوێن**

**مزگەوتی جامیع، نەلاس، سەردەشت**

هەندێک جار دوای ئەوەی بەڕێوەبەر پێشەکی خۆی پێشکەش کرد و ریزی بەرنامەی راگەیاند و قورئان خوێندرا یەکەم کەس کە وتار دەدات «مجاز»ە، ئەمجار بەشداران و ئاخرەمین وتار هی مامۆستای «موجیز»ە؛ جاریواش هەیە وتاری موجیز و موجاز دەکەونە دوایی بەرنامە و پەنای یەک، ئەما وتاری موجاز وەپێش دەکەوێ.

ئەو بەرگە تایبەتیەی بۆ موجاز دەکرِدرێت، بە جوانی قەد دەکرێ و پاشان لە سەر سینییەک، بە گوڵ و رێحانە و شتی جوان سەوقاتی[1] دەکەن و لە ماڵی مامۆستای دادەنێن و پێش ئەوەش نۆبەی وتاری مامۆستا بێت، دەستەیەک فەقێ، هاوڕێ دەگەڵ موجاز بە نەزم و یاسایەکی تەواوەوە، بە «قصیدە» خوێندنەوەوە دەچن بۆ هێنانی بەرگەکە و بە بێ دەستلێدان قورئانێکی لە سەر دادەنێن و دیەدەنە دەست فەقێلێکی زیت و ژیکەڵە

---

١ ـ سەوقاتی: کادۆ. (هەنبانە).

و کەمتەمەن و ئەویش لە سەرسەری خۆی دایدەنێ و بە هەردوک دەستی دەیگرێ و لە پێش دەستەی ناوبراودا وردەوردە دەستدەکا بە ڕۆیشتن بە دوای ویشدا موجاز و دوو موستەعید یان دوو مەلای لاو یەکیان لە لای ڕاست و یەکیان لە لای چەپیەوە یان زیاتر شان بە شانی یەک دەڕۆن، ئەمجار ئەوانی تر ریز ریز دەبن و بە «قصیده» خوێندنەوەوە، لە سەرخۆ و بە هێمنی بەرەو کۆڕی ئاهەنگ دەگەڕێنەوە. لە گەڕانەوەدا لەو کاتەدا نەبێ کە فەقێیەکان سەربەندی قەسیدە دەستێننەوە هەنگاو هەڵدێننەوە و دەڕۆن دەنا لە کاتی خوێندنەوەی قەسیدەکەدا دەگەڵ هەموو تاکە شێعرێک تا کۆتایی، رادەوەستن. هەر کە گەیشتنە ژووری مزگەوت یان ئەو جێیەی کۆڕەکەی لێ گیراوە، خەڵکەکە لەبەریان هەڵدەستێ و تا ئەوانیش لە قەسیدە دەستبەس دەکەن و لە جێیەک دادەنیشن هەر کەسێک لە وتاردابێت بۆ ماوەیەک وتارەکەی رادەگرێت و پاش ئارام بوونەوە دەستی پێدەکاتەوە.

دەستەی لیباس هێن تا سەرەوەی مەجلیس دەچن و سینییەکە لە فەقێلە وەردەگرن و لەبەردەمی مامۆستای موجیز و دانیشتوانی ریزی یەکەم دایدەنێن، موجازیش لە سەفی دووەمدا دادەنیشێ و چەند کەسێک لە دۆست و ئاوەڵانی لەملاولایانی دادەنیشن.



رێ و رەسمی هێنانی بەرگی مەلایەتی



**وێنەیەکی دی لە هێنانی بەرگی ئیجازە وەرگرەکان**

ناو ئاخنی وتاری موجاز بە زۆری بریتی‌یە لە بەخێرهێنانی میوانان، دەربـڕینی ئەمەگناسی و پێزانین بۆ ئەو خەڵکەی خزمەت بە فەقێ دەکەن بەتایبەت خەڵکی ئەو دێیە یان ئەو گەڕەکە شارەی ئیجازەی تێدا وەردەگرێ، سوپاسکردن لە دایک و بابی و ئەو خزم و کەسانەی لە ماوەی خوێندندا یارمەتی‌یان داوە و هەروەها ڕێزدانان بۆ زانایانی ئایینی بە تێکرا و بەتایبەت بۆ ئەو مامۆستایانەی دەرسیان پێ‌گوتوە و ڕەنجیان دەگـەڵ کێشاوە و سپاس و دوعا بۆکردنیان و لە نێو وانـیش‌دا بـە خـسـووسی بـۆ مـامۆستای ئیجازەدەری. ئەمجار هەندێک سەرگوزەشتەی خۆی لەباری خوێندنەوە دەگێڕێتەوە و خۆی بە خەڵکەکە دەناسێنێ.



**وێنەیەکی تری هێنانی بەرگی موجاز**

بێجگە لە مامۆستای ئیجازەدەر ئەوانی تر وا هەیە تێکڕا باس و سپاسیان دەکات واش هەیە یەکەیەکە ناویان دە بات و ڕێزیان لێ‌دەگرێ و دوعای خێریان بۆ دەکات.

بەشدارانی دیکەی ئاهەنگ هەرکەس بە ئارەزووی خۆی مەبەستێک هەڵدەبژێرێ و لێیەوە دەدوێت، هەیانە باسی گەورەیی زانست و زانایان دەکات. هەندێکیان لەبارەی فەقێ و فەقێیەتی و بایەخی فەقێ و پێویستی خزمەتکردن و بە دیارەوە و بوونیان دەدوێن و خەڵک هاندەدەن کوڕەکانیان بنێرنە بەرخوێندنی فەقێیەتی. بازێکیان باسی وەزع و حاڵی ئێستا و رابردووی مسوڵمانان و بەرپرسایەتی خەڵک لەو بارەوە، دەکەن. بڕێک لەوان لە گێروگرفتە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵ و ڕێگاچارەیان قسە دەکەن. تاقمێکیان باسێکی رووحی و ئەخلاقی دێننە گۆڕی و...

پاش کۆتایی هاتنی وتاری موجاز و بەشدارانی دی نۆبەی وتاری مامۆستای ئیجازە دەردێت و لە لایەن بەڕێوەبەری بەرنامەوە بانگ دەکرێت. دەگەڵ هاتنی بۆ پشتی

دوانگە[١] هەموو بەشداران، یان لانیکەم ئەگەر کۆرەکە گەورە بێ ئەوانی دەورەی دوانگە لەبەری هەڵدەستن و بۆ دانیشتنەوەشی هەروا.[٢]

ئەرکی سەرەکی موجیز لە نۆبە دوانیدا خوێندنەوەی «ئیجازەنامە»یەکە بە زمانی عەرەبی نوسراوە و لە دوو بەش پێکهاتووە: بەشێکی پێشەکی یە و باس لەوە دەکات کە موجاز ماوەیەک لە لای من دەرسی خوێندووە و لە ژێر تاقیکاری و چاوەدێری مندابووە و ئێستاش داوای لێ کردووم ئیجازەی مەلایەتی پێ بدەم، منیش لەبەر ئەوەی بە فەقێیەکی لێهاتوو تێگەیشتوو پێ گەیشتووی دەزانم و پێموایە شیاوی مەلایەتی یە، ئەوا ئیجازەم پێدا کە بچێتە بەرگی مەلایەتی یەوە و بەو پێیە، دەرس بڵێتەوە، داوەری «قضاوت» بکـا، وەڵامی پرسیارە شەرعی یەکان بداتەوە، ئەوەی لە منی بیستووە، بەوە بەرچاوگرتنی پلەی بەهێزی و بێ هێزی بیگێڕێتەوە یان فتوای پێبدا. ئەگـەر مـوجیز پـێی وابـێ تـوانـای ئەنجامدانی هەمووی ئەو ئـەرکانەی نـییە؛ بـۆ بـەڕێوەبردنی چـەندیان تـێی رابـبینێ ئیجازەی پێ دەدات و واهەیە هـەندێک مـەرجـیشی بـۆ دیـاریدەکـات. ئـەو بـەشەی ئیجازەنامەکە دەبێ موجیز بە عەرەبی بینووسی و بیخوێنێتەوە. هەندێکیان بۆ حاڵیبوونی دانـیشتوان بـە کـوردیش تـەرجـەمەی دەکـەنەوە، بـەمشێوە کـە بـەر لە خـوێندنەوەی ئیجازەنامەکە وێڕای بەخێرهێنانی میوانان و سـپاسی خـەڵک، یـان ڕاگـەیاندنی هـەر مەبەستێکی هەیبێ، ئەو بەشە لە ئیجازەنامەکەش باسدەکات.

---

١-دوانگە: جێیەکی تایبەتی یە کە خوتبەی لە سەر ئەدرێ. (خاڵ) و وشەی دوانگەم لێرەدا لە جێی تریبون بەکارهێناوە.

٢-ئەو ڕێزە بۆ ماموٚستا پایەبەرزەکانی دیش هەیە.



**مامۆستای ئیجازەدەر وتاری پێش ئیجازەنامە پێشکەش دەکا**

لە بەشی دووەمی ئیجازەنامەکەدا، هاتووە کە بۆ خۆی لە لای کێ ئیجازەی وەرگرتووە و ئەمجاز موجیزەکەی و موجیزی موجیزەکەی و بەمشێوە زنجیرەی هەڵگرانی ئەو عیلم و زانیارییە تا دەگاتە خزمەت حەزرەتی پێغەمبەر-د- و جوبرائیل-س- و هەروەها بارەگای پیروزی خودای بێوێنە ﷻ و بەدیهێنەری هەموو بوونەوەر و زانیاری و زانایان، نوسراوە.



**مامۆستای ئیجازەدەر لە کۆتایی خوێندنەوەی ئیجازەنامەدایە**

## دەبەرکردنی بەرگ

بۆ دەبەرکردنی بەرگی مەلایەتی، لە لایەن ئەنجومەن یان بەڕێوەبەرەوە، دوو کە سی ڕێزدار دیاری دەکرێن؛ جا لە هەندێک جێیان بەرلەوەی موجاز وتار بدات بەرگەکەی دەبەر دەکرێت، لە هەندێک شوێنیش دەگەڵ وتاری مامۆستای ئیجازەدەر، لەو جێیەداکە ناوی ئیجازەوەرگر، دێنی و دەڵێت: «أجزته» واتە: ئیجازەم پێدا، موجاز و دوو کەسە دیاریکراوە کە هەڵدەستنە پێ و بەرگەکەی دەبەر دەکرێ و مێزەری لە سەر دەنێن و لە جێی خۆی دادەنیشێتەوە هەتا موجیز لە وتارەکەی و خوێندنەوەی ئیجازەنامە دەبێتەوە. هەر کە لێش بۆوە موجاز بەرەو پیری[1] دەچێت و ئیجازەنامەکەی بەدوو دەست لێوەردەگرێ و دەستی ماچ دەکات ئەمجار تێکرای بەشداران نۆبەبەنۆبە دێنە لای و

---

١ - پیر: پیشواز. (هەنبانە)

پیرۆزبایی پێدەڵێن و دەستی ماچدەکەن. هەندێک لە بەشداران دەستی موجیزیش ماچدەکەن و سپاس و ڕێزی خۆیانی پێشکەش دەکەن.



**چەند ماموستا بەرگی مەلایەتی دەکەنە بەر موجاز**

لەو دواییانەدا بۆەتە داب کە مامۆستاکانی بەشدار لە ئاهەنگدا ئەگەر ئاگاداری یان بەسەر موجازدا هەبێ و لە سەر داوای خۆی بنی ئیجازەنامەکەی بۆ ئیمزا و مۆردەکەن.[1]

١ -جاری واهەیە لەبەر نەبوونی ئیمکانات و هەل و مەرجی پێویست بۆ ئیجازەدان ئاهەنگی تایەبەتی پێکنایە و بەڵکوو بە پێکهێنانی دانیشتنێکی چکۆلە ئیجازەنامەکەی بەسەردا دەخوێندرێتەوە یان هەڵدەکەوێ بە بێهیچ کۆبوونەوەیەک ئیجازەنامەی دەدرێتە دەست و دەگەڵ چەند کەسێکیان ڕەوانەی ماڵ دەکرێتەوە.



**وێنەیەکی تر لە دەربەرکردنی بەرگی مەلایەتی و کۆڕی ئیجازە بەردەڕەشی بانە**

بەدەست ماچکردن و پیرۆزبایی پێ گوتنی موجاز رێ و رەسم و ئاهەنگی ئیجازەدانیش کۆتایی پێ دێت و هەرکەس بەرەو جێگا و شوێنی خۆی دەگەڕێتەوە. موجازیش ئەگەر فریاکەوێ هەر پاش ئاهەنگەکە دەنا رۆژی دواتر بەرەو ماڵ دەبێتەوە و بەمشێوە ئاواتی لە مێژینەی دایک و باب و کەس و کارانی وەدی دێنی، دڵی یاران خۆش و هی نەیاران بە پەرۆش دەکات.

جێگای باسە کە موجاز بە تەنێ یان هەر دەگەڵ کەسانی خۆی بەرەو ماڵ ناچێتەوە بەڵکوو کۆمەڵێکی زۆر لە فەقێ و مەلا و خەڵکی دەگەڵی دەچنەوە و شەوێک لە لای دەمێننەوە.

دەگەڵ نێزێکبوونەوەی موجاز و هاوڕێیەکانی لە ئاوەدانی خەڵک بەرەو پیریان دێ و دەستی موجاز ماچدەکەن و بەخێرهاتنی ئەوانی دی دەکەن و تێکڕا دەچنە ماڵی و پیرۆزبایی بە خۆی و کەس و کارەکانی دەڵێن.



**وێنەیەکی موجیز جەنابی حاجی ماموستا (مەلا محەممەد)ی بەردەڕەشی دەگەڵ موجازەکانی و باوکی یەکێک لەوان کە بۆ بیروەری گیراوە**

ئەگەر وەخت هەڵبگرێ و جەماعەت زۆربێ لە دێی موجازیش بە بەشداریهاتووەکان و خەڵکی ئاوەدانی ئاهەنگێک پێکدێ و خەرجی میوانداریش لە سەر ماڵی موجازییە و ئەگەر دەستتەنگیش بن خەڵکی ئاوە دانی یارمەتییان دەدات.

تا ئەو دواییانە باو بو لە کۆتایی ئاهەنگی ئیجازەوەرگرتندا یارمەتییەکی ماڵی لە لایەن بەشدارانەوە بۆ موجاز کۆدەکرایەوە و خەرجی ژنهێنان و ماڵدانانی دەکرد، بەڵان ماوەیەکە ئەو دابە نەماوە و زۆر بە کەمی وە بەرچاو دەکەوێ، بەڵکوو ئێستا کەسێک پێی خۆش بێ یارمەتی موجاز بدات بە دزیەوە یارمەتی خۆی بۆ دەنێرێت.



**قولێک فەقێ کە دەگەڵ موجاز چوونەوە / ئاوایی سێپێکان ـ سەردەشت**



وێنەیەک لە پەزیرایی کەس و کاری موجاز لە میوانەکانیان دوای گەڕاونەوە بۆ ئاوایی خۆیان (باینگانی پاوە)

هەڵدەکەوێ فەقێ ماوەیەک بەر لە ئیجازەوەرگرتن بە مەلایەتی لە دێیەک دادەمەزرێ و بەڵێنی‌یان پێ‌دەدات کە پاش ئیجازە وەرگرتن ببێت بە مەلایان، ئەوجۆرە فەقێیانە بەتایبەت ئەوەی ژنی هێنابێ یەکسەرە دەچێتە ئەو دێیە و دەست‌دەکا بەگەلاکۆی ماڵ پێکەوەنان.



بەشێک لە رێ و رەسمی ئیجازە وەرگرتن، لەگوندی «ئاسناوێ»ی شنۆ

برێک فەقێ بەرلەوەی‌تەنانەت بە پێی رەسمی ولاتیش‌خوێندن تەواو بکەن لە رووی عوزرێکی بەجێ‌یان، بە بێ‌عوزر، زەماوند دەکەن و خوێندنەکەیان بە ناتەواوی دێڵنەوە. یان ئەگەر ئیجازەش وەرگرن هەروەک پێویست نابنە مەلا. مەگەر کەسانێک زۆر زیرەک و تێکۆشەربن دەنا بە پێی «العلم مفقود بین فخذی المرأة»واتا زانین و خوێندن بە ژن‌هێنان لەناودەچێ‌زیانبار دەبن و لە ئاخیردا پەشیمان دەبنەوە.

ئەگەر فەقێ لە پێش ئیجازەوەرگرتن‌دا، ژنی هێنابێ دەنا پاش ئیجازە ـ چونکی ژن و ماڵیان گوتوە بەتایبەت بۆ مەلا کە خەڵ زۆری رو دە ماڵی دەکا ـ بە زوویی مشووری

ژنهێنان دەخوات و ئافرەتێکی کابان و کارامە دەدۆزێتەوە؛ جـا ئـەگـەر مـاڵی بـاوکی لەدەستیان بێ دەنا خەڵکی ئەو ئاوەدانیەی لێی دامەزراوە خەرجی و ئەرکی زەماوەندیدا وێنە ئەستۆی خۆیان و ژنەکەی بۆ دەگوێزنەوە.

## گەڕانەوە بەرە و فەقێیەتی

فـــەقێ‌ی وا بـووە پـاش ئـیجازەوەرگرتن ئـیشتیای چـۆتەوە سـەر خـوێندن و پێش‌ئەوەی ماڵ و منداڵی بە ملەوە بێت هەلی بۆ رەخساوە و ملی لە فەقێیەتی ناوەتەوە و ماوەیەکی دیکەی لە تەمەنی تەرخـانکردووە و چـە نـد زانسـت و پـەراوی دیکـەی‌کە نەیخوێندون یان باشیان فێرنەبووەلە لای باش مـە لایـان خـوێندون و ئـەمجار لە لای باشترینیان ئیجازەیەکی‌تری وەرگرتوە و بەوپێیە بووەتە خاوەنی دوو ئیجازەنامە.(١)

## ئیجازەنامە

ئەو بەڵگەیە لە جێی بڕوانامەی خـوێندن و شـەهادەی خـوێندەواری «مـدرک تحصیلی»یە. ئەما بڕوانامەیەکی کە هەر لە نێو خەڵک‌دا جـێی بـڕوایـە و ئـیتر لە لای خوێندنگە رەسمی و میریەکانەوە بە رەسمی ناناسرێ و بایەخی پێ‌نادرێت.

لێرەدا لەسەر ئیزنی خوێنەران بۆ پیرۆزی باسەکە و بۆ ئەوەش بە چاوی خۆیان ئیجازەنامە ببینن و باشتر پێی ئاشنا بین دەقی ئیجازەنامەی خۆم کە لە دێی نەلاس یەکێک لە شارەدێیەکانی سەر بە شاری سەردەشت لە سەردەستی زانای پایەبەرز و هەڵکەوتوو جەنابی مامۆستا مەلا مەحموودی واوی دەرسبێژ و پێشنوێژ و خوتبەخوێنی ئەو شارە

١ - بوون بە خاوەنی دوو یا چەند ئیجازەنامە بەم‌شێوەش دەبێ کە موجاز بە بێ‌ئەوە دەرسی‌تر بخوێنی، لە هەر مامۆستایەک پێی‌خۆش‌بێ بەو مەرجە کە ئەو مامۆستایە ئاگاداری بە سەری‌دا هەبێ، داوای ئیجازەنامە دەکا و ئەویش بۆی دەنووسێ و بۆشی مۆر دەکا.

دێیە، پێی سەربەرز بووم دەنووسمەوە:

«بسم‌اللەالرحمن الرحیم و بە نستعین. الحمد للە الذی جعلَ العلماء ورثة الانبیاء و المرسلین و نوّر قلوبهم بأشعة اسرار الیقین و أزاح عن قلوبهم صدءالشکوک و الشبهات و رفع بعضهم فوق بعض درجات و جعل لهم من لدنە سلطانا نصیرا و آتیهم الحکمة و من یؤت الحکمة فقد أوتی خیرا کثیرا و فتح علیهم ابواب کنوز المعانی و خزائن البیان و خصهم ببدائع الأیادی و روائع الاحسان. فصرفوا جهدهم کشف القناع عن کلامە بتفاسیر حسناء و ألهمهم اصول الشریعة الغراء و ایدبهم فروع الحنیفیة البیضاء. فیا من سجدت لعز جلالک جباه الاجرام العلویة و نطقت بشکر نوالک شفاه العوالم القدسیة صلّ افضل صلاتک علی أشرف مخلوقاتک الذی ارسلتە بالهدی و دین الحق بشیرا و نذیرا، سیدنا محمد المنور للافاق، بمقدمە الشریف تنویرا و علی آلە بروج فلک الهدایة و اساس اصول الدین و اصحابە الناطقین ببیان معانی الاحادیث البدیعة و المشیّدین لارکان العقائد الدینیە بأنحاء البراهین. بعد یقول العبد الفقیر الی اللە الغنی القدیر محمود الواوی ابن المغفور الملا محمد الواوی عفی عنهما الملک الهادی: ان لواء قدر العلم مرفوع لایوضع و أساس عزە موضوع لاینزع. من اعتصم و تمسک بە فلا یضل و لایشقی و من اعرض عنە ففی خزی الدنیا و الاخرة یبقی و قد تظاهرت الایات و الاحادیث فیە اکثر من ان تحصی و لشهرتها ففی البحث عنها غِنیُ.

و انّ ممن اهتدی بهدایة العلم الی الصعود فی مدارج هذە المرتبە و طلعت علیە نجوم السعادة من أفق الدرایة و اصلا الی هذە المنقبة حامل هذە الوثیقة و ناقل هذە النمیقة الفاضل الجامع من فوائد موائد المعقول و المنقول ذو النسب الطاهر و الحسب الفاخر الملا سید مصطفی ابن السید عبدالکریم الزمزیرانی اوصلە اللە الی مایتمناە و وفقە لما یحبە ویرضاە. و هو قد بذل شطراً من أیام دهرە و صرف معظم ریعان عمرە نحو اقتناء شوارد العلوم و اجتناء فوائد

الرسوم و شمّر عن ساق الجد لاحراز الفنون و جاب مفاوز الشدائد للوصول الى السر المكنون و لازم مجلس اءفادتنا برهة من الزمان و اشتغل فيها بقرائة المعقول و المنقول من الفـروع و الاصول و عرج معارج التحقيق و التدقيق. ثم استجازنی فی تدريس العلوم و نشر الرسوم. علما منه بان هذه الامة قد خصت ببقاء الاسناد و انه طريقة الامجاد و به يصعد الى اوج الكمال و يرتقى الى مقام العلماء الابطال. فسارعت الى سؤاله و بادرت الى تحقيق آماله؛ و ان لم أكن أهلا لذلک رجاء الانتظام فی سلک العلماء و الاءلحاق بالسلف من الفضلاء فأجزته بتدريس فوائد الفروع و الاصول و بسط موائد المنقول و المعقول. كما اجازنی بذلک؛ الذی فاق على اهـل زمانه و سما على أقرانه و انتشر صيته فی الافاق و وقع على سعة علمه و صحة استنباطه الاتفاق و قصده الافاضل من كل فج عميق و صعدوا بملازمته فی مدة يسيرة سماء التحقيق؛ الفاضل العالم العامل خير الحاج حاجی ماموستا ملامحمد المدرس المحترم فی قرية «گلالة» العراق. عفى عنه الملک السامی و هو عن شيخه صاحب التحريرات الرائقة و المولفات الفاضلة الفائقة العالم العامل و البحر الكامل جامع علمی الظاهر و الباطن استادنا و مولانا الشيخ عمر المعروف بابن القرەداغی. أفاض الله عيله غفرانه و اسكنه بحبوحة جنانه و هو عن شيخه و والده العالم الكامل جامع علمی الظاهر و الباطن العارف بالله الشيخ محمدامين القرەداغی قدس اللەسرەو هو عن كاشف حقايق العلوم برأيه الصائب و دقائق الرسوم بفكره الثاقب، شيخه العلامة المحقق الشيخ نجيب القرەداغی أفاض الله عليهما شآبيب الغفران و امطر عـليهما هـواطـل الآلاء و الاحسان. عن سيد المحققين و سندالمدققين الشيخ حسن القرەداغی عن امام الأُفاق بالاتفاق مفتی العراق مولانا محمد الزهاوی. عن غِطريف المتأخرين و اكمل المتبحرين ذی التأليفات المفيدة مولانا محمد الشهير بابن الرسول الساوجبلاغی.

عن الامام العالم العامل و البـحر الكـامل مـلامحمد صـالح التـلنباری. عـن مـولانا

محمدصالح الحیدری. عن والده المحقق الجلیل مولانا اسماعیل.

عن العلامة المحقق صبغة الله افندی الحیدری. عن والده مولانا ابراهیم. عن والده مولانا حیدر. عن والده ذی التصنیفات الفائقه و التألیفات الرائقة احمدبن حیدر. عن والده حیدر الاول. عن والده مولانا زین‌الدین الکردی البلاتی. عن نصرالله الخلخالی. عن خواجه جمال الدین محمود الکشکناری الشیرازی. عن المحقق المدقق مولانا جلال الدین الدوانی. عن والده سعدالدین محمدصدیق الدوانی. عن محی‌الدین الکشکناری و هما عن استاذ البشر العقل الحادی عشر السید الشریف الجرجانی. عن المولی مبارک شاه البخاری. عن المولی المحقق قطب الدین الرازی. عن المولی العلامة الشیرازی. عن المولی عمر الکاتبی القزوینی. عن الامام الهمام حجة الاسلام و مقتدی الانام فخرالدین الرازی. عن الامام حجة الاسلام محمدبن محمدالغزالی. عن ابی المعالی امام الحرمین عبدالملک بن عبدالله بن یوسف الجوینی. عن الشیخ ابی‌طالب المکی و هو أخذ الانابة و الاءرادة ولبس الخرقة عن أبی عثمان المغربی. عن ابی عمرو الزجاج. عن سلطان الحقیقة والیقین سید الطائفتین ابی القاسم جنید البغدادی. عن الشیخ ابی الحسن السری السقطی. عن تاج الاولیاء الشیخ معروف الکرخی. عن الشیخ أبی سلیم داوود الطائی. عن الشیخ حبیب العجمی. عن الشیخ، حسن البصری‌قدس الله ارواحهم الزکیة و نفعنا ببرکاتهم البهیةعن حضرة الامام الهمام و اللیث المقدام یعسوب الموحدین بدر العارفین الشارب من کأس الیقین باب مدینة العلوم علی بن ابی طالب القرشی الهاشمی‌کرم الله وجهه‌و هوعن حضرة درة صدفة الوجود صاحب المقام المحمود و اللواء المعقود سید سادات العرب و العجم امام طیبة والحرم خلیفة الله الاعظم و سرسجود الاملاک لآدم واسطة عقد المرسلین سید الخلائق اجمعین سیدنا و شفیعنا و ملاذنا حضرة محمد المصطفی‌صلی‌الله‌علیه و سلم و شرف و کرم‌و هو عن معبودأ هل السموات و الارضین عزوجل

بواسطة الامين الممتاز بين الملائكة المقربين جبريل عليه‌السلام.

أوصيک ايها الاخ الحبيب بتقوى الله و طاعته و لزوم أوامره و اجتناب نواهيه و كثرة مخافته في السر و الاءعلان والجهد في تدريس العلوم بكمال الاتقان و في افادة الطالبين و تعليم احكام الدين للمسلمين و كثرة المطالعة بالتحقيقات و التدقيقات و عدم الاكتفاء بظواهر العبارات لئلاتكون من الذين يكتفون بالخضاب عن الشباب و يستغنون بترائی السراب عن التروی بالشراب و فقنا الله و اياک لما يحبه و يرضاه و اوصلک الی ماتتمناه بجاه سيد المرسلين و آله و صحبه الطاهرين و سائر المقربين صلى‌الله عليه و سلم و عليهم اجمعين الى يوم الدين و آخر دعوانا ان الحمدلله رب العالمين.

انا الحقير المجيز خادم العلماء الاعلام محمود ابن ملا محمد الواوی عفی الله عنهماالساكن و المدرس فی قرية نلاس سنة ١٤٠٤ المطابق ١٣٦٢/٨/٥

امضاء محمود واوی

امضاء سيد محمد ابوبكری ربط.

امضاء عبدالرحمن رحمانی كاژه.

امضاء محمدعلی محمودی خانقاه سردشت.

امضاء محمد العزيزی البردەرشی.

امضاء احمد شريعتی دارالسلام سردشت.

امضاء محمد مروتی بيوران عليا.

امضاء محمد عظيمی جامع سردشت.

امضاء نجم‌الدين حكمتی مراغان.

امضاء احمد حسين‌پور مسجد خليفه سردشت.



**قۆلێک فەقێی سەردەشتی و بانەیی لە کاتی سەیاحەتدا**

**ئاوایی واوان ـ سەردەشت**

## حوجرەکەم

ئەی گلێنەی هەر دوو چاوم حوجرەکەم
هێزی ئەژنۆم و هەناوم حوجرەکەم
ئەی هەوێنی سەروەریم و غیرەتم
هەر لە تۆیە ڕێز و ناوم حوجرەکەم
تۆ مەکۆی زانست و دین و فێرگەمی
تۆم نەبی، بێدەست و چاوم حوجرەکەم
تۆ لە جێی زانستگەمی مێژوو دەڵێ:
تۆ نەجاتت دام لە داوم حوجرەکەم

تـــۆ دژی هــەر نــاحەزێکی ئــەم گــەلەی
بــوویتە ســەنگەر، جـێگە راوم‌حـوجرەکـەم
هـــەر لە تـــۆڕایــە کــە مــێژوو دەس‌پــڕە
لەو حـــــەماسانەی رووداوم حـــوجرەکـــەم
ڕێـــــــبەران و پـــێشەوایـــــانی گـــــەلم
کـــاری تـۆ بـوون، وەک بـزاوم حـوجرەکـەم
زۆر دەمـــێکە هـــــاوبەشین و بـــێ‌بەشین
وەرگـــــری مـــافی خـــوراوم حـــوجرەکـــەم
هــەروەکـــوو دایک لە کــۆشت گــەرم و گــوڕ
پــەروەرانــدت مـێشکی خـاوم حـوجرەکـەم
نـــــەیەزانـــــدین تـــــاڵ و تــفتی رۆژگـــار
مــن بــە رەنـجی تـۆیە مـاوم حـوجرەکـەم
تــــا ئــــەبەد مــەمنوونی تـــۆم و چـــاوەدێر
گــەر بــە ئــامیزت گــیّڕاوم حـــوجرەکـــەم
هــــەر دوو لامــان بــێ بــژیو رامــانبووارد
وەک هــەتیوی بــەر هــەتاوم حـوجرەکـەم
تــۆ لە فــەڕش و مـافووران بـێ بـەش کـرای
مــن لە تـێشوو و نـان و ئـاوم حـوجرەکـەم
تــۆ، کــە نــیتە خشــتی سـوور و بـانی قـیل
مــن بــە بـێ‌بەرگ و پـێلاوم حـــوجرەکـەم
تــۆ، کــە نــیتە پــەنجەرە و دەرکـــی لەبــار
مــن وەبــەر دەرکــان خـراوم حـوجرەکـەم
نــیتە ئــەندازیــار بــڕێژێ نــەخشەکــەت
مـــــن لە «تــــاقی» دابـــڕاوم حـــوجرەکـــەم

تۆ بێدەرک و بەر بێلایی و حەوشی چاک
من بێماڵی هەور و ساوم حوجرەکەم
هێندی ئەو سینگەی لە دیوارت دران
وا بە تیری خەم پێکاوم حوجرەکەم
بارتەقای رێژنەی دڵۆپەی میچەکەت
ئاوی ئەسرین دێ لە چاوم حوجرەکەم
هەروەکوو قەڵشی دیوار و بانی تۆ
لەت لەتە، جەرگ و هەناوم حوجرەکەم
خۆ، لە سایەی هەوڵ و تێکۆشانی تۆ
وا گزینگی دا هەتاوم حوجرەکەم
وا دیارە، وردە وردە لێکدەبین
بۆیە خەمگین داگراوم حوجرەکەم
من بەڵێنت پێدەدەم ئەی ماکی بیر
هەر لەبیرمی، تاکوو ماوم حوجرەکەم
گەر شیاوی مامۆستاییشم نەبێ
پێت دەبەخشم نان و ئاوم حوجرەکەم
تا، نەفەوتێ بارەدان و کۆششت
بۆت دەنێرم تازە لاوم حوجرەکەم
وا بەهیوام، هەر دەگەڵ تۆ تاکوو سەر
تێپەرێنم عومری ماوم حوجرەکەم



ماموستا و فەقێی «قارنێ»ی نەغەدە



دەستەیەک مەلا و فەقێی شکاک لە حوجرەی مزگەوتی سووری سابلاغ



وێنەی مامۆستا و موستەعید و سوختەکانی ئاوایی مەحموودئاوای بۆکان

## دوا وتە

برا و خۆشکە ئازیزەکانم ئەوە بوو هێندێک سەبارەت بە ژیان و بەسەرهاتی فەقێ خۆشەویستەکان دەگەڵ ئێوەی هێژا و هۆگری راستی دوام و رێ و رەسمی فەقێیەتیم تا رادەیەک بۆ شیکردنەوە و بە یەکەوە لە سەرەتای دەستپێکردنی خوێندنەوە بە هەوراز و نشێوەکانی سوختایەتی و موستەعیدایەتیدا تێپەڕ بووین تا گەیشتینە کۆتایی خوێندن و وەرگرتنی شەهادە و باوەڕنامەی خوێندن «ئیجازەنامە» و بڕێک لە کەند و کۆسپەکانی ئەو رێگایەمان خستە روو و چاوێکمان بە پەڕاوی فەقێیەتیدا خشاند و کەمێکمان هەوای تێکەڵاو بە بوون و بەرامەی گوڵی گوڵستانی حوجرە، ئەو خوێندنگە بە پێز و بێ نازە هەڵمژی.

بەڵام دەبێ ئەوەش بگوترێ: ئەوەی لەو کورتەباسەدا خستمە روو رێ و شوێنی فەقێیەتی هەموو هەرێمەکانی کوردستانی رۆژهەڵاتە وەکوو ناوچەکانی شنۆ، لاجان

سەردەشت، ورمێ، سابلاغ، بانە، سەقز و بۆکان و دیواندەرە و سنە، کە بۆ خۆم لە هەندێکیان وەکی سەردەشت، سابلاغ، بانە، ورمێ، دیواندەرە و سنە، فەقێیەتیم کردووە و بۆ هەندێکیشیان وەک ماکۆ، خۆیە، سەلماس نەغەدە، لاجان، شنۆ، سەقز، میاندواو، بۆکان،کرماشان، رەوانسەر، جوانرۆ و پاوە بە سەفەرچووم و چاوم بە فەقێ و حوجرەکان کەوتووە کە لە هەمووی ئەو مەڵبەندانەدا رێ و رەسمی فەقێیەتی یەک شێوەیە و جیاوازییەکی بەرچاو، نابیندرێت.

دەمێنێتەوە بڕێک لە شار و ناوچەکانی وەک: تیکاب، شاهین دژ، مەریوان، کامیاران، نەوسوود و قەسری شیرین و هەندێک شوێنی دی کە رێگام تێیان نەکەوتوە؛ بەڵان پێموانییە رێ و رەسمی فەقێیەتی ئەو جێیانەش دەگەڵ ئەوانی تر تۆفیرێکی چەندانی هەبێت.

ئەوە لەبارەی بەشە کوردستانی سەر بە ئێرانەوە، ئەما لە بەشەکانی تری سەر بە تورکیا و سوریا و روسیا و عەراق وەک پێویست ئاگاداریمان نییە و یەکەباری خۆم هەلی چونیانم بۆ نەرەخساوە. هەرچەند بە پێی پرسیار و گوتەی ئەوانەی هاموشۆیان بووە وا دەردەکەوێ کە فەقێ و فەقێیەتی ئەو بەشانەش هەروەک کوردستانی رۆژهەلات وابێت، بەتایبەت کوردستانی عەراق کە هەتا بیست سی ساڵ لەمەوبەر بە ئازادی هاتوچۆی بۆ کراوە و فەقێی ئێرە لەوێ خوێندویانە و هی ئەوێ هاتونەتە ئێرە و هەردووک لایان وا هەبووە بە سەردانیش نەگەڕاونەوە و هەتا ئیجازەوەرگرتن هەر ماونەتەوە، تەنانەت فەقێی وا هەبووە هێندە ماوەتەوە کە پاش گەڕانەوەی لە لایەن کەس و کاریەوە نەناسراوەتەوە.

## فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستانی عیراق

بە خۆشی‌یەوە بۆ ئاگاداری زیاتر لە داب و نەریتی فەقێیەتی لەکوردستانی عەراق کتێبێکم دەستکەوت بەناوی «ژیانی دێهاتی» نوسراوی «محەمەد روشدی دزەیی

عەوێنەیی»[١] کە بڕێک داب و نەریت و مەسەلە کۆمەڵایەتی یەکانی کوردەواری کوردستانی عەراق باسدەکات و باسێکیشی لە ژێر سەردێر «قوتابیانی ئایینی و زانستی لە دێهاتەکان»دا نووسیوە و منیش بۆ خوێنەری بەڕێزی هەڵدەگوێزم و بێ کەم و زیاد دەیگێڕمەوە:

## قوتابیانی ئایین و زانستی لە دێهاتەکان

«لە دەوری رابردوو کە ئیسلامی یەت پەیدابوو تا ساڵی (١٩٥٨) لە دێهاتەکان خوێندنی ئایین و زانستی بەم جۆرە بووە کە لە ژێرەوە نوسراوە:

لە زۆر دێهاتەکان قوتابخانە و مامۆستا و قوتابی ئایین و زانستی تێداهەبووە، بەڵام مامۆستایەکانیش دوو چین بوون:

١ـ ئەوەی کە لە شوێن ئایین و زانستی و رۆشەنبیری شار بە شار، گوند بە گوند کە زۆر گەرا بوو، وە بە برسێتی و رووتی، شەو و رۆژ هەر تێکوشی کردبوو، وە خۆی زۆر ماندیکردبوو، تا ماوەی (٢٥ـ٣٠ـ٤٠) ساڵانە تا (١٢) عیلمی تەواودەکرد، ئینجا ئەبوو بە زانایەکی زۆر چاک و زۆرزان، ئەوسا پێی ئەگوترا مەلای (١٢) عیلم.

٢ـ ئەو کەسانەی کەمیان خوێندبوو، وە خۆیان ماندوو نەکردبوو لە شوێن ئایین و زانستی و رۆشنبیری ئەوجۆرە کەسانە پییان ئەگوترا (کولکەمەلا) کەمزان.»

## چۆن فێرە خوێندن ئەبوون؟

کەسێک بیویستبایە، کوڕی خۆی فێرە خوێندن بکردایە، کورەکەی کە تەمەنی گەیشتبایە (٧ـ٨) ساڵان، ئەیبردە لای مامۆستای گوندی (ئاوایی)، وە یا خود ئەیبرد بۆ لای یەکێک لە قوتابیانی مامۆستای گەورە. ئەویش سیپارە و ئەلف و با و نوێژ و قورئان خوێندنی فێرئەکرد. لە پاشان چەند کتێبێکی بچکوڵەی ئەخوێند؛ وەکو: (جرمبخش، باغبان، ناگهان، اسماعیلنامە، ایشدە و ئەحمەدی).»

---

١ ـ عەوێنە گوندێکە سەر بە شاری هەولێری عەراق.

لە پاش ئەمانەش چەندسالاّن کتێبی (صرف و نحو)ی ئەخوێند، وەکو: (عوامل، النموذج، سعدالله- ی گەورە و گچکە، مراح، اظهار، شرح المغنی، فتح‌القریب، فتح المعین، جامی، فناری).»

ئینجا لە پاش ئەمانەش ئەو عیلمانەیان ئەخوێند وەکوو: (ئایین منطق، فلکیات، هیأت، کلام، بیان، بدیع) کتێبەکانیش ئەمانەن: (انوار- ی مەزن‌البخاری‌استعارە، السیوطی، گلنبوی آداب، اسطرلاب، شرح چقمینی، قاضی و لاری و چەند کتێبیکەشی ئەخوێند، ئینجا ئەبوو بە مامۆستای (١٢) عیلم و تەمەنیشی ئەگەیشت بە (٣٠-٤٠) سالاّن، ئەوسا لە گوندێک ئەبوو بە مامۆستا و لە پاشا ژنەکی ئەهێنا کوڕیان ئەبوو ناویان لێ‌ئەنا (عبدالله). ئەگەر کچ بایە ناویان لێ‌ئەنا (ئامینە) چونکی پێغەمبەر (محمد)-د- ناوی باوکی عبدالله بووە و ناوی داکی ئامینە بووە.»

**قوتابیەکان لە لای کێ دەرسیان ئەخوێند؟**

ئەو قوتابیانەی کە لە کتێبی جامی هەورازتریان بخوێندبایە پێیان ئەگوترا (موستەعید)؛ ئەمانە مامۆستای گەورە دەرسی پێ‌دەگوتن.

بەلاّم ئەمانەی لە کتێبی جامی بەرەو خوارتر بایە پێیان ئەگوترا (سوختە). ئەمانە موستەعیدەکان دەرسیان پێ‌دەگوتن و لە هەفتەی (٥) دەرسیان دەخوێند، ئەویش ئەگەر دەرسیان نەچوبایە. چونکە لە هەفتەی (٢) ڕۆژان حەسانەوە بوو: (هەینی و سێ‌شەمان).»

**گوزەران کردنیان لە سەر کێ بوو**

گوزەرانی مامۆستای گەورە لەگەڵ قوتابیەکان گشتی لەسەر دانیشتوانی دێهاتەکان بوون. وەکوو خواردن و شەکر و چاو نەفت و بەرگ و کتێبەکانیان. ئەوکاتی میری یارمەتی نەئەدان. لەبەر ئەمە لە هەندە جێگایان گوزەرانیان زۆرباش بوو. لە هەندە جێگایانیش گوزەرانیان باش نەبوو. لەگەڵ ئەمەش شەو و ڕۆژ خەریکی خوێندن بوون بۆ ئەمەی بۆ

پاشە رۆژ ببن بە زانایەکی زۆرزان و گەورە کە بتوانن خزمەتی میللەتەکەی خۆیان بکەن و سودیان لێوەربگیرێت و رۆشەنبیری بڵاو بکەنەوە.»

ئینجا ئەو کاتی مامۆستای زۆر گەورەیان لێ هەڵئەکەوت و ئێستاکەش هەر ئەوانن رۆژی هەینیان لە مزگەوتەکان لە سەر میمبەرەکان وتاری ئایین و رێگای چاک نیشان ئەدەن و بەسەر دانیشتوە نوێژکەرەکاندا ئەخوێننەوە و هەر ئەمانەن کە گشت رۆژی لە ئیستگە گوێتان لە وتاری ئایینی و زانستی و ئاخافتنی بە سودیان ئەبێ کە بڵاوی ئەکەنەوە بە سەر ئادەمیزاد و زۆریشیان لە قوتابخانەی میری دامەزراون و کراون بە مامۆستای ئایین و زوبانی عەرەبی.»

بەڵام بەداخەوە ئەوجۆرە قوتابیانە لەساڵی (١٩٥٨) بەدواوە لە دێهاتەکان و شارەکان نەمان و هەر کەس روویان لە قوتابخانەی میری کرد، تەنیا مامۆستای گەورە لە دێهاتەکان مانەوە بە بێ‌قوتابی و بە بێ یارمەتی‌دانی میری تا ساڵی (١٩٧٨) لەو کاتی میری چاکیەکی زۆر گەورەی کرد کە موچەی بۆ مامۆستایەکانی شار و دێهاتەکان بریەوە. ئینجا لە گشت دێهات و شارەکان مامۆستای دامەزراندن بەڵام بە بێ‌قوتابی و بە بێ‌دەرس‌گوتنەوە.

بەداخەوە ئەمانە وەکوو دیمەنی دارێکی زۆر بڵند و سەوز و بێ‌بەربێ وانە. وابزانم ئەو چینە مامۆستایە گەورانە خوانەکردە نەمێنن چینەکی تر نییە لە دواوە کە جێگای ئەمانە بگرنەوە، ئەوسا هێدی هێدی ئایین و زانست و رۆشەنبیریش نامێنێ، ئادەمیزادیش روو لە بێ‌ئایینی ئەکات، هەروەکوو ئێستا رویان تێکردووە».[1]

---

١ ـ ئەوەی لە قەڵەمی ئەو نوسەرە خوێندتانەوە سیاسەت و پیلانی گڵاوی رژێمە دژ بە دینەکانی ئەم دوایی‌یانەی عەراق بوو کە وایان‌کرد حوجرە و خوێندنی فەقێیەتی نەمێنی تا پاش لەناوچوونی ئەو چینە مەلایە، کەس لە گورێ نەبێ بە تەواوی لە دین شارەزا بێ و بانگەوازی بۆ بکا ئەوسا بە ماوەیەکی کەم و زۆر سەهل خەڵک لە دین وەرگێرن و بە ئارەزوی خۆیان بەملاولادا هەڵی‌سورێنن و بیان‌چەوسێننەوە. تەنانەت مزگەوتەکانیشیان هەموو روخاندن و قورئانەکانیان ئاگر تێ‌بەردان. بەڵام بە خۆشی‌یەوە دوای راپەرینە مەزنەکەی (١٩٩١) و رزگاربوونی خەڵک لە چنگی رژێمی بەعس رێگا بۆ تێکوشانی مسوڵمانان ئاوەڵا بۆوە و ئێستێ لە سایەی رەحمی خواوە دین لە گەشەکردن‌دایە و هەر بەو پێیەش فەقێ پەیدابوونەوە و لە زۆر دێ و ⇦

با ئەوەش بلّیین کە ژیان و ژیواری فەقێیەکان لە شار و دێهات وێڕای ژیانی خەڵک لە هەندێک بارانەوە گۆرانی تێدا پێکهاتووە، بەتایبەت شتومەک و کەل و پەلی خوێندن گۆرانی زۆر بە سەرداهاتووە و شتوومەک و ئامرازی فەقێی ئێستا لە هی فەقێی رابردوو هەم زۆرترە و هەم باشتر.

## کەرەسەی نووسین

سەردەمێک کە ئامرازی لە چاپدان و بە گشتی چاپەمەنی زۆرکەم و نایاب بووە و ئەوەندی بووشە لە ریشەی وان نەکشاوە؛ فەقێکان زۆر بە چەتوونی توانیویانە تەنانەت بۆ دەرس لێ خوێندنیش کتێب پەیدا بکەن. زۆربەی کات کە فەقێ پێویستی بە کتێبێک بووە نەک تەنیا هی لە چاپدراوی دەستنەکەوتووە، بەڵکوو چەندناوچەشی پشکنیون تا دەستنوسێکی بە ئەمانەت وەرگرتووە، جا ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆر وییاندابێت تێی رابخوێنێت دەنا ناچار بووە بە پەلە، لە رووی بنوسێتەوە و ئەمجار تێی رابخوێنێت.[1]

---

⇦ شارەکان مزگەوت و حوجرە دروستکراونەوە و خەڵک بە گەرمی بەرەو مزگەوت دەعوەتکەرانی دینی دەچن.

١ - کتێبێک کە بە ئەمانەت درابێ یان بدرێ پێویستە وەک هەموو ئەمانەتێک ئاگاداری لێبکرێ و بپارێزرێت. ئەما خاوەنکتێبەکان بە زۆری سێ مەرجیان بۆ بە ئەمانەت وەرگرەکان داناوە کە لەم دێرە شیعرە فارسییەدا گونجاون:

«کتابت می‌دهم اما به سه شرط — که بوق و سوق و صندوقش نسازی»

واتە کتێبت وێ دەدەم بەلّام بە سێ مەرج: یەکەم: کتێبە کە نەکەی بە «بوق» یانی نەیکەی بە سینگناڵ و فوی بە پەرەکانداکەی و فیقەی لێبینی.

دووەم ئەوەیە نەیکەی بە «سوق» واتا نەیکەی بە بازار و لە مەیدانێ و بەرپێیان فرێیبدەی و بیێتە پێگە و هاموشۆی بەسەردا بکرێت.

سێیەمیش ئەوەیە نەیکەی بە «صندوق» واتا نەچی قاقەز و شتیتری لە نێو باوێژی و بەمشێوە خەرای کەی.

لەوبارەوە چوار تاکە شێعری عەرەبیش هەیە کە دوانیان بە زمانی خاوەن کتێب و دوانەکەیتریش بە زمانی ئەو کەسەوە کە کتێب وەردەگرێ گوتراون بەمشێوە: خاوەنکتێب دەڵێ:

الا یا مستعیر الکتب دعنی — فان اعارة المعشوق عار
فمعشوقی من الدنیا کتابی — و هل ابصرت معشوقا یعار

هــەروەها بــۆ نــوسینە وەش کــەل و پــەل زۆرکــەم بــووە، قــاقەز هــەر زۆر بــە کــەمی دەستکەوتووە، قەڵەم و مەرەکەبیش بە زۆری دەستکردی خودی مەلا و فەقێیەکان بووە؛ قەڵەمیان لە قامیشێکی تایبەتی داتاشیوە و مەرەکەبیشیان لە تێکەڵکــردنی چــەند شت دروستکردوە.

ئەوکەل و پەل وکەرەسەی مەرەکەبی لێسازکراوە لە نێو تاکە شێعرێکی فارسیدا نێویانبراوە. شێعرەکە دەڵێت:

همسنگ دوده زاج است همسنگ هر دو مــازو

همسنگ هر سه صمغ است وانگه به زور بازو

واتا بۆ سازکردنی مەرەکە و رادەیەک «دودە» یانی دوکەڵی چرای نەوتی ئــامادە دەکرێت و بە کێشەی ئەو دوکەڵەش زاخــی تــێکەڵ دەکــرێت و بــە کــێشەی دوکــەڵ و زاخەکەش مازوی سوتاو و بە خەڵووز بووی دەگەڵ دەکرێ و بە کــێشەی هــەر ســێک لەمانەش جەویی داری دەگەڵ لێکدەدرێت و ئەمجار بە هێزی پیل و شانان لە دەسک و ئاونگان رادەکوترێت و رادە شلەقێنری تاکوو زۆر بە چاکی ورد دەبێ و لێکدەدرێت.

ئینجا دوای ئەو پێکهەڵکێشان و تێکەڵاوکردن وکوتان و وردکردن و راشڵەقاندنە بە ئاو گیراوەتەوە و لە جیاتی مەرەکەب کەڵکی لێوەرگیراوە.

ئەما ئێستاکە، زۆرێک لە کتێبەکان لە چاپدراون و پــێنوس و لێــنوس زۆرن و مەرکەبیش‌بە لێشاوە و هەر پیاوی دەوێ بنوسێ و بنوسێتەوە و ئیتر لەسەر ئەمانە پەک ناکەوێت.

## داخ وکەسەر یان چارەسەر؟!

دەبێ بڵێم، تەنیا شتێک کە زۆر جێی داخ وکەسەرە و لە کۆنەوە وەهەر ماوەتەوە و سەد مەخابن کە من ئەوانەی لەبیری چارەکردنیدابن‌و رێ و شوێنی فەقێیەتی ناحەز و

⇦ کتێب وەرگریش لە وەڵامدا دەڵێ:

فلا تمنع کتابا یستعار — فان البخل للانسان عار

الم تسمع حدیثا من رواة — جزاء البخل عندالله نار؟

چەتوون کردووە و بۆ مسوڵمانانی راستەقینە، دڵتەزێن و شوورەیی هێنە و هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە؛ شێوەی ژین و بەرێچونی فەقێکانە و دەرکا و دەرکی نێومالانە.

هەر بە راستی ئەگەر بۆ وەختی خۆشی رەسمێکی جوان بوبێ یان لە رووی ناچاریەوە پێداروێین بۆ ئێستێ کە شێوەی ژیانی خەڵک زۆر گۆڕاوە و کۆمەڵ پەرەیستاندووە و نەیار و ناحەزان لە رێی دینەوەی هەڵە و پەڵەیەکن و تەنانەت گەلێک دۆستانی ناحاڵیش هاریکارییان دەکەن و ئامادەی تێگرتنی توانج و پلار و تەشەرن؛ ئەمشێوە بەرێچوونە کوێی بە کەڵکدێ؟ کوا رەوای هەقە فەقێی بەستەزمان بۆ پەیداکردنی بژیو، هەموو شەو و رۆژێک دووسێ جار نێو ئاوەدانی وە تەقێنی و سەردە هەموو ماڵێک هەڵکا و بە شەرمەوە دەست بۆ ئەم و ئەو رادێرێ؛ هەبێ و نەبێ، بیدرێتی و نەیدرێتی، سپی بێ و بۆربێ سارد بێ و گەرم بێ، رەق بێ و نەرم بێ نەوێرێ دەنگبکا و بە هەموان هەر بڵێ: بە زیاد بێ و خوا جەزات بداتەوە.

ئایا ئەو شێوە ژیانە بە دەرد و ژانە زۆرکەس لە فەقێیەتی ناتۆرێنێ و دەستی پێلە خوێندن هەڵناگرێ؟ بەتایبەت بە سوختەی بێچارەکە تازە لەکۆشی بە پەرۆشی پڕ لە ناز و نیازی دایکی هاتۆتە دەرێ و لێی هەڵبڕاوە؟

راستەخوێنەری ئازیز لەوەیدا لەگەڵتام و دەزانم زۆر فەقێی بە وەج و لە خۆ بوردوو هەن کە چاو لەو جۆرە شوورەیی و ئازارانە دەقووچێنن و قۆلی پیاوەتی هەڵدەماڵن و بە ئامانجی فێربوونی دین و خزمەتکردن بەگەل و ئایین؛ ئامادەن لە هەموو خۆشییەک دەستهەڵگرن و دەگەڵ هەمووکەند و کلۆیەکی سەر رێگایان بەربەرەکانی بکەن و تا ئاخرەمین، پیت و وشە درێژە بە خوێندن بدەن. بەلام ئایا ئەوجۆرە ژیانە کارناکاتە سەر رووح و دەرونیان و شوێنی خراپیان لە سەر دانانێت و لە زاتو ورەیان کەم ناکاتەوە؟ بێگومان، با. چونکی مرۆڤلە کەش و هەوایەکی ئاواداگەورە بێت و بە چاوی چاو لەدەست لێی بڕواندرێ شک لەوەدا نییە دەژاکێ و هەڵدانێکی سروشتی نابێت و ئەوەی دەبوو لە دەستی بێ لە دەستی دەچێ.

بەڵێ چۆنیەتی ژین و بەرێچونی فەقێ هەر لە سەرەتاوە تاکۆتایی، کار لە سەر دەر و دەروونی دەکات و بەرەو بێدەستی و زەبونی دەبات.

حاشا لەوە ناکرێ کە برین و شوێنەواری سەر جەستەی مرۆڤ دەرمـانکردن و سارێژ بوونە وەی هاسان و چابوونەوەی بێگومانە؛ بەڵان برین و کە لە بەرێک کە لە دڵ و گیان و دەروونی‌دا بـەدی‌دێت‌ئەویش بـرینێک کـە بـۆ مـاوەیەکـی زۆر هـەموو رۆژێ یەکدوجار بکولێتەوە وچ دەرمانێکیشی بۆ نەدۆزرێتەوە، هیوای چابوونەوەی لێ‌ناکرێ و کاری خۆی دەکا.

جا بۆیە دەڵێم ئەرکێکی ئیسلامی و ئینسانی هەموو پیاو و ژنێکی مسوڵمانەمادام بە خەم دینەوەیە و دەیهەوێ ئایینی پیرۆزی ئیسلام گـەشە بکـات‌لە هـەر شـوێنێک و هەرچۆنێک دەژیت، بە پێ‌ی توانا و دەستروێشتن بۆ گۆرینی باری نالەباری ژیانی بـە ژانی فەقێیان، هەوڵبدا و شتێک وە خۆی گرێ. با ئەگەر لە زانسـتگە و تـاقیکردنەوە و بڕوانامەی رەسمی و کتێبی بە شێوەی تازە نوسراو و لە چاپدراو و زۆر پیویستی دیکەی خوێندن بێ بە شن لانی‌کەم شێوەی بەرێچونیان لە ئاخر و ئوخرەکانی سەدەی بیستەم‌دا برێک رووسوورانە و ئابرومەندانە بێت و چی دیکە دەرکا و دەرک نەکەن و دەست بۆ ئەم و ئەو رانەگرن.

ئەگەر بۆ هەر ماڵێکی ئاوەدانی‌بە پێ‌ی دارایی و نەداری‌مانگانە (٥٠) تا (١٠٠) تمەن دیاری‌بکرێ و یان هەر ئەو زەکاتەی کە لە خۆیان حەرامە و دەبێ هەر دەربکرێ بدرێتە دەستی چەند ریشسپی، یان پیاوماقوڵێک و خەرجی حوجرە بکرێت باشتر نییە لەوەی فەقێ هەموو رۆژێک لانی‌کەم دوجار بچێتە راتبە و دەرکان بکوتێ؟ بێگومان هەم خەڵک کەمتری دەچێ و هەم ئابرومەندانەتر و بێ‌عەیبترە هەم فەقێش تووشی شکستی گیانی و زەبوونی و بێ ورەیی نایەت.[1]

---

١ - بە پێی ئاگاداری دەسکەوتوو لە باشوور و باکوور و رۆژهەڵاتی ئێران برا مسوڵمانەکانی بەلووچ، تورکمان و... ئەو کارەیان سەبارەت بە مەلا و فەقێی خۆیان وەک بەرێوەبردنی ئەرکی‌سەرشان لە بەرابەر دین‌دا ئەنجام دەدەن و زۆر لە مێژە زەکات و سەدەقات و خێراتی خۆیان، یان هەندێك لە داهات و دەسکەوتی ساڵانەیان دەخەنە ئیختیاری مەلاکانەوە و ئەوانیش مەدرەسەی دینی گەورە‌گەورەیان پێ سـازداون و دەرس‌بـێژیان بـە مووچە و بەراتی تەواوەوە بۆ گرتوون و هەریەکەی ساڵانە دەیـان و سـەتان فـەقێ‌یان لێ‌رادەگـرن و هـەموو ئیمکانات و کەل‌وپەلێکی پێویستی ژین و خوێندنیان بۆ دابین دەکەن کە هیوادارم خەڵکی ئێمەش بە یارمەتی ⇦

## پەیام بۆ فەقێیەکان

برایانی خۆشەویستم! فەقێ ئازیزەکان!

ئێوە بۆ خۆتان دەزانن کێن و چین و چکارەن؟

وەرن تا وێک بە یەکەوە دانیشین و بدوێـــین تا باشتر خۆمان و ئەرک و سپاردەمان بناسین!

ئێوە میراتگر و جێنشین و کاربەدەستی دوارۆژی هەنتەشی پێغەمبەرن-د- مەلەوانی دەریای پڕ لە دوڕ و گەورهەرن، سەرقافلــەی کاروانی بژیوهێـنەری برسی و لێقەوماوانن. ڕێشاندەر و ڕێنوێنی هەلبراو و بەجێماوانن. پەنا و پەسێوی بێ پەنا و بێکەسانن، چاوساغ و دەسگری کوێر و بێلاق و دەسانن.

ئێـــوەن کە دوای پێگەیشتن، دەتوانن خەلکان لە چالـــی رەشی نەزانی و بێبڕوایی بێـــنندەرێ و دلـــی تاریک و تەلـەمی ڕێ لێونبوان بە نوور و مەشخەلی ئایەتە پڕ پیت و پیرۆزەکانی قورئان و ڕێنوینی فەرموودە بەنرخەکانی پەیام هێـنی خوا بۆ سەرزەوی، روون بکەنەوە و گرێ و گۆلی ژین و ژینگەی مرۆڤەکان وەکەن و بکەونە سەرکۆنەی هەلە و لاڕێ و بەدخوو و بەدرەفتاران. دەستدەنە سەرکوتکردن و تەسدانەوەی سەربزێو و ستەمکاران و بە زنجیری زانست و ژیری، چەپی و لە ڕێ لادەران بێـننەوە سەر پانەرێـی ئیسلام و سەرلێ شێـــواوانی تاریکستانی بیرۆچکە دەستکردەکان وەخەبەربێـــنن و سیمکێشی لێکترازاوی مێشکیان ڕێک و پێک بکەنەوە وگەورەترین ڕاستی ون بوویان پێبناسێننەوە و لە دنیا و قیامەت بیانحەسێـننەوە. جا کە ئەو ئیشە پڕ بایەخ و گرینکەتان لەپێشە، دەست لە نێـو دەستی یەک خەریکبن بێئەندێشە، غیرەت وەبەرخۆتا بنێن و بچریکێـنن وەک شێـری مێشە، مەترسن لە توانج و پلار و پیلان و کێشە. ڕێز بۆ زێـری وەخت دابنێـن و کاتی شیرنتر لە نوقل و نەباتی خۆتان بە فیرۆمەدەن. هەولبدەن دەرستان کەمتر بچێت. ئەگەر مامۆستاتان لەوبارەوە کەمتەرخەمە ئاگاداری بکەنەوە و داوای هەولـی زیاتری لێبکەن. ئەگەر هەر چاک نەبوو یان

---

⇦ خوا رۆژێک لە رۆژان بۆو مەبەستە هەنگاو هەلێنن و لانیکەم دووسێ مەدرەسەی گـەورەی دینی بە یارمەتی هەمەلایەنە بنیات بنێن. انشاءالله.

عوزرێکی بوو، بچنە لای ماموستایەکی‌تر. سەفەرێک زۆر پێویست نەبێ مەیکەن، دەوری کتێبە خوێندراوەکان زۆر بکەنەوە، ئەوەی دەیخوێنن چاکی فێربن و رەوانی‌بکەن و زۆری بلێنەوە. ئەوەی نایزانن بیپرسنەوە. ئەوەی دەبێ لەبەر بکرێ لەبەری بکەن، پرسیار لە یەکتری بکەن و شت بە یەکتری بلێن، لە کاتی لێکۆلینەوە و باس و شەڕە پرسیار مەبەستتان شکاندنی یەکتر و خۆهەلکێشان نەبێ و هەر بە ئامانجی کەلکوەرگرتن و سوود گەیاندن ئەو ئیشە بکەن. لە کاتی پشوودان و بێکاری‌دا لەبارەی یاساکانی ئیسلامەوە بکۆلنەوە و بە دەق و بەلگەوە فێریان ببن. بزانن چۆن وەلامی پرسیاری خۆیی و رەخنەی نامۆ و ناحالی‌یان دەدەنەوە.

بێجگە لە کتێبی دەرسی، موتالای کتێبی دیکەش بکەن تا لە هەموو بوار و بابەتێک بەلەد و ئاگادار بن. چونکی سپەیرۆژێ دەگەل هەموجۆرە ئینسانێک بەرەورووو دەبن، هەرکەس پرسیارێکتان لێ‌دەکا و بە مەبەستێک دەتان‌دوێنی. دوێنی رۆژێک بوو ئەمرۆڤ رۆژێکی‌ترە، کاری ئێستای ئێوە شەڕە دەگەل نەزانی، ئەویش نەزانی سەدەی بیستەم کە پشتیوانی ئینسانی و غەیرە ئینسانی زۆری هەیە.

دەبێ بە دوو چەکی باوەڕ و زانین چەکداربن. چونکی زانینی دەگەل باوەڕ کردەوەشی بە دوو دادێت و کەسێکیش زانا و بە ئیمان بێ لە مەیدان‌دا کەس خۆی بۆ ناگرێ و تا زۆرتر بزانن سەرکەوتووتر دەبن.

تێکۆشان و خەریک‌بونتان هەر لەو کتێبانەدا کورت هەل مەیەننەوە. پەراوی مێژوویی، ئابوری، سیاسی، زانستی، لێکولینەوەیی، فەلسەفی و ئەدەبی بخوێننەوە. قورئان و حەدیس زۆر بخوێنن و لەبەریان‌بکەن. ئاگاداری یاسایەکانی شەریعەتی ئیسلام بن و «فقه» زۆربخوێنن. هەرکە هەلتان بۆ رەخسا لە سەر وتاردان «سخنرانی» بە زمانەکانی کوردی و عەرەبی و فارسی و هەر زمانێکی‌تری کە دەیزانن، مەشق و تەمرین بکەن. بۆ قسەکردن و راهاتن بە هەر زمانێکی بێگانە هەولبدەن و هەل لە دەست‌مەدەن و دەست لەیەکتر بەرهەل مەدەن.

هەر وابێتەوە لە سەرتان لازم و پێویستە ئاگاداری وەزعی رۆژ و روداوەکانی دوور و نێزیک بن، دۆست و دوژمن بناسن لە سەر باری سیاسی، کۆمەلایەتی، ئابوری، مێژوویی و جوغرافیایی ولاتانی ئیسلامی موتالا و لێکولینەوەتان هەبێ و بزانن لە دنیای مسولمانان و غەیری وان‌دا، چ دەگوزەرێ. بۆ ئەم بابەتانە کتێبی زۆر هەیە و دەتوانن لە گوڤار و رۆژنامە و

حەوتونامە و راگەیەنە رە گشتی‌یەکان کەلک‌وەربگرن.

## لاکردنەوە لە کردەوە

ئەوەی باس‌کرا لە مەرزانین و وریایی و تێگەیشتن بوو کە دەبێ ببێ بەلام لەوان گرینگتر کردەوەیە. عیلم و تێگەینێک کردەوە و هەلـوێستی دەگەڵ نەبێ هیچە. زانینی بێ‌کردن نرخ و بایەخی نییە، خەلک زیاتر لە رەفتار و کردار دەروانێ نەک لە قسە و گوفتار. کە واتە پیاوی مەیدانی کردەوە بن لە رەفتار و هەلـوێستە ناردوا و قەدەغەکراوەکان خۆتان بپارێـزن. ئەوی پێویستە، چ دەگەڵ خۆتان و چ دەگەڵ خەلک و چ دەگەڵ خوا ئەنجامی بدەن، خۆتان بە خوو و خدەی ئیسلامی برازێننەوە.

بۆ خۆتان وەخت‌ناس و رێک‌وپێک و وریا و گورج و گۆڵ و زیت و کولنەدەر بن. نیسبەت بە ئەنجام‌دانی ئەرکی سەرشانتان بێ‌موبالات و کەمتەرخەم مەبن بۆ هەر کارێک بریارتان‌دا بە جیددی راپەرن و لێی راکەون. شەوانە لە وەختی خۆی دابنون بەیانانیش زوو لە خەو هەستن. بەرگ و نوێن و بان و سەر و لەش و هەوڕ و هۆڵ و جێ و رێ و هەموو کەل و پەلێکتان پاک و خاوێـــن بێ. ددانەکانتان لە شەو و رۆژدا لانی‌کەم جارێک ئەویش، پێش خەوتن بە فلـــچە و هەویری تایبەتی بشۆن و میسواک فەرامۆش مەکەن. بە پێـــی توانا وەرزش بکەن و خۆتان رابێنن، پیادەرەوی بکەن و تەمبەڵ‌بار مەبەن. سەر و سەکوت و جۆری لیباستان نائاسایی نەبێ. بەرگ و پۆشاکی فەقێیەتی تور مەدەن چونکی شکان لە بواری فەرهەنگی‌دا شکستی دیکەشی بە دوادا دێت و دردۆنگی خەلکیش لەوێ راوەستێ.

سیغار مەکێشن چونکی زیانی زۆری پێـوەیە و بەتایبەت کە لەو دواییانەدا زیانەکانی گیانی لە لایەن پزیشکەکانەوە روون‌کراونەوە، گەلێک لە زانایانی پایەبەرزی دینی حەرامیان‌کردووە و بە نارەوای دەزانن.

ریش مەتاشن چونکی بە لای زۆربەی زانایانی شەرع زانەوە تاشینی حەرامە، و هەرچەند بازێک فەرمویانە هێشتنەوەی سـوننەتێکی گەورەیە و تا شینی مەکروهە.

خەو و خواردنتان بە جێ و رێ و ئەندازە بێ، زیادەرەوی و وێڵ خەرجی مەکەن، بە قنیات و شوکرانە بژێربن.

دەگەڵ خەڵکی بە وەفا و بێجەفابن، پێــوەندی یان دەگەڵ مەپچرن، پەیمانشکێــن و بێبەڵێـن مەبن، لە شایی و شینیاندا بەشداری بکەن. سەری نەخۆشەکانیان بدەن. لە دەرد و گرفتارییان بپرسن و بە پێی توانا هەوڵی چارەسەرییان دەگەڵ بدەن. رێـز لە گەورە بگرن، بەزەییتان بە چکۆلەدا بێـتەوە. ئێـرەیی «حەسوودی» بە کەس مەبەن و بە پلە و پایە و بوونی خەڵکی شاد و خۆشحاڵ بن. رازی مەبن بەوە ماڵ و نامووس و کەسایەتییان زەبری لێبدرێ و لەو پێناوەدا بەرگری بکەن و بۆ خۆشتان پێشقە دەمی پارازتنی ئەو شتانەبن. خۆتان بە کوڕی خەڵک بزانن و ئەوان بە کەس و کاری خۆتان. لە بابەت خزمەت و چاکەی وانەوە سپڵە مەبن و شوکر و سوپاسیان بکەن. هەرکەس چاکەی دەگەڵتان کرد پاداشی بدەنەوە، لانیکەم بە دوعای خێر. گاڵتە بە کەس مەکەن و بە چاوی سوکی مەڕواننێ. رووخۆش و بە خولق و ماریفەت و خۆ بە کەم گر و روح و رەزاسووک بن. خەم لە دڵتاندابێ، نەک لە نێوچاوان و رووتان. مۆن و مرچ و دورە پەرێز مەبن، شۆخی بێجێ مەکەن. مەند و لە سەرەخۆ و لە خۆ بوردوو و بە گوزەشت بن. پێش عەیبی خەڵکی هی خۆتان ببینن. دوان و بێدەنگیتان لە جێی خۆی دابێ. «صلەرحم» واتا پێـــــوەندی خزمایەتی وەبەرچاو بگرن مافی تەواوی دایک و بابان بەجێبگەیەنن بە ویقار و رێزدار بن، رێز لە پیر و پێشەوایان بگرن. ناوی رابردوان بە چاکی بێنن و دوعای خێـریان بۆ بکەن. رێزی تایبەتی بۆ مامۆستایەکان دابنێن. سڵاو و ئەحواڵپرسیتان بۆ هەمووکەس زۆربێ. هاورێ و هاودەمی چاک و رێزدار و پارێزکاران بن. لە خراپان نێزیکی مەکەن مەگەر بۆ رێنوێنی و پەروەردەکردنیان. ئاگاداری برا سوختەکان بن و پەروەردەی دینییان بکەن، لە گوتنی دەرسی قورئان و دین و ئەخلاق بە مندالانی خەڵک دریغی مەکەن، بە ئاگاداری کەسەکانیان بەرەو فەقێیەتییان بکێشن. گەورە و چوکایەتی نێو حوجرە وەبەرچاو بگرن، بێنەزم و یاسا و سەرلێشێواو مەبن. رەفتارتان بە یەکەوە برایانەبێ. لەسەر روداو و پێشهات و مەسەلەکان بە یەکەوە راوێــژ بکەن. دڵسۆزی یەکتری بن و لە لای کەس یەکتر مەشکێـنن و بۆ کەس یەکتر هەڵمەنێن و دژی یەک مەدوێن. توشی هەر هەڵەیەک هاتن دەسبەجێ پەشیمان ببنەوە و تۆبە بکەن.

بۆ خوا یەکلا ببنەوە و ئیشەکانتان بووی پالافتە بکەن، یادی ویتان هەمیشە لە دڵدابێ و بە چاودێر و ئامادەی هەموو کارێکی بزانن. پشتی پێ ببەستن، لە رەحمی وی و پیرۆزبوون لە

ئیشەکانتان‌دا ناهومێد مەبن، هەموو رووداو و پێشهاتێکی دیار و نەدیار و گەورە و بچووک لە کارتێکردن و شوێن‌دانانی وی بزانن، بوون و نەبوون، مان و نەمان، دان و نەدان هەر هی ئەوە و ئیتر لە دەسەلات و ویستی هیچ‌کەس و هیچ شتێک‌دا نییە.

بە تێڕوانین و بیرکردنەوە لە ڕێکوپێکی و نەزم و یاسا و شوێنەواری دەستی ژیری و توانین و لێزانین و کاربەجێـــیی و سۆز و بەزەی پەروەردگار لە گەردیلە تا کاکێشانی و لە گیان‌لەبەر تا بێ‌گیانی ئەم بوونەوەرە زۆر و زەبەندە، هەر وەها بە لێکدانەوە و وردبوونە وە لە کشگێڕ «معجزە»ی هەتاهەتایی پێغەمبەری مەزنمان-د- کە قورئانە بیر و باوەڕتان قایم و قوڵ و پتەو بکەن.

هەروا بە پارازتنی مافی تەواوی نوێـــژ، یادی بەردەوامی خوا بە دڵ و زمان، قورئان خوێندن و پێداچوونەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر-د- خوێندنەوەی ژێنامە «سیرە»ی یارانی و پیاوچاکانی رابردوو و هاوچاخ، هاموشوی خواناسانی پایەبەرز و ئەهلی کردەوە، بیرکردنەوە لە مردن و ئەو قوناغانەی بە دوای‌دا دێن، چوونی سەرقەبران و پاڕانەوە و دوعا کردن بۆ خۆتان و گیانی رابردوانی نیشتەجێی بەرزەخ، گیان و دەروونتان بەرز و فراوان رابگرن و ڕێی نەوس و شەیتان ببەستن.

نوێژەکانتان ئەوەڵی وەخت و بە جەماعەت بکەن، هاوڕێ دەگەڵ بەجێ‌هێنانی مەرج و پێویستی‌یەکان؛ لە ماناکەشیان وردببنەوە و بزانن لە حوزوری کێ‌دا و بۆچی ڕاوەستاون و کڕنوش دەبەن و دەڵێن چی؟ دوعا و «ذکر»ەکانی‌گەڵ نوێژ و پاش نوێژ لەبیر مەکەن. لە شەو و ڕۆژدا لانی‌کەم جارێک قورئان بخوێنن، دوعایەکانی پێوەندی‌دار بە هەر کار و کاتێکەوە لەبەر بکەن و لەجێی خۆی‌دا بیانخوێنن. سڵاوەت‌دان لە پێغەمبەری خۆشەویست‌دفەرامۆش مەکەن و بە پێی توانین و گونجان سوننەتەکانی ئەو بەڕێزە ئەنجام‌بدەن. زۆر لەبەر خوا بپاڕێـنەوە بەتایبەت لە دوای نوێـــژەکان و ئەو کاتانەی دوعایان تێـــدا گیرادەبێ. پێـــوەندی‌کردن و لێک‌پچڕانتان هەروەها ڕق‌هەستان و خۆشەویستی‌تان لەبەر خوا و لە ڕێی وی‌دا بێ. بە دڵ و زمان و کردەوە حەمد و سوپاسی خوا بکەن و شوکرانە بژێری چاکەکانی بن. بیرلەوە بکەنەوە کە دنیا هیچ نییە و ڕۆژێک هەر بەجێی دێـڵـــن و دەچنە بن گڵ و پرسیاری نیعمەتەکانمان لێ‌دەکرێتەوە و ورد و درشتی چاکە و خراپەمان دێتە ئەژمار. لە سزادانی خوا بترسن و بەهیوای

ڕەحمەت و بەهەشتی بەرینی خواش بن.

برایانی هێژا!

ئێــوە بنکەی خەڵکیتان هەیە و ڕاژە و خزمەتتان بە ئایین و گەل لە کەس شاراوە نییە. خەڵکی مسوڵمان چاوی بڕیوەتە زانایی و وریایی و لێهاتویی ئێوە و دەزانن کە سەربەرزی و پێشکەوتوویی هەر گەلێک پێوەندی هەیە بە باشی ورەسەنی و پێشکەوتوویی ئەو بیروباوەڕ و یاسا و ڕێسایە کە دە نێوی‌دا هەیە و هەڵـدان و بەرەو پێش چوونی ئەو بیروبڕوا و یاسایەش بەستراوە بە هەوڵ و تێکۆشان و خۆ زەحمەت‌دان و لێهاتویی ئەو دەستە و تاقمە لە خەڵک کە بەرپرس و ڕاسپاردە و ڕاژەدارنی. کەواتە بەو ئەنجامە دەگەین: خەڵکی مسوڵمان سەرکەوتن و پێشرەفتی هەمەلایەنەی خۆیان لە ئێوەی خزمەتکار و بە پرسیاری پەرەپێدانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەزانن.

لێـمان سوور و عەیانە کە نەیار و ناحەزانمان، بێ‌وچان و پشوودان، بە هەر وەسیلە و ئامرازێکی ڕەوا و نارەوا، خەریکی کار و تێکۆشانی خۆیانن و لە بواری فەرهەنگی و سیاسی و سەربازی و ڕاگەیاندنەوە بە گەرمی، لە هەوڵ‌دان و لە دژایەتی مسوڵـــمانان و بیرو باوەڕ و یاساکانی ئیسلام ساتێک ناسرەون و هەدادانیان نییە. هەموو جولانەوە و ڕەنجدان و هەڵسوڕانیشیان بە ڕواڵـــەت بە ناوی خزمەت بە گەل و بۆ نەجاتدانی هەژار و داماو و ماف خوراوانە و بە مەبەستی دابین‌کردنی دادپەروەری کۆمەلایەتی‌یە.

ئەما لە ڕاستی‌دا ئەوانە بە دوور و نیزیکەوە، بە ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاوایی‌یەوە دژایەتی ئیسلام دەکەن و ئامانجی دوارۆژیان لادانی گەلانە لە بیروبڕوای ئیسلامی و بە بڕوای ئێمەش هەرکەس دژی بیروباوەڕی خەلک بێ دژ و ناحەز و نەیاری ئەو خەڵکەشە.

دژایەتی کردنیشیان بە دوو هۆیانە: تاقمێکیان لە ئایینی ئیسلام حاڵی نین و پێـیان‌وایە پێچەوانەی هەڵدان و پێشکەوتنە و شیاوی حکومەت‌کردن و ڕابەرایەتی خەڵک نییە و ئەگەر لە ڕابردوش‌دا کەڵکی بووبێ دەگەڵ باری ژیانی خەڵکی ئێستا نایەتەوە و تەنانەت تۆمەتی بەرەو پاش گێرانەوەشی بۆ هەڵدەبەستن.

بەشێکیشیان‌ئەگەرچی‌لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام تێدەگەن و دەزانن ئایینێکی تەواوە و لە هەموو بوارەکانی ژیان دواوە، بەرنامەی تاک و کومەڵە و وێرای باسکردنی مەسەلە تاکی‌یەکان

و دوان لە چۆنیەتی خواپەرستی و ئاقیدە و باوەڕی دینی، بەرنامەی تایبەتی کۆمەلایەتی، ئابوری و میرایەتی و سیاسی و فەرهەنگی خۆی هەیە و راڤە و لێکدانەوەیەکی راست و گرینگە بۆ گشتی بونەوەر و هەروەها بۆ ئێستا و داهاتووی جیهان و لە بیروبڕوا و کردەوەدا مرۆڤ لە گومان و دلـــەراوکێ نەجاتدەدا و دەیخاتە سەر شەقامەرێـــیەکی بێمەترسی و پەتەر[1] هەروەها دەیهەوێ مرۆڤ سەرەڕای خۆئامادەکردن بۆ ژیانی نەبراوەی پەسلان، لەم ژینگە کاتییەشدا لەوپەڕی خۆشی و ئاسوودەیی و بەردو پێش چوون دابێ و هەتا گیانی لەبەردایە هەر بخوێنی و بەو هۆیە کەلکی زیاتر لە بەش و بارەکانی خوا وەربگرێ. ئینجا لەوەش بێئاگا نین کە قورئان دەفەرموێ: یەکێک لە مەبەستە هەرەگرینگەکانی ناردنی پێـــــغەمبەران-د- دابینکردنی دادپەروەری کۆمەلایەتییە و تەنیا پێـــودری گەورایەتی و چوکایەتی تەقوا واتا پەیرەوی زیاترکردن لە یاسایە و پێوەرەکانی تری وەک: رەنگ و نژاد، بوون و نەبوونی سامان، زێد و نیشتمان و هەر مەحەکێکیتر، کەمترین بایەخیان نییە و خەتی بەتالکردنەوەیان بەسەردا کێشراوە. بەلـــێ ئەوانە هەموو دەزانن و زۆریان بە نوسین و گوتن دانیان پێـــداناوە، بەلان لەبەرئەوە کەوتوونە دوای نەوس و شەیتان و بۆ خۆشی ئەم دنیایە چاویان لە ژیانی پەسلان قوچاندوە و دەیانهەوێ لە نێـــــــو یاسا و رژیمێکی وادابژین کە لە سەر بناغەی جیاوازی کۆمەلایەتی دامەزرابێ و بتوانن تیایا خەلک بچەوسێننەوە ئیتر ئامادەنین بێنە ژێر سێبەری پڕ لە دادگەری ئیسلام و بە زنجیری عەدالەت و پاراستنی مافی تاک و کۆمەل خۆیان ببەستنەوە و لەو پێناوەشدا بە توندی دژایەتی دەکەن و هەموو نێو و ناتۆرەیێکی ناحەزی لێهەلدەدەن.

هەروەها بە مەبەستی کزکردنی دین و لە برەوخستنی و پێشگیری لە گەشەکردن و هەلـــــــدانی، دژایەتی ئالاهەلگران و راگەیەنەرانی دەکەن و لەو رێـــــیەشدا دەست دەدەنە پروپاگەندەی دژومنکارانە و بە کۆنەپەرست، تەماکار گەللات[2] یانهاوکاری بیانی و چی و چی تۆمەتیاری[3] دەکەن و هەولـــی ئەوەش دەدەن هەندێ خەلکی ساویلکە بکەنە هاوکاری خۆیان و کاری خۆیانی پێ بکەن.

---

١ ـ پەتەر: بەلا، پەتا. (هەنبانەبۆرینە).

٢ ـ گەللات: مفتەخۆر. (هەنبانە بۆرینە).

٣ ـ تومەتیار: متهم.

بەڵام ئێمە وەک ڕاگەیەنەرانی دین نابێ بەو بایانە بلەرزین و ببەزین؛ چونکی سروشتی‌یە کە یەکەم کاردانەوەی بەرەی ناهەق بە دژی ئاڵاهەڵگرانی هەق تۆمەتیارکردن و ڕەشەکوژی (ترور)ی کەسایەتی قەڵەم و چەکبەدەستانی و توانج و پلارپێدادانیانە تا بتوانن هەر بە شەڕی سارد، ساردیان بکەنەوە و ورەیان بێننە خوارێ و لە ئەنجامدا سەنگەریان پێ چۆڵبکەن و وڵات بکەنە مەیدانی ڕمبازێنی نەیاران و دژمنانی ئایین و گەل.

ئەمجار، ئەوە هەر ئێمە نین دەکەوینە بەر هێرش و لافاوی قسە و تەشەر و تۆمەتی ناحەزان و دۆستانی ساویلکە، بەڵکوو ئەوە میراتی پێشونیانە بۆمان بەجێماوە، جا هەر لە نوسەران و ڕاگەیەنەرانی ە بانگەوازی‌کەرانەوە بگرە تا یارانی وەفاداری پێغەمبەر و خودی خۆی -د-.

هەرکەس وە دوا هە ر ڕێبازێک بکەوێ چارەنووسی هەر ئاوایە و دژایەتی دەکرێ بەتایبەت کەسێک وە دوای ڕێبازی ڕاستەقینەی ئیسلام بکەوێ کە ئاڵاهەڵگری شۆڕشی ڕزگارکردنی هەموو چەوساوە و ماف خوراوانی جیهانە و دەیهەوێ هەموو گەلانی دنیا ئازاد و سەربەخۆ بن و کەس ئاغا و سەروەری کەس نەبێ و چارەی بۆ نەنوسێ؛ هەر بۆیەشە کە هەموو ملهوڕ و زۆردارانی دنیا دژایەتی دەکەن و لەو ڕێیەشدا سەربازان و بەرگری‌کەرانی دەدەنە بەر هێرشی پروپاگەندە و ڕەشەکوژیان دەکەن.

دیسان کێ هەیە هەموو کەس لێی ڕازی بێ؟ و ئایا ڕازی‌بوونی هەموو کەس نیشانەی چاکی و پاکی‌یە؟ ئەوەی هەموو کەسی لێ قایلە، وەک هەموو کەس وایە. دەی خۆ هەموو کەسیش چاک نییە. مرۆڤی چاک هەرچاکان لێی قایلن و ئەوەی چاک و خەراپ بەدڵ لێی ڕازی بێ دەبێ گومانی لە چاکی خۆی دابێ.

ئازیزم! هەرکاتێک ڕەخنەت لێگیرا و کەوتیە بەرلافاوی جوێن و تانووت، بیرکەوە؛ ئەگەر ڕەخنە و تەشەرەکان بەجێ‌بوون ئەوە تاوانبار خۆتی و دەبێ سوپاسی خوا بکەی کە بە هۆی دژمنەوە ئاگاداری کردیەوە و هەڵی‌گەڕانەوە و چابوونەوەت بەدەستەوە هەرماوە. ئەگەر بێ‌جێ و ناڕەواشن ئەوە هەر سوپاسی خوا بکە کە پەیڕەوی و بەرگری‌کردنت لە دین، شوێنی خۆی داناوە و ئەوەتا نەیاران لێت توڕەن و دژکردەوە (عکس‌العمل) نیشان‌دەدەن.

کاکە گیان! شتێکی سروشتی‌یە کە هەڵوێستی نەیار لە بەرانبەر هەوڵ و تێکۆشانی تۆدا

دڕکخستنە سەر ڕێ و کۆسپ دروستکردنە. نەک گوڵ پێدادان و هەڵنان و بارەقەڵـلا. تەنیا دیاردەیەکی کە مرۆڤ، پەژار و داخ لە دڵ دەکا لاسایی‌کردنەوەی دژمنان و ناحەزانە کە هەندێک خۆیی ساویلکە دەیکەن و دەبنەدارەدەست و دەست لە نێـو دەستی نەیاران دەنێـن. ئەویش بە قەولی زانا و بلیمەتان کە دەڵێن: «دۆستی نەزان بەلای خوایە» و دەبێ خۆیان بۆراگرین و بە پێی توانا تێیان بگەیەنین: کە خۆیان و دۆست و دژمنان بناسن و زیاتر فریوی دژمنانی خۆ بە دۆست نوێنیان نەخۆن و بێنەوە سەرەخۆ و لانی‌کەم ئەگەر گوڵ نین دڕکیش نەبن.

کە واتە دەبێ زۆر وریا و هۆشیار بین و بزانین بۆچی و لەبەرچی دەخوێـــنین، چۆن دەتوانین بە مەبەستی پیرۆزمان؛ کە ڕاگەیاندنی دینە بە تێـــــــری و تەسەلی بە خەلک و گێـــــــڕانەوەیانە لە هەر باوەڕ و ئاکار و خوو و خدە و ڕەفتارێکی ناڕەوا و هەروەها بەرپەرچدانەوەی هەموو دوژمنکاری‌یەکی دوژمنانە سەبارەت بە ئایین و دینداران؛ بگەین.

بە قسە و باس و توانج و پلاری نەیاران و دوستانی ناحالـی نابێ شل بین و مەتەرێـز بەجێ‌بێڵین و تاوانێکی گەورە بۆ خۆمان تۆمار کەین. چونکی هەلاتن لە ڕیز «صف»ی «جیهاد» یەکێکە لە تاوانە زلەکان «الکبائر» و «جهاد»یش هەر بە شەڕی چەکداری «القتال» ناگوترێ بەلکوو قوناغی جوراوجۆری هەیە کە یەکێکیان یان باشتر بلێـین یەکەمین قۆناغی تێکۆشان بریتی‌یە لە ڕاگەیاندنی دین و بانگەوازی کردنی خەلک بۆ لای ئیسـلام «الدعوة» بە قەلەم و زمان.

هەروەها ئێوەش دەزانن نەیارانی ئێـمە و ئەو لایەنانەی کە دەبێ دژیان بجەنگین تەنیا بریتی نین لە مرۆڤــە ملهوڕ و زۆردار و سەرەڕۆیەکان؛ بەلکە بەر لە هەموو کەس و هەموو شتێک دەبێ بە دژی نەوس و شەیتان بجەنگین و نیشتمانی دەرونیان لێ‌بسرینەوە و ئەوسا دەست‌بکەین بە تێکۆشان «الجهاد» لە نێــــــــو کۆمەل و لە قۆناغەکانی سەرەتایی‌یەوە دەست‌پێ‌بکەین و ئەگەر پێویست بوو تا دوایین قۆناغ کە گیان بەخت کردنە بڕوێـن و خۆمان فیدای ئیسلام و مسولـمانان بکەین تا بەو پێـیە خەلک لە بێـدادی ڕزگاربێ و خۆشمان پلەی شەهیدی و ژینی خۆشی ناو بەهەشتی خوای دادگەر دەستەبەر بکەین.

دەبێ زۆر هەوڵ بدەین و خۆ ماندوو بکەین تا زوو تێ‌بگەین پێ‌بگەین و یەکجاری بکەوینە سەر ڕێبازی بانگەوازی و ڕاگەیاندنی دین و بە قسە و کردەوە خەلک ڕاکێشین بەرەو دین؛ جا ئەگەر کرا لە بەرگ و سەنگەری مەلایەتی‌دا دەنا لە هەرکوێ و هەرچی بووین. لەبەر

ئەوەی مەرجی راگەیاندن ئەوە نییە هەر بە ئیشی مەلایەتی و لە میحرابی مزگەوتا بێ؛ بەڵکوو دەکرێ لە هەر لیباس و نێو هەر توێژ و تاقمێکی کۆمەڵدا دین رابگەیەنین و شی ی بکەینەوە و ئاڵا هەڵگر و دۆستان و تێکۆشەرانی زیاتربکەین. دەبێ لە هەر شوێنێک هەلمان بۆ رەخسا بە میحراب و مزگەوتی بزانین و هەر بەرگێکمان لە بەرابوو، هەر ئیشیکمان بە ملەوە بوو لە خزمەتکردنی دین درێغی نەکەین و شل نەبین با مەلا نەبین؛ نوسەرێکی بە توانا، بازرگانێکی دەستپاک، پێشەسازێکی دلسۆز، وەرزێرێکی خێرەومەند، ئاژەڵدارێکی دلاوا، یان کرێکارێکی کارامە و بەختەمام بین و لە هەموو هەستان و دانیشتن و هەڵوێستێکمان داراست و دروست و بێفێـــــڵ و گرێ بین ە ببینە سەرمەشقی جوان «القدوة الحسنە»ی دین بۆ خەڵک و ئەگەر قازانجیشمان بۆ دین نەبێ لانیکەم زیانی پێنەگەیەنین! انشاءاللەوعلیەالتکلان.

## بەرەو ماڵاوایی

وا وردە وردە بەرەو ماڵاوایی دەچین و بۆ ماوەیەکیش بێ دەبێ دەستلێک بە ردەین؛ بەڵام بەر لە خاترخوازی[١] دەمهەوێ مەبەستێکی درکاو، برێک بە درێژی بۆ فەقێیەکان دوپات بکەمەوە، جا ئازار کەمکەمەوە.

خۆشەویستانم!

رێگای ئێـوە تایبەتمەندی زۆری هەیە، هەروەکی گەلێک پیرۆزە و ئەنجامدانی ئەرکی دینە، راژەی خزم و گەل و هۆزە و بۆ، ئازادبوون و بوژینە، دیسان وەکی پڕ لە چاڵ و چووڵ و درکە و هەوراز و نشێوی هەیە، دوور و درێژ و کەم رێبوارە و رێگر و بشێوی هەیە، ئەرکی ئێمە تاق و تەنیا مەلایەتی ئاسایی نییە. بەڵکوو دۆز[٢] و مەرامێکی گەلێک پیرۆزمان لە پێشە، کە تا گیانمان لەبەردایە و مێشک و بیرمان لە سەردایە، دەبێ هەوڵـــی لە بۆ بدەین، بە یەکدڵـــی بە یەکگرتن، بە نووسین و راگەیاندن، بە لێدوان و روونکردنەوە، بە بەخشینی سامان و ماڵ، بە تێکدانی ژیوار و حاڵ، بە سەربازی بە گیانبازی، بۆی تێبکۆشین و خەباتی لە پێـــــــناودا گەرمکەین؛ خەباتێکی وا بەتین بێ کەللەی رەقی هەقنەویستانی فێڵبازی لەناو گردا نەرم کەین.

ئەم ئامانجەش: وەک دەزانین ئایینی پیرۆزی ئیسلام، دەیانساڵــە دەسەڵاتی رامیاریی خۆی لەدەستداوە، رێـــی گەشەکردن و هەڵـدانی لێگیراوە. مافی دەستوەردانی لە مەسەلە کۆمەلایەتی و ئابووری و زانستی و سیاسییەکانی لێزەوتکراوە.

ئەوە بوو لە ٣ی ئاداری ساڵـــــــی ١٩٢٤ی زایینیدا ئاخرین ئیمپراتۆری ئیسلامی لە سەردەستی «مصطفى كمال» کە راسپاردە و دەستپەروەردەی جولەکە و ئینگلیزیەکان بوو لە پیلانێکدا روخێنرا و کۆتایی بە ژیانی هێنرا، هەر لە درێژەی ئەو پیلانە دین و سیاسەت کە یەک بوون و لە سەرەتای ئیسلامەوە ئاوا هاتبوون لە یەکتر جیاکرانەوە. خوێـندنگە دینییەکان بە

---

١ ـ خاترخوازی: خواحافیزی. ماڵاوایی. (هەنبانە بۆرینە).

٢ ـ دۆز: مەبەست لە ژیاندا، مەرام. سەرچاوەی پێشوو.

ناچاری جێی خۆیاندا بە خوێندنگە غەیرە دینییەکانی میری. خەلیفەی کات وە دەرنرا، مسولمانان بوونە پەزی بێخودان و هەرکەس دەستی بۆ چەک دەبرد کێی ویستبایە چۆنی پێخۆشبایە دەیکوشت.

بەڵێ سەدحەیف و مخابن ئەو کۆشکەی وا لە ئەستەنبووڵ پێنج سەدە بوو مسوڵمان لە پەنایدا دەژیان تێک روخێنرا، ئەو ئالایەی بە درێژایی چواردە سەدە کۆمەلانی مسولمان و نامسولمانی لە ژێر خۆی حەساندبۆوە؛ هێنرایە خوار لەتلەتکرا و وەک نیشانەی بوون و سەروەری و سەربلێندی گەلانی مسولمان لەناوبرا. لە دوا ئەوەش ولاتی گەورەی ئیسلامی بەشبەش کرا، چارەی هەموو دانیشتوانی رەشکرا. بەشیان بە خوێندن وە نەما. لە هەلدان و گەشە کەوتن. چما چما بەسەریان بێ؟ ئەو رووداوە کاریگەرەش زەبرێکی ناوچەیی نەبوو، پیلانێکی جیهانی بوو، داریژەرانی فێڵبازی چەند سەدە بوو بە دوایەوە بوون دژمنی لە مێژینە بوون، قین لە دلی ئەم دینە بوون. میر و میرایەتی زۆرە ملیان بەسەر شاناندا سەپاندین. میر نەبوون گزیری وان بوون. بە نەخشە و تەگبیری وان بوون. سامان و بوونی ولاتیان بە تالان برد. هیچیان بۆ نەهێشتینەوە. بە هەرزانی یان بە بەلاش بۆ خۆیان برد، کردیان بە شت بە گرانییان پێفرۆشتینەوە، فابریقەکان[1] هەر بۆ خۆیان دەچەرخێنن. کالاکانیش بە ئارەزۆ دەنرخێنن. رێگانەدرا لاوەکانمان وا بخوێنن داهات و داهێنانێکیان بێ و لە ژینی خۆ سەردەرێنن. ئەوەی رسکا یا خود راسابێ بە شتێ کەوتە نێو داو، خنکا بە ئاو، یان تۆقێنرا یان بە گوللە دابێژدابێژ بوو، تاوانی درا بێتاوان و زۆر بە جوانیش کفن کرا جا نێژرا. گلکۆکەشیان بۆ چاوبەستن رازاندەوە. یان بیانوویان بۆ دێتەوە و بێ لێپرسین، سەریان پەڕاند بە قیتەوە. ئەوەی توانیشی دەربازبێ و لەدەستی هات، هەل و دە رفەت بقۆزێتەوە، بۆی رێکەوت شتێ دروستکا و کەس نەدیوێ بدۆزێتەوە، شانازیەکەی بۆ دین نەبوو بەلکوو مۆری لاوەکییانی پێوەنرا و بەناوی وان تاپۆکرا.[2] تەنانەت هەولـی زۆریاندا خەلک لە دین بێخەبەر بێ. برسییان کردین ترساندیانین، تا خەمی ژینمان لەبەربێ، ئاوڕ وەدین نەدەینەوە. ئاوری شۆڕش نەکەینەوە لە هەموو شتێکی دەترسین. بە زگێ تێر و بە دە برسیین. شەو رۆژێ هەر لە کارین واش نەدار و

---

١ - فابریقە: کارخانە.

٢ - تاپۆکرا: واتا «قُبت» کرا.

خاکەسارین. بە زۆربەی خەڵکییان سەلماندوە: کە دین واتای عیبادەتە کاری بە دنیا نەداوە، لە دژی پیشە و سەنعەتە بۆ بێکاران ڕۆنراوە. دینداری لە ناو مزگەوتە، چوونی ئەویش بە هەڵکەوتە.

زوڕناژەنانی بێگانە ئەوانەی دڕکی ڕێگانە، هەروەها تەشیڕێسانیان ئەوەندەیان بۆ گوتین و ڕستینەوە، لە دینیان دوورخستینەوە. هەتاکوو بازێک مسولـــمانلانیکەم لە وڵاتی دوورە ئاواتی ئێمەئەوەند، لە دین بێهەواڵن، تا ئەو ڕادە کرچ و کاڵن، ئەگەر پێناسەی دین بکەن، وادەزانن کە دین واتای: لە ئاوایی یا لە گەڕەک مزگەوتت بێ و بە بۆنەگەلی جۆراوجۆر، لێـــی کۆوەبی. لە وەرزی بێکاریشتدا نوێـــژ و ڕۆژوو ئەنجامبدەی. کاتی سەرما بچیە مزگەوت. سۆبە داخەی بە تەپالـــە و بە دار و بار یا بە نەوت. لێـی دانیشی لەناوبوونی خلـتەی سیغار، هەناسەسوار، چاو پڕ لە ئاو، هەر دوو دوو و سێ، سێ پێکەوە، بدوێن هەرکام لە شتێکەوە. یەکێ لە نان یەکێ لە ئاو. تاقمێک بکەن باسی ڕاو، هەندێک بکەن باسی ئاژاڵ، کۆمێک بدوێن لە کشت و کاڵ، لە بازرگانی و مامەڵە، مزگەوت بێتە زایەڵە[1] لە نەخۆشی لە دەرد و ژان لە ڕاو و ڕووت لە پیاوکوژان. لە قاتی و قڕی لە گرانی. لە بێتفاقی لە بێنانی. تێکرا بکەن چرە و گوڕە. جارێ هێمن جاری تووڕە. بکەونە باسی ئەم و ئەو، بە پاشەملە[2] و درۆکردن. دەروجیران ترۆکردن.

ئەمجا دەبێ مەلایەکی سەرزەلامی ناقوڵات بێ، بێزەبر و بێ دەسەڵات بێ، نابێ وشیار بێ یا لاو بێ دەبێ پیرێکی خەرفاو بێ، ڕووت و ڕەجاڵ و برسی بێ، لە هەموو کەسێ ترسی بێ. قەت باخەڵی نەبێ تژیی[3] چاو لە دەستی خەڵک بژی. دایم و دەرەم لە ماڵێ بێ وەک بەردی بن جەواڵێ بێ. چوونە نوێژگە[4] بچتە لایان گوێ ڕابدێـری بۆ هەڵایان، جارجار ئەگەر خەڵک لە دوان، زاری شل بوو، یان لەبەر شەکەتی[5] ڕۆژێ خەوی هات و لارە مل بوو، هەستێـــتە پێ پەڕاوێکی کۆنی زەردکراو، سەدجار وەرد دراو، لە سەر تاقە بێـــنێـتە خوار بۆ خەو ڕەوین و

---

١ ـ زایەڵە: دەنگدانەوە.(هەنبانە)

٢ ـ پاشەملە: غەیبەت

٣ ـ تژیی: زۆر، شتی پڕر. خاڵ

٤ ـ نوێژگە: مەچیت، مزگەوت.(هەنبانە).

٥ ـشەکەتی: ماندوەتی زۆر.(هەنبانە).

رابواردن، دوو سێ نەزیلان وەگێڕی.

مزگەوتیش هەر بۆ پیرانە. لەوانیش هەر بوزویرانە، لاو، بەسالـــــــیش تخوونی نەبن قەیدێناکا. بۆخزمەتی مەجلیس نەبێ با هەر نێـــــیەن. ئەگەر لە ئیش گەڕانەوە، برۆن بەرەو سوڕانە. بە نارەنار و فیتەفیت، بچنە پیاسە و قیتەقیت.[1]

خۆ مندالیش بە هیچ کلۆجێ[2] نابێ پێ دە مزگەوت نێن، لەبەرئەوەی پیسی دەکەن، قرەیان دێ. بەلەباری دانانیشن. هەرکامێکیان بە بێپرس سنووری یاسا بشکێنێ و بێتە ژووری بەرلەوەی بگاتە بن کورێ ئەگەر مۆڕەی مام مجێور نەیتۆقێنێ؛ دەنگدانی دوو سێ مسولمان بۆ حەیامێک دەیتۆرێنێ. ئەویش ئاوا مزگەوتی لێ پاوان دەبێ. لە ئاکامدا گیرۆدەی زۆر داوان دەبێ.

دیسانەوە دین بە واتای زەکاتدانە؛ یانی لەو خەلە و خەرمانەی لە لای خەلک ئاشکرا بووە؛ هەندێک دەغلـــی نیوە بنژیل یان لە غەرێکی لە مالات، بدەی بە خزمێکی نێـــزیک، یان دوستێکی خاوەنی خێـر و چاکەی بەدەسەلات، یان بە کەسێ هەژار و لات، کە یارمەتیت دەکا چەند قات. یان بە ئاغات وەکوو داهات. یان بە مەلات لە بری بەرات!!!

حەجیش پایەیەکە بۆ دین، واتای چوونی مالـــی خودا، تا لە خەلک ببی جودا، ئیسمی ئاساییت لێوە بێ، ناوی حاجیاغات پێوەبێ. دیسان دەلێن دین بە واتای ریش و ریشوو، میسواک، سمێل، شال و کەشیدە لە بۆ فێل، مێزەر و شاقەل و عەبا، پرچ و تەسبیحی کارەبا.

لەمەڕ پاکی و خاوێـنیەوە خۆ لە سەگ و بەراز مەدە. لەشت پیسبوو مەلەی بکە. بۆنی سابوون ژانەسەرە، حەمامت هەبێ خەتەرە، خاوێنی لەش واتای ئەوە پیساییت پێوە دیار نەبێ، لیباست پەلـــەدار نەبێ، لەمەولا هیچ عەیبی نییە ئارەق و بۆن قەیدێنییە، مۆریان و کێـــچ بە هەزارە، جێدەمیان لە لەش دیارە، جێگە و بانن، مال و ژوژن پڕ لە بۆنی پیسی ژارە.

ئاو هەرچۆنێ بێخاوێنە، بێژە پیسە، دەلێن وانییە قولەتێنە بۆ شوشتن دە کاری بێـنە. تینووت بۆ هەلیقوڕێنە.

قورئانیش بۆ مانای نییە، هیچ پسپۆری زانای نییە. بۆ دەور و خەتمکردن و لە بەرگ و پەڕۆگرتنە. دەلێنبۆوەی هاتۆتە خوار ڕێزی بگری بەدەست و زار، سالێ جارێکی نوێ وەکەی

---

١ ـ قیتەقیت: برێتی لە جحێلایەتی، هات و چوو بۆ حەزلێکردوویی.(هەنبانە).

٢ ـ کلۆج: تەرز.(هەنبانە).

هەندێ دەورانی لێوەکەی. بچێتە بن سەری ژنە زاوان. پێی سوێند بدەی شوان و گاوان. لەسەر مردوانی بخوێنی. نوشتە و دوعای لێدەرێنی. بۆ لێخوێندنی یاسینە، مەتالی بێزراوان[١] و داوەلێکی سامداری بەرەی جند و شەیاتینە.[٢]

لەمێژوودا ئەوەند بەسە پێغەمبەر -د- و پشتەکانی، هەروەها خاو و خێزانی، پێناسەی جێنوشینانی -خ- باش بزانی؛ کارت سازە پێی بنازە، ئەگەر زیاتر پێهەلێنی، غەزاوەتنامەش وە خوێنی، لەگەلیا دەستراوەشێنی، مەجلیسی پێ گەرمبکەی دلانی رەق نەرم بکەی ئەوە کولێکیش زیاتر دەدا. بەلام مێژووی نەیارانت دەبێ تەواو لێکدەیەوە سەروبەری تێکەیەوە.

لە جغزی جوغرافیاییشا هەر هەقی مالـــــی خۆت هەیە. کیلگەکەشت بارمتەیە، ولاتی گەورەی ئیسلامی، هی خۆت نییە. لە بۆت نییە بە رێبواریش پێیدا بچی، نەخوازەلا لێی دابەزی و تێیدا بژی.

لە بواری عیلم و زانستدا، ئاوا حالـــین کە زانستی رەوا و بەسوود هەر ئەو کۆمەلــە زانستەن کە رێبازی خواپەرستی و دین بە خەلک دەناسێنن، بێجگە لەوان هیچ زانستێک لە گۆشە نیگای دینەوە، بە رەسمی و رەسەن و بە سوود نەناسراوە. تەنانەت لەو مەودایەدا بەدبەختی بەو جێیەگەیوە: کە ئەو هەموو زانستە پڕ سوود و گەیو و مەیوە بە دەرسی شەیتان ناوبراون و لەبەرچاو و دلان خراون.

ئەو دیندار و ئەویندارە بێهەوال و کرچ و کالە، لەمەر عیلم و زانستەوە لە هەلوێستی دین ئاگانین. لە ژێر دەستووری وێدا نین، نازانن کە هەر زانستێک سوودی بۆ کۆمەل تێدابێ، بۆ پەسلان یا بۆ دنیا بێفەرمانی دینی لە سەرە و هەلگری زۆر موعتەبەرە.

دەیان سالــە خزم و قەوم لێککراون بە سنوورە دەستکردەکان هەلـبراون، بۆیان نییە

---

١ - بێزراو: ترسەنۆک. (هەنبانە)

٢ - مەبەستم ئەوە نییە کە هیچکام لەو شتانەی باسکران یان باسدەکرێن پێوەندیان بە دین و دینداریەوە نەبێت، نەء، بگرە بازێکیان نەبێ ئەوانیتر لە دیندا بنەرەتیان هەیە و حوکمی تایەتییان بۆ دیاریکراوە. بەلکوو مەبەست ئەوەیە کە برێک لەو شتانە و زۆر شتی دیکەش لە دیندا لە شوێن و پلەی خۆیان ترازاون جایان پێچەوانە و ئاوەژ و کراونەوەیان بە لێدا تاشین و هەلگوشین کەچ و کرووچ و بارێک بوونەوە و لە بیچم و واتای خۆیان چونەدەرێ. هەروەها هەندێکیشیان گرینگی لە رادەبەدەریان پێدراوە و لە پلەی خۆیان بانتر براون.

سەردان بکەن، لەیەک دیدار ئاخرە و بوون.

## مەلا، دەبێ چۆن بێ؟

ئەمجار سەیرتر لە هەموان مەلا نابێ چت[١] بزانێ، بزانێ، نابێ، بێتە دوانێ، نابێشتی تازە باسبکا، دەنا لادانە لە دین و خەلک تووشی هەراس دەکا. بدوێ لە مێژوو و لە پێشوو، لە پاش کەوتن لەسەر کەوتن، لە راپەڕین و لە شورش، لە کۆچان و زێد جێهێشتن[٢] لە راسان بە چەک و مەچەک، لە شەهیدی لە تێکۆشان، لە ئابووری لە نیشتمان، لە زانست و پیشەو خوێندن، لە شارستانیەت و هەلـدان، لە میرایەتی لە سیاسەت، لە گیروگرفتی کۆمەڵ؛ کە من ئەوانەی گوێیدەنێ و تەنانەت دەنگیشی دەدەن، ناو و تاتۆرەی لێدەنێن، باوە دەلێن: تۆ وەهابیی تا وەها بی بۆ مە، نابی!!

ئاخر بابم ئەو قسانە چن بە چی دەچن؟ ئەوەندە دینەمان هەیە خەریکەلێمان دەگۆڕن، مەلا دەبێ باس لە دین کا، لە قیامەت و مردن بدوێ، نوێژ و رۆژ و روونکاتەوە. ئەم باسانەی وەلابنێ، پەڕێکیتر هەلـداتەوە. دەبێ بێـژێ بەهەشت چۆنە و چی تێدایە؟ چەند حوریمان بۆ دانرایە؟ دێلن لەوێ سیغار بخوێین بۆ مالی یەکتر برۆیین؟ کۆشکەکانمان چەند بلندن؟ دەست و پێوەندمان چەندن؟ هێـندە لە خۆیان قایلن لە ئازاری گۆڕ ناپرسن، لە ئاوری دوزەخ ناترسن!!! ئەوەی خەرجیشی تێدەچێ لە حاندیدا لال و خرسن!!!

مەلا دەبێ بدوێ لە ریش، لە سمێل و تەسبێح وسیواک، لە شال و کەشیدە و مێزەر، لە جلکی پاک، کفنی زمزم کراو چوونە؟ پاداشی خەتم چەن تۆنە، مەولوودی و خێـر و سەدەقە پاداشتی چەن قاتیدەبێ؟ پیاو دەستی سوالکەران وەرگرێ لەوێ زوو نەجاتی دەبێ؟ لە قەبرا چیمان دەدەنێ؟ جا چۆن ناترسین بە تەنێ؟ چەن چرامان بۆ هەلـــدەکەن؟ بەهەشتمان زوو نیشاندەدەن؟ لە مەحشەر زوو دەڕۆینە دەر؟ تامی خۆشە ئاوی کەوسەر؟

مەلا دەبێ لە شەرع و قورعانێ بدوێ. چی بەسەر ئەو شتانە داوە؟ گەلێک سەیرە! دین و

---

١ ـ چت: شت، تشت... (هەنبانە)

٢ ـ کۆچان: بارکردن لە ئاوایی. زێد: نیشتمان، وەتەن. (هەنبانە)

سیاسەت؟ چەک و مەلا؟ ورچ و عەبا؟ چۆن دەبێ لەسەر بەرمالێ، لە میحرابێ باس لە فەرهەنگ و رووس بکا، لە ئەوروپا لە ئەمریکا؟ ئەو چیداوە لە خوار و لە ژوور؟ بەوی چی باکور و باشور؟

بەلێ وامان بەسەرهاتووە؛ لە لای هەندێ خەلکی ئێمە مەلا هەرچی بێ هەر باشە، هەر دەگەڵ خەلکی بێتەوە. وەکوو وان ببزوێتەوە. کاری بەکاریان نەدابێ. ئەگەر گشتی ناڕەوا بێ، نەلـــێ وابن و وامەبن. بۆ هەموو کەسێدا مەبن. ئەوە خاسە، خوداناسە، چوونی بەهەشتی بێباسە.

پێیانوایە مەلا هەر قەلا فەتی بێ ئەگەر هەزار ئافەتی بێ بە مەرجی قورئان بزانێ، یاسین و تەلقین بخوێنێ. لە مەولودنامەخوێندنەوە شەرمنەکا و دەنگهەلێنێ. پێش نوێـژی بکا. لێک تۆراوان ئاشتکاتەوە، پێشگیری لە خوێـــنرێـــژی بکا. بزانی ئادابی مارەبرین، بەلەدبێ لە نووشتەنوسین!! سەری دەرچێ لە قاقەزان، دەمی گورگ و دەستی دزان ببەستێ بۆ خاوەنپەزان. جا ئەگەر دەگەڵ ئەوەشدا دەنگی هەست بزوێـن و خۆشبێ لە بانگ و سەلا لە جۆش بێ، ئەوەکاری زۆر تەواوە و کولێکیشی زیاتر داوە.

مەلا، یان دەبێ نەزان بێ لەبیری رووناک نەبان بێ، یان ئەوەتا دەبێ گەلێک وریای زار و زمانی بێ، ئیشێ نەکا چتێ نەلێ هۆی دزان و دەرکران و نەمانی بێ. لەبەر سودخۆران رێی نییە باسی حەرامیی سود بکا، لە ئاردق و قومار نەدوێ ددنا دژی ئازادییە و کردارێکی بێسوود دەکا. نەلێ رەشبەلەک حەرامە لە زووە هەر ئاوا بووە. هەروا بارمتە و سەرقفلی داییم هەر لەناوا بووە. باسی دادپەروەری نەکا. ناوێک لەسەروەری نەبا. چیداوە لە مافی خوراو، لە چەوساوە و زۆر لێکراو؟ بێت و زۆردار ببیەتەوە، ناهێلی هەینی بێتەوە پەندێکی وای بەسەر دێنێ: زەبرێکی تێدەسرەوێنی؛ هەنگوینی لاژاری ماربێ، هەتا مردن لێی دیار بێ.

تەنانەت وتاری هەینیش بە ئازادی پێشکەش ناکا. لە هەرچی دڵ دەردنجێنی دەبێ راکا. وەی لە هەق و راستەقینە وەی لە زۆرداری بەقینە. وەی لە پێـــران[1] وەی لە میریی وەی لە شۆفار[2] و گزیری! مەلای بێـــچارە رێـــینییە لە هەموو بواری دین بدوێ، نابێ بۆ لای

١ - پێر: تاقم، حزب.
٢ - شۆفار: جاسوس، زوانگر. (هەنبانە)

مەسەلەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی، پەرهەڵاوێ. مافی دەستووردان بە چاکە و ڕێگرتن لە خراپەی نییە. زۆربەی زۆری وتارەکان لە رووی ئەوان خوتبە کەونە عەرەبی‌یانەن کە دەیان ساڵـــە نوسراون. ساڵـــێ جارێکیش گوتراون. تەنانەت زۆرجاری‌وایە هەر ئاوا دەخوێندرێنەوە بە کوردی لێک‌نادرێنەوە.

هەندیک مەلای بێ‌دەرەتان لەناو گێژی کەش و هەوای پڕ لە بێدادی و نارەوای زۆردارانی خۆسەپێن‌دا، ناچاردەکرێـن؛ پەسنی تاغوت و شا بکەن. چۆنیان پێ‌خۆش‌بێ وابکەن. بە تاج و تەختی هەڵبلێن، «حفظه الله»ی بۆ بڵین. دەنا شۆفار هەواڵ‌دەدا سەتی دیشی رەپاڵ‌دەدا. ئیشی بەرەو خەتەر دەچێ «أمر بالقبض»ی دەردەچێ[1]یان لە جێـــی‌خۆی وەدەردەنێـــن. ماڵـــی پێ‌وەسەرکەر دەنێن، لەمەولا نابێ مەلا بێ یان دەبێ دوعاگۆی شا بێ.

هەزار ساڵـــی بێـــژە: بابم! دین و سیاسەت هەریەکێکن چونکی سیاسەت بریتی‌یە لە ڕێـــبەری و مەردومداری. راپەراندنی کاروباری نێـــو خۆی ولات. پاسادانان بەڕێـوەبردن و پێچاران، پارێزگاری لە نیشتمان. چاوەدێری ئیش و کاری دەر و ژووری. داڕشتنی گەلا لەگەلی پێشکەوتوو بۆ هەلدان و گەشەکردن لە هەربوار و بە هەرجووری.

دینیش هەر ئائەوەی دەوێ: قورئانی‌پڕ دوڕ و گەوهەر، فەرمودەکانی پێغەمبەر درەوودی خوای برژێـتە سەر بە زۆری لەو شتانە دەدوێـن، باسی حوکم و دەسەلاتە. دنەی تێکۆشی و خەباتە. باسی میر و پێشەوایە. یاسای جێداری خودایە. قسەی داد و داوەری‌یە. رێی ئازادی و سەروەری‌یە. رێسای ئابووری و بژیوە. دژی بێ‌کار و بەزیوە. لە راوێژ و بەیعەت دەدوێ لە داب و نەریتی جوانی کۆمەلایەتی جمەی دێ.

یاسای بەرگری و هێـــرشە. دوانی لە چەک و شۆڕشە. کۆمەلـــێکی خەولێکەوتووی بێ‌بزاو[2]ی لامردووە. پلەی هەرە بەرز و بالای بۆ پێشمەرگە و بۆ گیانبەخشان دەرکردووە.

هانەی زانین و خوێـــــــــندنە، یاری‌پیشە و سەرکەوتنە. راگەیشتن بە لەشساغی و تەندروستی بە نیوەی زانین حسێوە. پاکی و خاوێنی لە لای دین هەوێنی ئیمانی پێوە.

زیاد لەمانەش سیاسەتی دین بیری لە پاشەرۆژیشە. یاساکانی وادارژاون لە عەینی

---

١ ـ امر بالقبض. واتا فەرمانی گرتن.

٢ ـبزاو: جۆلان، حرکت.

تێکۆشی لە بۆژیانی ئێـــــرە، رزگاری رۆژی پەسلانیش بەردەست و دەستەبەر دەبێ. مرۆ توێشووی خۆی لە پێشوو بۆ دوای مردن بەڕێدەکا و کاری وێش جێبەجێ دەکا. بەو پێـــیە پیاوی مسولمان لە دوو جیهان سەربەرز و بەختەوەر دەبێ. قەتیش نامرێ، هەر زەق و بەخەبەر دەبێ.

یا خۆ بێژە: برای دینیم! خۆ پێغەمبەر و یاوەرانیدبۆ دنیای زێد ونیشتمان، خۆیان پێشەوا و رابەربوون. بۆ رزگاری و ئازادی گەل، کۆچیانکرد و دەربەدەربوون. لە مزگەوت پێشەوابوون. لە دەرەوەش فەرماندەر و نەخشەکێش و قسەڕەوا بوون. میحراب بە واتای سەنگەرە تا شینی لە وشەی (حرب)ە یانی لە دژی هەر چەوتی و سووچ و لاسارێک لە شەڕبە. ئەوکاتی مزگەوتی ئیسلام فەرمانگەی دین و دنیا بوو. نەوەک هەر بۆ نوێژکردن و یادی خودای بە تەنیا بوو.

پێـیان بلـێ: ئەوان بۆ خۆیان سەروەربوون. ملیان بۆ کەس رانەکێشا. بۆ هەر ئیشێکی جەماوەر، فەرماندەربوون. لە مەیدانی عەسکەریشا کەلە پیاو و خۆنەبوێر بوون. لە ئاقار هەر دژمنێکا لەشکان نەهاتوو و بوێربوون. شەڕی چەکداریان لە رێ بوو. لە کاتی وتاری هەینی. لە نوێژیشا جاریوابوو چەکیان پێبوو.

دیسان بێژە خواجفەرموویەتی:... إِنِ الحُكم إلاّ لِلّهِ أمَرَ أن لاّ تعبُدوا إلاّ إيّاهُ. ذلِكَ الدّينُ القَيِّمُ و لٰكِنَّ اَكثَرَ النّاسِ لاٰ يَـعْلَمُونَ»[1] واتا... فەرمانڕەوایی هەر بۆ خوایە، یاسای ئەو دەبێ بەڕێوە بچێ و پەیڕەوی لێبکرێ، فەرمانی داوە بێجگە لەو کەس نەپەرسترێ پەیڕەوی لە یاسای هەرکەسێک بە واتای پەرستن و بەندایەتی بۆکردنیەتیئەمەدینێکی راست و دروست و هەقە و بەڵگەی تەواوی لەسەرەبەلامئەوە کە زۆر کەس پێـــــی نەقایلن لەبەر ئەوە نییە کە بتوانن بە بەڵگەڕەتی کەنەوە، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە کە:زۆربەی خەڵکی نازانئەو دینە چییە و لێـــــــی ناکوڵنەوە و هەروەها تێناگەن کە رێبازەکانیتر پووچ و بەتاڵن.

هەروها دەیان ئایەتی دیش پشتگیری ئەم ئایەتەنە و هەر لە قورئانیشا هەیە: ئەوەی یاسای دین نەکاتە پێرەوی ژین ستەمکار و فاسق و لە دین بەدەرە.[2]

---

١ ـ ئایەتی ٤٠ی سوورەتی یوسف.

٢ ـ ئایەتەکانی ٤٤ و ٤٥ و ٤٧ی سوورەتی المائدە.

سەد هێندەی دیش بێنە و بێژە. هەرچی پێتە هەڵی‌ڕێژە. دەیان بەڵگەی‌تر بێرەوە. ئەوەی وتت مەیلێرەوە: کە من، ئەوانەی گوێی دەنێ. دەگەڵ تۆ هەستن هەڵدەنێ. جارێ ئەوەی بێ‌باوەڕ و دوور لە دینە، مەبەستی لە دنیا ژینە، دەربەستی قیامەتێ نینە، بەڵگەی لەلا پوشە و بایە. هەر بە خەیاڵی‌دا نایە، هەق ببیسێ، هەق‌بوێژێ، بۆ دیتنەوەی راستەقینە بێتە سەر باس و راوێژێ.

تەنانەت بۆ پینەکردنی هەڵوێستی نابەجێیان و دژایەتی‌یان دەگەڵ دین و داپۆشینی هەڵە و سووچ و کار و ئاکاری بێ‌ڕێیان؛ باسی خراپی دین دەکەن. هەڵە و پەڵەی بۆ دەتاشن. بە دەیان ناتۆرە و لەقەمی درۆیین تاوانباری دەکەن، یان بە کرداری ناحەزی بابایەک و پاشایەک و مەلایەک و دەعبایەک و بەلایەک. خێرا تۆمەتیاری دەکەن، پێشیان‌وایە وێرای ئەمە، بێ یاوەر و یاری دەکەن!!!

## دوژمن، دوژمنە خۆیی‌یەکان چی؟

جا ئەوانە بەجێگای خۆی. دەڵێـن دوژمن خەونی ناخۆش بە دوژمنیەوە دەبینێ. بەڵام ئەدی خۆیی‌یەکان چی؟ ئەوان بۆ چ وا ناشارەزان و خۆخۆرن؟

ئەوانیش ئاوا دێنە جواو: هەیهوو! هەیهوو! بەغدا دوورە بۆ فەقیری، راکردن ناکرێ بە پیری.

بابم! تازە لە کوێ دەلوێ؛ دین بکرێـتەوە بە ڕابەر؟ بکا حوکمی نێـو جەماوەر؟ خەڵک بەرەو دنیا چووە خووی بە بێـــــــــدینی گرتووە. خزمایەتی و برایەتی و یەکگرتنیان تەواو لەبیربردونەوە: ئاگری دوژمنایەتی و کێشەیان بۆ کردوونەوە.

ئەمجار دەڵێـن: دیسانەوە دنیا پڕپڕ لە نەیارە. تاکوو دەدانی چەکدارە. تانک و تۆپ و تەیارە و بۆمباشی هەیە. لەشکرێکی بێ‌سنوور و بەدەستوور و لە ئامادەباشی هەیە. لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا، لە باکوور و باشوور ئاوا. بەدەستی خاڵی چ دەکرێ، ئەوەندوکەی هەشە دەبرێ و دەبرێ!!!

خۆشکم! برام! ئەی خنکاوی نێو بێـدادی! بڕست لێ‌براوی بێ‌ئازادی! ئەی ماف خوراو! سامان براو؛ لە ژین کراو! بە تەلدڕوو پەرژینکراو! هەستە راپەرە بخوێـــــنە. مافی خورا وت وەستێنە. خۆت بە دنیا بناسێنە. دینت بە گەل راگەیێنە. دە ئەرکی خۆیان گەیێنە. ئەوەتا خۆت

بیستت و دیت چین بەسەرهات. چۆن داری بەدکاریی نەیاری دین وەبەرهات؟

هەستە؛ رابە! بەقسەی نەیار رامەمێنە. دۆستانت وەخەبەر بێنە. هەتاکوو بێنەوە سەرخۆ. ئەوکاتی هەرکەس لەبەرخۆ. بۆ رزگاربوون لەم ژێوارە نالەبارە، لەم واقیعە تاڵ و تفت و بە ئازارە، بۆهێنانەوەی سەروەری لەدەستچوو، بۆ لەناوبردنی هەرچی زێف و زۆر و زەبر و زەنگە، بڕینی دەستی ستەمکاران، دەرمانی برینی هەژاران، چارەسەری خاکەساران، بۆ ئازادی بە جوان و پیر، دەست دەینە خەباتی شێلگیر.

**وریا بە!**

دەبێ زۆریش وریای خۆبین پتر لەوە لێکمان نەکەن. بەگژ یەکترماندا نەدەن. زۆر واهەیە پێمان‌دەڵێن:

فلانکەس پیرە بیری کۆنە بێ‌تەگبیرە، فیسار لاوە هێشتا کاڵــە نەگۆراوە، فلانەکەس «متجددە» ڕێبازی تازە و جدیدە، یارۆ دەروێش یان سۆفی‌یە، دەگەڵ تێکۆشانی نییە. ئەمەیان بوەتە وەهابی. بۆوەی نابێ لەگەڵیابی. ئەمە بێ‌ریش و مێـزەرە یا جبە و عەبای دەبەرە. هۆوە سەر بە فلانە جێ‌یە و دمی فیسار شێخی پێیە. ئەمە رەشە ئەویان بۆرە، ریشی درێژە سمێڵی زۆرە. تا هیچمان پێکەوە نەبین یەکدڵ و یەکشێوە نەبین. ئەوانەی ئاوا دەبێـژن، ئەسری[1] تیمساحی دەرێژن. دلسۆز نین بە گوێیان مەکە. لە لای خۆت قەت جێیان مەکە. ئەو شتانەت بە گوێ‌دا نەچی. کوڕ بە لە سەر ڕێ لانەچی. هەندێ تۆمەت و بوختانن. هەڵبەسراوی دوژمنانن. هەندێ هێڵ و خەتیان هەیە. لە دین‌دا بنەرەت[2]یان هەیە، تۆمەز[3] لارییان تێ‌کەوتووە، برێ باریان لێ‌کەوتووە وەسە[4] مەلاتی‌یەکەی[5] خۆمان کە بوەتە بەردی بن گۆمان، لە سەر رچەی خۆی نەماوە. لە دۆخی خۆی ترازاوە.

---

١ ـ ئەسر: ئەسرین، فرمێسک. هەنبانە

٢ ـ بنەرەت: بناخە، رەگەز، بنەچە.(هەنبانە)

٣ ـ تۆمەز: بە بروام، واگومان دەکرێ.(هەنبانە)

٤ ـ وەسە: چون، شبی، لە گوێن.(هەنبانە).

٥ ـ مەلاتی: کاری مەلا، مەلایەتی.(هەنبانە)

دەبێ بزانین: ئەو جیاوازییانە سروشتین. نابێ ببنە هۆی جودایی. ئەم رچانە هەریەکەیان رێــبازێکی خواپەرستین لانیکەم لە گوشە نیگا و بۆچوونی پەیرەوانیانادۆزی هەموان بە خوا گەینە. لەگەڵ ویدا کەین و بەینە.

دەبێ هەموومان یەکدڵ بین وەک شیلان نەبین، یەک چڵ بین. پێویستە وێکرا تێکۆشین. چاو لە رواڵەتمان بپۆشین. دەست لە نێو دەستی یەک نێین. بەرەو مەبەستی یەک بێین. پێکەوە بین گروچراین، لێکەوە بین، بێژە مراین.(١)

ئەوەی بەسەرمان هاتووە، زۆری لە خۆمان رابووە. تەمبەڵی و دنیاپەرستی، کزی و سڵی و بێبرستی، تێنەکۆشان، ژین تێکنەوان، ئێـــــــــرەییمان، یەکتر دزان، دەست وێکنەدان، بەدگومانی، دووزمانی، ترسی نانی، خەڵک بە هیچ و پووچ دانان، خۆ بە تەواو و زل رانان، لێمان بوونە بە گیاکەڵە. کەوتینە نێو داو و تەڵە.

دەجا با بێینەوە سەرخۆ: قەول دەین هەوڵ دەین، یەکدڵ و یەکزمان و رەنگ بین. لە وردە شەڕان بێدەنگ بین. لە پێشا خۆمان چاکەین. ئەوسا لە خەڵک هەراکەین. زانای لە ئیش دورە پەرێز بۆ خۆشی خێر ناداتەوە. خەوتووی ئاگا لە خۆ نەما و نوستووی خەبەر ناکاتەوە. پاشان دەست دەینە تێکۆشان بە بێوچان بەدەست و زمان بە ماڵ و گیان بە یەکرێزی، بڕۆینە پێش، بڕۆینە پێش، تا ئەو کاتەی بە یارمەتی خودای مەزن، قورئان و یاسای شەریعەت سەر لە نوێ دەچەسپێتەوە. حوکم و دەسەڵاتی رەوای زەوتکراوی مسوڵمانان دەسێنێتەوە.

برام! خوشکم! لە گۆشەنیگای(٢) دینەوە و بەرای تەوای پسپۆڕان؛ جەماوەری زۆری لێکراوی بێباک خەوتوو لە تێکۆشان کەوتوو حیسابی مردووی بۆ دەکرێ!

**جاگوێ راگرە بۆ تەڵقینم:**

ئەی ئەو کەسەی بێجوڵان و تێکوشانی! لە کۆ(٣) دانیی! گوێرادێرە بۆ تەڵقینم! خودای گەورە بێتە فریات، شارەزات کا و زیندوو بیەوە. بتوانی وەڵام دەیەوە!

---

١ -مراین: کوژراین، گیانمان لێسەندرا.(هەنبانە).

٢ ـ گۆشەنیگا: دیدگا.

٣ـ کۆ: زۆر شت پێکەوە، چات، لێک کۆبوونەوە.

هەستە وەژی تێكۆشە، بەرگی ڕاپەڕین بپۆشە. بەرەو مەبەست بكەوە ڕێ. جا لە ڕێدا خەوتووەكان و مردووەكان و بێخەبەران؛ نابەلەدان: لێت دەپرسن: بۆ كوێ دەچی؟بلێ بەرەو ڕەزامەندی و لێخۆشبوونی خودای گەورە.

لێت دەپرسن: ڕەزامەندیی لە چیدایە؟

بلێ: لە دامەزراندنی كۆمەلێكی پڕ لە دادپەروەری وادا كە ستەمی تێدا نەبێ، كەسێ بۆ كەس ئاغا نەبێ، یان دانەبێ، ترس لە خوا نەبێ، نەبێ.

لێت دەپرسن: ڕێگەت كامە؟

بلێ تێكۆشان «الجهاد» ڕێگامە.

لێت دەپرسن لە مامەلەت چت كڕیوە، چت پێداوە؟

بێژە: خواگیان ماڵ و گیانی لێكڕیوم، بەهەشتیشی بۆمداناوە.

لێت دەپرسن: یاسات كامە؟

بلێ ئائینی ئیسلامە.

لێت دەپرسن: ڕێنوێنت كێیە؟

بێژە: «محمد»ی «نبی»یە.

لێت دەپرسن: گەورەترین ئارەزووت چییە؟

- بلێ مردن لە ڕێی خوادا و شەهیدییە.

لێت دەپرسن: زێد و نیشتمانت كوێیە؟

بلێ هەموو ئەو شوێنانەی ئایینی ئیسلامی لێیە.

لێت دەپرسن: لە كام گەلی و ڕادەیان چەن هەزارێكە؟

بلێ پێیان: لە ئومەتی پێغەمبەرم -د- كە زیاتر لە ملیارێكە.

لێت دەپرسن لە زوبانی ڕەسمی زێدت!

بێژە پێیان هەرنەتەوە، زمانێكی ڕەسمیمان هەیە پێی دەدوێین و زمانی نێو نەتەوەییشمان عەرەبییە كە خەلاّتی قورئانی تێرا نێردراوە.

لێت دەپرسن: چ چەكێكت لە شاندایە و دەستكردی كام فابریقەیە؟

واچە[١] چەکی باوەڕم هەس، کر[٢]ی بیر و مێشک و هۆشە. بێزامار کردن و کوشتن و بێ دووکەڵ و بێ شریقەیە.

لێت دەپرسن کێ پشتیوانیت لێدەکا؟

بێژە: خواگیان بە هۆردووی خۆی پشتم دەگرێ و سەدان کۆمەگیم پێدەکا.

لێت دەپرسن خوا بەڵێنی سەرکەوتنی پێداوی؟

بلـــــــێ: بۆچی؟ خوای میهرەبان هەم لە قورئانی پیروزدا و هەم لە سەر زمانی پێغەمبەردبەڵێنی سەرخستن و مزگێنی پیرۆزبوونی پێداوم.

برای خۆشەویست و هێژا! لە کەس مەترسێ و مەخەجڵێ، بە بێ دردۆنگی و دوودڵـی جوابیان دەوە، بێتو راست بی و بۆ خودای گەورە ساغ وەبی و بۆ رێی وی خۆ پالاوتەکەی کەس ناتوانی بەرهەڵست بێ و دەستت بگرێ و بێکۆسپ و گرێ دەچییە پێشێ. جا یان مەبەست وەدەست دێنی و حوکمی قورئان دەچەسپێـنی یان ئەوەتا بە ئاواتی گەورەت دەگەی و گیانی خۆت لە رێی خوادا بەختدەکەی و لە هەر دوو لاشەوە رەزامەندی خوای گەورە پێکدێنی.

لە رێگایەش وەستایانە و وریایانە هەنگاو بنێ. بزانە لە کام قۆناغەدای، چی پێویستە. لێی وە کولە راوێژ بکە. پەلەی مەکە و قەت لە خۆشت بایی مەبە و سەرکەوتن هەر لە خوا بزانە. تۆ تەنیا هەر ئامرازێکی بەدیهێـنان و شوێـندانان بەدەست خودایە. لەسەر تۆ هەر تێکوشان و خۆڕاگری و راست و درووست هەوڵدانە. ئەوەش بزانە سەرکەوتنت مسۆگەرە و خودای گەورەش دەستەبەرە.[٣] بەم بەڵگانە:

١-چەن فەرموودەیەکی پێغەمبەرلەم بابەتەوە هەن کە یەکێکیان ئەمەیە: «احمد و بزار» گێـراویانەتەوە لە حوزەیفەی کوری یەمان؛ دەڵـێ پێـغەمبەر فەرمووی: «پێـغەمبەرایەتی ئەوەندەی خوا بییەوی لە ناوتاندا دەبێت پاشان هەر وەختێک ویستی لایدەبات. ئەمجار جێ نوشینایەتی لە سەر شێوەی پێغەمبەرایەتی پەیدا دەبێ و ئەوەندەی خوا بیهەوێ دەمێنێتەوە. دوایە هەروەختێک خواویستی هەڵـی دەگرێـتەوە. ئەمجار پاشایەتیکی گەزندە پەیدادەبێت و

---

١ - واچە: بێژە، بڵێ.(هەنبانە بۆرینە).

٢ - کر: دەسکار. هەر ئەو سەرچاوە.

٣ - مسوگەر: حەتمی. دەستەبەر: زامن.(هەنبانە).

ئەوەندی خوا بیهەوێ دەمێنێتەوە. ئەوجار کە ویستی لایدەبات. دوایە پاشایەتێکی ستەمکارانە دێتە مەیدانەوە و ئەوەندەی خوا حەزکار دەمێنێتەوە. پاشان کە خوا ویستی هەڵی‌دەگرێتەوە. ئەمجار جێ نوشینایەتی لەسەر شێوەی پێغەمبەرایەتی پەیدا دەبێت، دوایە بێدەنگ بوو»[1]

لە راستی‌دا بەشی زۆری ئەوانەی پێغەمبەر -د- هەواڵی لێ‌داون هاتوونە جێ: وەکی جێ نوشینایەتی، پاشایەتی گەزندە و پاشایەتی ستەمگەرانە. ئێستا ماوە، جێ‌نوشینایەتی لە سەر شێوەی پێغەمبەرایەتی بێتەوە ناو. کە پێویستە هەوڵی بۆ بدرێ و کاری بۆ بکرێ تا هەرکاتێک خوا ویستی ئەو پێز و پیت و بەرەکەتە بە مسوڵمانان ببەخشێتەوە و سەروەری و دەسەڵاتی لەدەستچوویان بۆ بگەڕێتەوە و بەو پێیە لە هەموو گیر و گرفتێک بێنە دەرێ.

۲- ئایینی ئیسلام بە باوەڕ و یاساوە هەم بەڵگەی زانستیی لەسەرە و هەم دەگەڵ سروشتی مرۆڤ و واقیع‌دا دێتەوە و لە دارشتن و رێکخستنی‌دا هێز و وزە و لێهاتویی پەیڕەوانی وەبەرچاو گیراوە و وەڵامی تەواوی پێویستی‌یەکانی جەستەیی و دەرونی و گیانی دەداتەوە. نیازی بە پێهەڵگوتن و درۆ بۆکردن و چاوبەستن خەڵک و کەڵکوەرگرتن لە زۆری سەرەنێزە نییە و ئەگەر ئەوکەسەی رایدەگەیەنی، پێشەکی لە خۆیدا جێی‌بکا و بە تەواوی لێی بەڵەد و شارەزا بێت و شێوەی بانگەوازیش بزانێت‌مەگەر بانگکراوێک کە هەل و مەرج و عوورزەی[2] تێگەیشتن و وەرگرتنی راستەقینەی نەبێ‌دەنا بێگومان خەڵک بە دەنگیەوە دێن و سەرکەوتنی لە دەعوەت‌دا مسۆگەر و حاشا هەڵنەگرە.

۳- یاسای ئیسلام لە مێژوودا بە کردەوە نیشانی‌داوە کە دەتوانی خزمەت بە بەرەی مرۆڤ بکا و خەڵکی بحەسێنێتەوە و ئەو ماوەی دەسەڵاتی بەدەستەوە بوو شارستانیەت و زانست و سنعات لەوپەڕی سەرکەوتنی گونجاودابوون. ئەوجار ئایینی ئیسلام سەرەڕای ئەوەی خۆشبەختی و سەربەرزی دنیایی پێوەیەبە پێچەوانەی یاساکانی غەیری خۆی رزگاری ئەو دنیا «پەسڵان»یش دەستەبەری دەکات.

۴- ئەو بەناو یاسا و رێسا دەستکردانەی خەڵکیان بۆ دەعوەت‌دەکەن لە سروشتی مرۆڤ و مرۆڤایەتی دوورن و هەرچەند پێیان هەڵبلێن و شاخ و باڵیان لێ‌بنێن و پڕ و پاگاندەیان بۆ بکەن

---

۱ - ئەو فەرموودەیە «مرفوع»ە.

۲ - عوورزە: شیاوی.(هەنبانە).

دەگەڵ ویست و ئاتاجی مرۆڤ نایەنەوە و ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بتوانن خەڵک فریودەن و بە راستەقینە و بەکەڵکهاتوویان بناسێنن لە مەیدانی کردەوە و چەسپاندندا ناوەرۆکیان دەزڕێ و بە هیچ دەردەچن و خەڵکیان لێ دەکشێتەوە.(١)

٥ـ هەرئێستا خەڵک ئاکام و بەرهەمی شارستانیەتی ماددی لەبەرچاوە و دەبینن کە لەم چاخی زانست و بەرەوپێش چوونەدا چۆن شەڕ و هەرا دنیای گرتۆتە بەرو دەوڵەتەکان لەجیاتی هەنگاونان بەرەو خۆشی و ئاسایشی هاوولاتیان، روویانکردۆتە سازکردنی چەک و چۆڵ و تەقەمەنی و بەتایبەت لە دروستکردنی چەکی کیمیاوی و ناوکی و زەرری(٢) داکەوتوونە کێبەرکێ و داهاتی ولاتەکانیان بە زۆری لەو رێیەدا خەرجدەکەن لە حالێکدا کە بەشێکی زۆری خەلکەکەیان لە ژێر مەترسی لە برسان مردندا ژیانی نەمر نەژی دەبەنە سەر.

ئەوەی زۆرتر لە رادویکان دەبیستری و لەسەر روی تەلەفزیۆنەکان دەبیندرێ و دەگوترێ باسی شەڕ و کۆشتاری بە کۆمەڵ و فرۆکەی شەڕکەر و چەک و چۆڵ و خوێـــن و هەلمەت و هێرشبردنە سەر و بەدیلگرتن و لە داردان و ئەوانەن.

لەحالێکدا کە ئەو هەموو رێکخراو و دامەزراوە نێونەتەوەیییانە هەن و بەناوی دیفاع لە ئازادی، مافی مرۆڤ ، ئاشتی و چی و چیکار دەکەن!!

پێـم بەجێیە کورتە باسێکی یەکێک لە حەوتونامەکان کە لە مەبەستی ئێـمە دەدوێت؛ بکەمە پاشکۆی باسەکەمان و پاشان مالاواییتان لێبخوازم؛ کە ئەمەش دەقەکەیەتی:

**«رووداو و پێشبینییەکانی جیهان سەرکەوتنی ئیسلام دەردەخەن»**

وەک:

«یەکەم تەوژمی (بێـــــداری ئیسلامی) لە رۆژئاوادا گەیشتۆتە رادەیەک کە لە قۆناغی (دەعوە) دەربچێت و بچێتە قۆناغی کاری سیاسی ئیسلامی و چوونە ناو پەرلەمانەوە. ئەمەش

---

١ ـ تێکڕمانی کەڵەکی کۆمۆنیزم و رووخانی یەکیەتی سوڤیەتی پێشوو کە دایکی سوشیالیزم بوو و هەروەها لەبەریەکهەڵوەشانی دەوڵەتانی ئوروپای رۆژهەلات بەڵگەیەکی زیندویە لە سەر بەکەڵکنەهاتوویی و بێناوەرۆکی یاسا و بەرنامەی دەسکردی مرۆڤ.

٢ ـ چەکی ناوکی: سلاح هستەای. چەکی زەرری: سلاح اتمی. چەکی کیمیاوی: سلاح‌شیمیایی.

ئەوە دەگەیەنێت کە لە داهاتوودا چ نێـــزیک یان دوورهیچ بڕیارێک و تەنانەت رازیبوونیش لەسەری، بێئامادەبوونی ئەو موسڵمانانە سەرناگرێت و ناگاتە ئاکام لە پاشانیشدا بەرەو ئەوە دەڕوات کە دژایەتی رۆژئاوا کەم و کاڵ ببێتەوە بەرامبەر ئیسلام و شوێنکەوتوانی. هەروەکوو دەبینین کە (حیزبی ئیسلامی بەریتانی) هاتۆتە گۆڕەپانەوە لەگەڵ (حزب الامە)ی ئەمریکی کە دامەزرێنەرەکانی هەموو رەشپێستن و هەردوکیان ئەندامیان هەیە لە پەڕلەمان و کۆنگرێسدا. خۆ باس لەو هەموو دەزگا و رێکخراوە گشتی و خێـــرخوازی و فێـــرخوازییە ناکەین کە لە ژمارەنایەن و سەرانسەری رۆژئاوایان گرتۆتەوە.

«دووەم تەکنۆلۆجیای نوێ و زانستە پێشکەوتوەکانی جیهان. موعجیزە زانستیەکانی ناو قورئانیان زۆرتر دەرخستووە. ئەوەش بۆتە هاندەرێک بۆ دروستبوونی چەندەها رێکخراو و دەزگای تایبەت بەو بوارە لە سەر ئاستی جیهانی و پۆلپۆل زانا و پسپۆڕە ناودارەکانی جیهانی موسڵـــــمان دەبن و زیاتر قەناعەت پەیدادەکەن بە ئیسلام وەکوو بەرنامەی ژیان... جوڵـێـنەری ئەم بۆچوون و فیکرەیە بە زۆری بەڕێـز (د. عبدالمجید الزندانی)یە کە سەرۆکی (مجمع الاعجاز العلمی فی القرآن و السنة)یە و چەندەها، کۆڕ و کۆبوونەوەیان سازداوە لە وڵاتانی جیهاندا... لە بەرامبەر ئەم هەوڵ و کۆششە زانستیانەی ئەنجامدراوە بۆ دەرخستنی ئیسلام، پاشەکشەیەکی لەبەرچاوی فەلسەفە مرۆییەکانی رۆژئاوا هەست پێدەکرێت. چونکە لە سەر کۆمەڵە بنەمایەکی زانستی و بابەتیانە دانەرێژرابوون.

«سێـــــیەم موسڵــمان بوونی ژمارەیەک لە مفکر و رۆژهەڵاتناسی ئەوروپی ناودار، بڵاوبوونەوەی بەرهەمی ئیسلامی تازەیان و گۆڕینی، رێــــــرەوی ژیانی کەسانێکی زۆر لە ئەوروپیەکان. چونکە نوسراوەکانی ئەوان کاریگەرترە لە سەر نەفسیەتی ئەوروپی وەک لە نوسراوە رۆژهەڵاتیەکان، بە حوکمی ئەوەی خەڵکی هەمان جێگەن و لە سەر خاکی خۆیان قەناعەتیان بەم بەرنامەیە کردووە، زیاتر لە گیروگرفتی ناوخۆیی و دەرەکیەکانی کۆمەڵەکەیان شارەزان. وەکوو[لیۆبولـــــد ایس (محمداسد)ی نەمساوی [روجیە گارودی. موریس بۆکای. یوسف اسلام (کات ستیڤنس)] و لەبەرئەوەشە لە کات و شوێـــــــنی جیاجیادا هەندێک لە دەسەڵاتدارانی وڵاتانی ئەوروپی رێــــز و پێـــزانینی خۆیان بەرامبەر بە ئیسلام دەردەبڕن و بانگەشەی پێکەوە دانیشتن و لێک نزیکبوونەوە دەکەن لە نێـــوان ئیسلامیەکان و رۆژئاوادا.

هەروەکوو بانگەشە جیاجیاکانی وەلیعەهدی بەریتانی (ئەمیر چارلز) و بانگەشەی سەرەکوەزیرانی مەجەر لە بەردەم پەرلەمانی مەجەریدا و داوا نەپچڕاوەکانی (جون نەسپۆزیتو)ی رۆژهەلاتناس.

«چوارەم ڕێکخراوە توندرەوەکانی ناو رۆژئاوا و رۆژهەلاتی دوور (الشرق الاقصى) کە لە ناو خۆیاندا و لە دژی خۆیان سەریانهەلداوە، خۆرەی ئەو دەسەلات و سیستەمە نوێنانەی ئەم سەردەمەن چونکە توندڕەوی لە هەر بیروبۆچۆن و فەرمانڕەواییەکدا هەبێت، بەرەو توانەوە و داخورانی دەبات و تائێستاش لە لایەن رژێـــــــمە رۆژهەلاتی و رۆژئاواییەکانی جیهانەوەچارەسەری فیکری و عەمەلییان بۆ دانەنراوە و تەنانەت بەرەنگاربوونەوەشیان کێشەی ئابووری و مرویی بۆ دروستکردوون. وەکوو ئەو دەستە توندرەوەی ئەمریکا کە تەقینەوەکانی (ویلایەتی ئۆکلاهۆما)ی گرتە ئەستۆی خۆی. یان جەماعەتی (ئۆم)ی یابانی کە پیلانی رشتنی گازی کیمیاوییان ئەنجامدا. یان (جیر نۆفسکی)ی روسی و بۆچوونە توندرەوییەکانی کە تا ئێستاش کارلێکدەکەن لەگەل دل و دەروونی گەلی روسی و دەمارگیری و رق و کینەیان بۆ دروستدەکات.

«پێنجەم زۆری ژمارەی موسلمانانی جیهان وەکوو ئۆممەتێکی گەورەی خاوەندینێکی رەسەن و تەواوکەر بەراوردبکرێت لەگەل هەموو پەیرەوانی دیانەت و فەلسەفەکانیتری جیهان... ئەمەش هێزێکی مرۆڤیی گەورەیە بۆ ئایندەی خیلافەت و ژیاری ئیسلامی. زیاتر لەبەر ئەمەشە کە لە سالی ١٩٩٤دا کۆنگرەیەکی جیهانی گیرا بۆچۆنیەتی سنووردانان بۆ زیادبوونی دانیشتوانی ولاتانی ئیسلامی بەتایبەتی و جیهان بە گشتی لە رێگەی دیاریکردنی منالبوون و لەباربردنی منالــەوە... و زۆرترینی بریارەکانی رویدەکردە ولاتانی جیهانی سێیەم کە ولاتە ئیسلامییەکان بە پێکهێنەری گەورەی دادەنرێن.

«شەشەم زیاد بوونی بروقەوارەی بێداری ئیسلامی لە ولاتانی ئیسلامی و عەرەبی بە گشتی و ولاتانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بەتایبەتی، کە ئەمەش چەندەها کێشەی بۆ رۆژئاوا دروستکردوون وەک: هەرەشەکردن لە مانەوەی (ئیسرائیل) و تەقینەوەی رووداوەکان لە

میسر و جەزائیر و گرتنی دەسەڵات و حوکم لە سودان و ئەفغانستاندا.[١]

«حەوتەم سەرچاوە ئابوریە بەهێزەکانی جیهان وەکوو نەوت و کەرەسە خاوەکانی وەک ئاسن و ئالتوون و... هتد لەناو خاکی ئیسلام و لە ژێر دەستی وڵاتە ئیسلامیەکاندایە، ئەمەش هێزێکی‌ترە لە پاڵ هێزە مرۆڤییەکەدا و شوێنی خۆیان دەگرن لە بنیاتنانەوەی شارستانیەتی ئیسلامی... هێرشی داگیرکەران لە کۆندا و جەنگی دووەمی کەندا و لەم دواییەدا ئەمانە هەموو دیار و ئاشکران بە چ راز و نیازێک ئەنجامدراون.

«هەشتەم لە دوای هێزی ئابووری و مرۆڤیی هێزی سییەم دێتە پێشەوە کە لە پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆجیادا خۆی دەبینێـــــتەوە. ئە ویش گەشەسەندنی زانستیانەی هەندێک لە وڵاتانی ئیسلامیە لەرووی (پیشەسازی و ئاوەدانکردنەوە و بەرهەمهێنانەوە) وەکوو وڵاتانی مالیزیا و ئەندونیسیا، کە لەو بوارانە دا پشت بە خۆیان دەبەستن و بازاڕی ئەوروپی و ئەمریکی لە خوارووی رۆژهەلاتی ئاسیادا بەرەو کزبوون و لاوازی دەڕوات.

بەم پێیە دەبینین کە شارستانیەتی ئیسلامی بنەما و روخسارەکانی لە دەرکەوتن‌دان و چەندەها لێکولـینەوە و توێـژینەوەی زانستی و فیکری و سیاسی لەمبارەوە کراوە و چەندەها دەزگا و رێکخراوەی بۆ ئامادەکراوە.

لە کۆتاییدا دەڵێین: روداوە دڵتەزێـنەکانی بۆ سنە و چیچان و تاجیکستان و فەلەستین هیچ لەم راستیانەی باسمان‌کردن کەم ناکەنەوە بەڵکو زیاتر قەناعەتمان بۆ پەیدادەکەن کە سەرکەوتنی ئیسلام و مسولمانان لە نزیکبوونەوەدایە بۆیە پیلانیان لە دژ دەگێرن و سیاسەتی لە بنەوە نەهێشتن و برسی‌کردنیان لەبەرامبەر ئەنجامدەدەن»[٢]

ئەمانە و زۆر بەڵگەی زەقی‌تریش هەن کە بێ‌گومان و سۆ[٣] سەرکەوتنەوەی سەر لە نوێی موسڵمانان و چەسپاندنی دوبارەی یاسای ئیسلام دەسەلمێنن و تەنانەت هەواڵ لە نزیک

---

١ ـ راپەرینی ئیسلامی گەلانی ئێران لە ساڵی ١٣٥٧دا بە پێشەوایەتی زانایانی ئایینی و سەرکەوتنی بەسەر رژێمی پاشایەتی و ئەمریکای دنیاخۆردا و هەروەها خوراگرتنی لە بەرامبەر شەری داسەپاودا نموونەیەکی زیندووی دیکەی سەرکەوتنەوەی مسوڵمانانە.

٢ ـ حەوتوونامەی الاتحاد ژمارە ٤٦.

٣ ـ سۆ: گومان و دوودڵی.(هەنبانە).

بوونەوەشی دەدەن، بۆیە دەبێ زۆر لێـــــــزانانە و نەبەزانە دەست دەینە دەستی یەک و بە تێکۆشانێکی هەمەلایەنە ئەرکی دینی و ئینسانی سەرشانمان کە لە سێ خاڵـــــی سەرەکی: ناسینی ئیسلام بە تەسەلی، جێکردنی لە خۆماندا لە دوو گۆرەپانی بەندایەتی و پێـــــوەندییەکانمان دەگەڵ ئەندامەکانی دوور و نزیکی کۆمەڵ و راگەیاندنی بە شێـــــوەی زانستیانەی بانگەوازی، دا کورت هەڵـدێــتەوە؛ بە ئەنجام بگەیەنین تا بە هیوای خوا قۆناغی سەرەتایی ئەرکمان کە بڵاوکردنەوە و راگەیاندنی ئاشکرا و روونکەرەوەی دینە، یان بە لێکدانەوەی قورئان «البلاغ المبین»ە تێـــپەڕدەکەین و بەرەو ئامانجی پیرۆزی دوا رۆژمان کە چەسپاندن و سەقامگیرکردنی سەر لە نوێی حوکم و دەسەڵاتی دینی ئیسلامە هەنگاو دەنێین و خوا یاربێ پێشیدەگەین. خۆ ئەگەر سەریش نەکەوین و بەرهەمی تێکۆشانەکەمان بۆ بەرەی دوای خۆمان بێت لانی کەم خوای پەروەردگار لە خۆمان رازیدەکەین و هیچ مسوڵـمانێکیش دەستەبەری سەرکەوتن نییە و ئەوەی لە سەر ئێـــمە پێـــویستە هەوڵـــی راست و دروستی بەردەوامە و ئیتر پیرۆزبوون و بە ئامانج گەیشتنمان هەر بەدەست خوایە.

بێگومان ئێوەش دەزانن کە فەرموودەی «العلماء ورثه الانبیاء...» واتا زانایان میراتگرانی پێغەمبەرانن، هەر بۆ زانایانێک نییە کە لە حوجرە دەرسیانخوێندبێ و ناوی فەقێ، یان مەلایان بەسەرەوە بێ، بەڵکو هەرکەسێکی مسوڵمان بە پێ شارەزایی و تێگەیشتنی لە دین ئەو میراتەی پێدەبرێت و دەبێ ئەمانەتداری لێبکات و بەجێی خۆی بگەیەنێت. جا با قەت رێـی دە حوجرە نەکەوتبێ و دەرچووی خوێندنگە رەسمییەکان بێ و یان هەر بۆ خۆی بە موتاڵا پێگەیشتبێ. تەنانەت بە شەمیراتی بابایەکی لێهاتوو و لەکڵدەرهاتووی ئاوا زۆر زیاترە و ئەرکی گرانترە لە ئەرکی مەلایەکی کە بە نێو ئیجازەی مەلایەتی و ودمی رێنوێنی و شارەزاکردنی پێـیە و بەڵام وەک پێویست سەری لە دین دەرناچێ و هیچی وای لە باراندا نییە.

ئەمە لە سەرێکەوە حاشای لێناکرێ بەڵام لە سەرێکیترەوە لەبەر ئەوەی زانای ئایینی، یان باشتر بڵێن؛ مەلا لە سەرەتاوە بە ئامانجی فێـربوونی دین و راگەیاندنی، وە بەر خوێـندن دەنرێ و رشتەکەشی بە زۆری لە زانستە دینییەکاندا کورت هەڵدێتەوە و بە بڕوای خەڵک ئەو ئەرکە هەر لە سەرشانی وانە و متمانە زیاتر بەوان دەکات، بە شەمیراتی ئێـــمە پتر و ئەرکی سەرشانمان قورستر دەبێت.

جا کەوایە ئەی مسوڵـــمان! با بە پشتیوانی خوای گەورە و بۆ رازیکردنی ئەو، دەست پێبکەین. کەین و بەینمان خۆشکەین، بێخۆڵادان، دوور لە ئاڵۆزی و خوڕانان، هەر بە شێوەی شیاوی قورئان کە دەفەرموێ: «خەڵکی بانگ بێڵە بۆ سەر رێبازی پەروەردگارت بە قسەی رێک و پێک و بەجێ و رێ و پەند و ئامۆژگاری جوان».[1] خەڵک بۆلای دین بانگ بێڵین، پێیان بڵێین کە هەر بە نوێژ و بە رۆژ و «ذکر» و دوعا تەواو نابێ. بەڵکوو دین زۆر فراوانە و بەقەد هەموو بیر و هەست و ویست و مەبەستی ئینسانە. حاڵییانکەین کە پێویستە لە تەواوی بارو بواری ژیانیاندا یاسای ئیسلام بچەسپێنن تا سەروەری و بەختەوەری وەدەست بێنن.

نە رەنگ و نژاد و زمان، نە ئاو و خاک و نیشتمان، نابنە هەوێنی یەکگرتن. هیچ شتێک نییە وەکوو ئایین بێسنوور و بەتان و پۆ و بە خۆوە بێ. هەموو تۆرەمە وتیرەیەک تێکرا لە دەوری کۆوە بێ. هەرچی هەیە سنووردارە و پاش مەودایەک دەبرێـتەوە. بێـجگە لە دین کە تەواوی مرۆڤەکان دەگرێتەوە.

ئەگەر کەمێک بیر وەکەین، ئاورێک لە خۆمان وەدەین، تێـدەگەین و دەبینین وا ئێـمەی مسوڵمان بە تێکرا، لە حەوت ئیقلیمی دنیا، هەقمان دەخورێ، بەشمان دەبرێ، نەوەک هەر لەو وڵاتانەی کە ئێــمە تێــیاندا کەمایەتین، بەڵکوو لەو مەملەکەتانەش رادەی زۆری دانیشتوانی مسوڵـــــــمانن، لە رۆژئاوا تا رۆژهەڵات، نزیک و دوور، سەروخوار، باکوور و باشوور، لە ئەندونیسیا تا مەغریب، قەزاق تا سۆماڵی غەریب، بێدەسەڵات و مافخوراو، لێکدابراو و دەرکراو لە نێو سەدان دەرد و بەڵا و گێرە و کێشەی باری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی، دەتلێینەوە. کز و لاواز ماندوو و مجرۆ لەدوای جەم و پاروەنانێک دەخولێینەوە.

بەڵــێ بۆوەی زێــدی خۆبستێـنینەوە مافمان وەدەست بێـنینەوە، هەموو دەردێکمان چارکەین، زامەکانمان تیمارکەین، دەبێ هەموو وەخۆ کەوین. رابین بە خۆماندا بێـــــــین. لە ئاسوودەیی و کات و ماڵ، تەنانەت لە خوێـــــن و گیانی خۆشمان مایە دابنێـــــین. دەبێ بۆ وەدەستهێنانی ئەو ئامانجە پیرۆزەمان لانیکەم، وەک سەربازێکی خەباتکارانی رێی ئیسلام هەستینە پێ و وەکوو شاگردێکی چکۆڵەی کەڵە پیاوان و لە خۆ بووردوانی نێو مێـژووی پڕ لە

---

١ - ١٢٥ / النحل

شانازیمان وەکی: شێخ محمد عبده، سید جمال الدین أفغانی، اقبال لاهوری، صلاح الدین ایوبی، حسن البنا، سید قطب، شێخ مصطفی صبری، ابوالاعلی مودودی، سەعید نورسی، سەید ابوالحسن ندوی و هەموو هەلکەوتوان و پەسنکراوان و یاریدەرانی رێبازی تێکوشان و گیانبازی ئایینی پیرۆزی ئیسلام کە تاقە رێبازی راستەقینە و دادپەروەری و یەکسانی و سەروەری و پێشکەوتن و یەکگرتن و بە ئاوات گەیشتنە، هەر بێینەوە.

لە کۆتاییدا وێرای داوای لێبوردن و نزای خێر مالاواییتان لێدەکەم و لە پەروەردگاری مێهرەبان دەپارێمەوە ئەم رەنجەم بە فیرۆ نەدات و سەرئەنجامی ژیانی من و ئێوەش بەخێر بگیرێت، ئامین ئیتر مالتان ئاوا و ئەسپاردەی خوا بن.

بە نێوی شای شایان

هەرچەندە بە پێی ماڵاوایی کردنم بڕیار وا نەبوو ئاوا زوو بگەڕێنەوە، خزمەت ئێوە خوێنەرانی هێژا، بەڵام دوای هەڵوێسانێک، رام هاتە سەر ئەوە، ژیـاننامەی هـەندێک لە مامۆستا دەرسبێژەکانی کوردستان بکەم بە پـاشکۆی ئـەم کـتێبە بـۆ ئـەوە بـناسرێن و ئەمەگداری و پێزانینێکیش بێت لە بەرانبەر هەوڵ و رەنجی ئەو بەڕێزانەدا.

سەرەتا، نیازم وابوو ئەوکارە بۆ هەموو ناوچەکانی کوردستان بکەم بەڵام دیتم ئەوە لە توانای مندا نییە و کتێبەکەش لە تام دەچێتە دەر، بەتایبەت لە بار و دۆخی نالەباری ئابووری ئاوساوی ئێستادا!!

جا بۆیە کورتم هەڵێناوە لە سەر ناوچەی سەردەشت و هـەندێک لەو دەرسـبێژە بەڕێزانەی، خەڵکی ئەوێ بوون، یان لەوێ ژیاون، کە لە سەرێکەوە بە خزمەت زۆربەیان گەیشتووم و تەنانەت هێندێکیان مامۆستاشم بوون و بەدەستهێنانی ژێنامەکەیان بۆ من هاسانتر بوو.

لە سەرێکی دیشەوە ناودارانی مەڵبەندی زاناپەروەری سـەردەشت بـە نـیسبەت ناودارانی ناوچەکانی دی، لە نێو، لاپەڕەکانی مێژووداکەمتر ناسێنراون و تاپۆکراون.

پێشەکی بە ئەرکی سەرشانمی دەزانم کە سپاسی زۆری یەکەیەکەی ئەو سەرووەر و دۆستانە بکەم کە لە کۆکردنەوەی ئەو پێناسانەدا یارمەتییان دام.

سەید مستەفای زمزیرانی

حەمامیان بۆکان



## ماموٚستا مەلا «برایم»ی سیسێری

ئــەمن «ئـیبراهـیم» کوڕی مـەولان، نـاونیشان «ئیمساعیل‌زادە» لە سـاڵی (١٢٩٩)ی، کـــۆچی هــــەتاوی‌دا، لە ســیسێر یـەکـێک لە دێــیەکـانی شـارستانی سـەردەشت، ئـوستانی ئـازەربایجانی رۆژاوا لەدایک بووم. بـابم کە وەرزێر بوو لە تـەمەنی (٧) ســـاڵیدا نــاردمیە حــوجرەی ســیسێر بــۆ خـــــوێندنی زانســــتە دیــنی‌یەکــان و هـەر لەو حوجرەدا خوێندنە سەرەتاییەکانم تێپەڕ کـردن تـا گـەیشتمە قـۆناغی دووهـەم، واتـە موستەعیدایەتی کە بە موستەعیدایەتی، چەند، ساڵێکان لە خزمەت بەڕێز، ماموٚستا مەلا سەید «حوسەین» حوسەینی کە مەلای ئەوێ بوو خەریکی خوێندن بووم، تا ئەوکاتەی چرای ژیانی کوژایەوە و ماڵاوایی لە دنیا خواست. دوایە لە ساڵی (١٣٢٢)ی کـۆچی، مانگی‌دا زاگەی خۆم بەجێ‌هێشت و چوومە دێی «قۆزلوو»ی خوارێ لای مـاموٚستای پایەبەرز، زانای بە نەرخ حاجی ماموٚستا، مەلا عەبدوڵلای محەممەدی ئیمام‌جومعەی ئێستای شارستانی سەقز کە ئەودەم پێشنوێژ و دەرس‌بێژی ئەوێ بـوو و لەوێ «شـرح

العقاید» و «جمع الجوامع»م دەخوێند و کەڵکێکی زۆرم لێ وەرگرت. دواتر چوومە دێی «حەمامیان»ی بۆکان، لای مامۆستای بەناوبانگ مامۆستا مەلا عەلی وەلزی (خوا پایەی بەرز کاتەوە) و ماوەیەک لە حوجرەی ئەودا کەسبی زانستم کرد. لەوێڕا گوێزتمەوە بۆ «شێخلەر» لای مامۆستای پیرۆز و بەنرخ، حاجی مەلا شێخ «حەسەن»ی شێخی (خوا پایەی بەرز کات!) و ساڵ و نیوێک لە لای مامەوە و لە دەرسەکانی بەهرەمەند بووم.

دوایە نیزیک (١ـ٢) مانگێکیان لە شاری سابلاغ لە حوجرەی مامۆستای بە پیت و بە ساڵدا چوو و پایەبەرز، مامۆستا مەلا محەممەدی ماوەڕانی مامەوە و کەسبی عیلم و فەیزم کرد. پاشان سابلاغم بەجێ هێشت و بەرە و «گەناو» ڕۆیشتم و ماوەی ساڵ و نیوێک لە حوجرەی مامۆستای مامۆستایان، زانای بەناوبانگ و فرەزان و پایەبەرز مامۆستا مەلا «صالح»، کوڕی مەلا نەجیب کە بە مەلا «صالح»ی بیژوە یی دەناسرا، مامەوە و کەڵکم لێوەرگرت. ئینجا چوومە «گەلاڵە» لای ئەو، مامۆستایە کە حوجرەکەی جێ بارگەی گەورە پیاوان و ئەو تینوانە بوو کە دەیانویست تینوایەتی خۆیان بشکێنن و گیر و گرفتەکانیان چارەسەر بکەن. بەڕاستی مامۆستایەک بوو کە لە ئێران و عێراق نێوبانگی هەبوو و زمان لە حاند باسی رادەی زانست و دیانەت و لێوەشاوەیی، ئەودا لاڵە.[1] وە لەوێش دوو ساڵان مامەوە و لە خزمەت ئەودا، بەهرەمەند بووم و ئیجازەنامە و سەنەتی فتوا دان و دەرس گوتنەوەی زانستە «معقول» و «منقول»ەکانم لەو بەڕێزە وەرگرت. (مامۆستا، لێرەدا چەند دۆعایەک بە زمانی عەرەبی بۆ مامۆستای ئیجازەدەری دەکات) دوایە، ماوەی دوو ساڵ لە گوندی نستان کە زێدی برای خۆشەویستم حاجی مەلا «عەبدوڕڕەحمان»ی خەلیفەزادە، ئیمامی جومعەی ئێستای بۆکانە، مەلایەتی وێرای تەدریسم بوو و پاشان گەڕامەوە بۆ شوێنی لەدایک بوونم (سیسێر) و نیزیکەی (٣٠) ساڵ لە تەمەنی خۆم بە تەدریس کردنی زانستەکانی «مەعقول» و «مەنقول» لە «فروع» و لە «ئوسول» ڕابوارد.

ئەمجار ساڵی (١٣٦١ ک.ما) کۆچم کرد بۆ سەردەشت و بە شێوەی (حق

---

١ ـ مەبەست: حاجی مامۆستا مەلا محەممەدی بۆکانی‌یە کە بە مەلا محەممەدی «رەییس»ی بە نێوبانگ بووە. «وەرگێر»

التدريس) دامەزرام و دەرزی (بینش)ی ئیسلامی و عەرەبیم دەکوتەوە و لەبەر ئەوە لەوێ ماڵم نەبوو و کرێ خانووش گران بوو و پێمان نەدەدرا، بە ناچاری لە ڕێکەوتی ١٧ی ٦ی ٦٦دا سەردەشتمان بەجێ‌هێشت و هاتین بۆ سابلاغ و ئێستا لێرەم و ناشزانم دوایە چ دێتە پێشەوە.

لێرەدا ژیاننامەی خۆم بەو ئایەتە کۆتایی پێدێنم کە خوای گەورە دەفەرموێ: «هیچ‌کەس نازانێ لە داهاتوودا چ دەکا و کەسیش نازانێ لە کوێ دەمرێ»

خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا برایم ئەو ژیاننامەی لە ڕێکەوتی (٢٥)ی پووشپەڕی ساڵی (١٣٦٧)دا نوسیوە و دوا ئەو تاریخە نیزیکەی (٣) ساڵان ژیا و هەروا خەریکی دەرس‌گوتنەوە بوو و لە ماڵێ و لە دەرێ هەر دەرسی دەگوت تا لە ڕێکەوتی (١)ی خاکەلێوەی (١٣٧٩)دا بە هۆی پیری دنیای بەجێ‌هێشت و هەر لە سابلاغیش ئەسپاردە کرا. خوای گەورە لێی خۆش بێت!

مامۆستا ئەگەرچی لەبەر نەخۆشی لاقان، هاموشۆی ئێرە و ئەوێی بۆ نەدەکرا و خۆی دەکاروباری سیاسی هەڵنەدەقوتاند و هەر خەریکی تەدریس و مەلایەتی بوو، بەڵام لەبەر ئەوە ڕژێم لە زۆربەی هەرەزۆری مەلایەکانی کوردستان دڕدۆنگ بوو، مامۆستایان چەند جارێکیان، بە تۆمەتی تێکۆشانی سیاسی بانگ هێشتە دایرەی ساواکی سابلاغ و هەڕەشەیان لێکرد.[1]

---

١ ـ سەرچاوە: دەسنوسێکی مامۆستا کە لەمەر ژیانی خۆیەوە بە فارسی نووسیبووی و هەروەها کوری مامۆستا، ئەندازیار «عەبدوڕڕەحمان»ی ئیسماعیل‌زادە دانیشتوی شاری سابلاغ.



## مامۆستامەلاشێخ‌ئەحمەدی‌شەریعەتی

ســـاڵی (١٢٨٩)ی هـەتاوی پـێی نـاوەتە مەیدانی ژیانەوە. ساڵی (١٣٠٧) لە تەمەنی (١٧) ساڵی‌دا، دەستی داوەتـە خـوێندنی فـــەقێیەتی. دەورانــــی ســـوختایەتی لە گوندەکانی: باساوێ، بێشاسپ، ئاغەڵان، نـەڵاس و بـێژوەی ئـالان تـێپەڕ کـردووە. پـــاشان بـــۆ مـاوەی (٣) ســاڵ بـە هـۆی نەخۆشی دەستی لە خوێندن کێشاوەتەوە. ئەمجار چۆتەوە سەر خوێندن و ماوەیەک لە بێوران و نەڵاس لە لای مەلا عەبدوڵڵای گەناوی درێژەی بە خوێندن داوە. دیسان (٢) ساڵی دیش بە هۆی هەندێک گیر و گرفت، خـوێندنی وەلانـاوەتەوە و دوایـە لە سـاڵی (١٣٢٢)ی هەتاوی‌دا چوەتە گەناوی عەراق، خزمەت مامۆستا مەلا صاڵحی بێژوەیی و ماوەی (٤) ساڵان ماوەتەوە و کۆتایی بە خوێندن هـێناوە و هـەر لە لایـەن ئـەویشەوە ئیجازەی مەلایەتی و تەدریسی پێ‌دراوە.

مامۆستا دوا ئیجازە وەرگرتن دەگەڕێتەوە بۆ ئێران و دەست دەکا بـە مـەلایەتی، هاورێ دەگەڵ تەدریس و تا ساڵی (٤٧) لە دێـیەکـانی بـێوران، دیـوالان و بـێشاسپ رادەبوێرێ و ساڵی (٤٧)یش بە تۆمەتی تێکۆشان بە دژی رژێـم دەگـیرێ و رەوانـەی بەندیخانەی (فەلەکولئەفلاک)ی خورەمابات دەکرێ و پاش ساڵێک حوکمەکـەی بـۆ دەکەن بە تەبعید و دوو ساڵ و نیویش دووری دەخەنەوە بۆ (چابەهار) و (کاشمەر) و (ورمێ) و ساڵی (١٣٥٠) ئازاد دەبێ و دەگەڕێتەوە سەر مەلایەتی و تەدریس لە گوندی (بێوری) سەروو و هەتا سەرەتای راپەڕینی ساڵی (٥٧)ی ئێران لەوێ دەبێ و پاشان دێتە

سەردەشتێ سەر مزگەوتی (دارالسلام) کە ئێستاش هەر لەوێیە و خەریکی مەلایەتی و دەرس‌گوتنەوەیە.[١]

خوای گەورە بەرقەراری بکات لە سەر ڕێگای خۆی!



راوەستاوەکان، ریزی پێشەوە، لە راستڕا بۆ چەپ، خوالێخۆشبوو: ماموستا مەلا محەممەدی باساوەیی، مامۆستا مەلا شێخەحمەدی شەریعەتی، خوالێخۆشبووان: مامۆستا مەلا حسەین کونەمشکەیی، مامۆستا مەلا سەعدی قەڵادزەیی، حاجی مامۆستا مەلا عەلی دولکانی، حاجی عەبدوڵڵا غوڵامی.

ریزی دواوە، راستڕا، سۆفی خدر، حاجی موتەلیب، میرزا قاسم، محەممەدی حەبیبی و هەڵتروشکاو لە پێشەوە حاجی محەممەدی کاکەلاو.

---

١ ـ سەرچاوە: چوومە خزمەتی و ئەو باسانەم لە خۆی بیست.



## مامۆستا مەلا حەسەنی سەعدیزادە ناسراو بە «مەلا حەسەنی گۆڵێ»

ئەو مامۆستایە کە کۆڕی مەلا سەعدی، کوڕی حاجی مەلا حەسەن، کوڕی مەلا سولەیمان، کوڕی مەلا حسەین، کوڕی مەلا یوسف ، کوڕی مەلا برایمە و سیسێری یە، بە پێی ئەوە کە لە خۆی بیسراوە زنجیرەی بنەماڵەکەیان لە پێشەوە، دەچێتەوە سەر مەلازادەکانی واشەمەزین و لە دواییش دا دەگەڕێتەوە سەر حەزرەتی ئەبوبەکر (خ).

بەڕێزیان ساڵی (١٢٨٩ ک.ه) لە گوندی سیسێری سەردەشت هاتۆتە گۆڕەپانی پڕ لە مەینەتی ژیانی ئەوسای کوردستانەوە. ساڵی (١٣١٤) دەستی کردووە بە فەقێیەتی و لە

دوو بەشە کوردستانی سەر بە ئێران و عەراق لە، مامۆستایانی سەردەمی خۆی کـەڵکی دینی و زانستی وەرگرتوە. بۆنموونە لە سیسێر لە لای مـامۆستا مـەلا سـەید حسـەین، لەرەبەت لە خزمەت مامۆستا مەلا عەبدوڕڕەحمانی سیسێری، لە قوڵتە لەکن مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای محەممەدی سووتوویی، لە بێشاسپ لە لای مامۆستا مەلا عەلی بێشاسپی، لە عەراقیش لە گەناو لە خزمەت مامۆستا مەلا صاڵحی گەناوی و لە ئاخیریش‌دا لە کۆیە لە خزمەت مامۆستا مەلا (محمد نورالدين) دەرسی خوێندوە و هەر لە لای ئەو بەڕێزەش پاش مانەوەی دوازدە ساڵ لە خوێندن‌دا واتا ساڵی (١٣٢٦)ی کۆچی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتوە. لە دەورانی مەلایەتی‌دا لە دێیەکانی هەنداوێ، ڕەبەت، لیلانە و گۆڵێ، مەلایەتی کردووە و لە بواری پێشنوێژی، ڕێنوێنی، تەدریس، ریشسپی‌گەری و...دا خـزمەتی بـە ئایین و گەل کردووە.

خوالێخۆشبوو، مەلایەکی بە نوتق، دڵاوا خۆ بەکەم گر، ڕێزدانەر، بە قنیات و خوو و ڕەوشت جوان بوو تاجێیەک کە مـامۆستای ئـیجازەدەری لە ئـیجازەنامەکـەی‌دا بـە (ابوالمکارم)ی ناوبردووە.

مامۆستا دوو ژنی هێناوە و دوو کوڕ و حەوت کچی بە نەسیب بووە. کوڕەکانی بەناوی عەبدوڕڕەحمان و عەبدولکەریم بوون بە مەلا و ئێسـتە خەریکی خزمەتی ئایینن.

مامۆستا کە لە ماوەی ژیانی‌دا هەر بە هەژاری و نەداری ڕایبوارد، سـەرەنجام لە تەمەنی (٧٨) ساڵی‌دا واتا ساڵی (١٣٦٧)گیانی بەرزی، بەرگی جەستەی لەبەر خۆ داڕنی و بەرەو دنیای گیانان کەوتە ڕێ و لە گۆڕستانی گۆڵێ بە خاک ئەسپێردرا.[1]

(خوا لێی ببووری!)

---

١ - سەرچاوە: مەلا عەبدولکەریمی کوڕی و بۆ خۆشم زۆری بـە خـزمەت گـەیشتووم و کـەڵکی زانسـتی و پەروەردەییم لێ وەرگرتووە و لە ڕێ و ڕەسمی ناشتینشی‌دا بەشدار بووم.



## مامۆستا مەلا حوسەین هەنداوەیی ناسراو بە: «مەلا حوسەین»ی نوربەخش

کوڕی مەلا «عەبدوڕڕەحمان»ی شەمۆڵەیی ناسراو بە: مەولانای شەمۆڵێ، کوڕی خەڵیفە مەلا حەسەن، کوڕی مەلا عەبدوڵلا، کوڕی مەلا سەعدی، کوڕی مەلا «موسی»ی دووهەم، کوڕی مەلا «موسی»ی یەکەم، کوڕی مەلا «ئیبراهیم»ی قازی، کوڕی مەلا جامی، کوڕی شێخ عەبدولکەریم، کوڕی شێخ ئەحمەد، کوڕی شێخ مەلا مەحموود (شێخ مەولانا)ی شەمۆڵێ، کوڕی نوربەخش، کوڕی «مەولانا محەممەد»ە.

مامۆستا سەعاتی (۸)ی شەوی یەکشەممۆ، (۹)ی مانگی سەفەری ساڵی (۱۳۳۳)ی کۆچی مانگی، لە دێی «شەمۆڵە»ی سەر بە شارستانی سەردەشت، هاتۆتە گۆڕەپانی ژیانەوە. لە تەمەنی (۱۰) ساڵی دا، لە دێی شەمۆڵە، لە لای باوکی دەستی کردووە بە خوێندن. پاییزی ساڵی (۱۳۴۷)ی کۆچی مانگی دەگەڵ ئامۆزایەکی بەناوی «عەبدولکەریم» کە ئەویش فەقێ دەبێ بە فەرمانی مامۆستا مەلا رەحمانی باوکی دەچنە دێی «سەرا»ی بۆکان ماڵی، مامەگەورەیان خوالێخۆشبوو «مەلا محەممەد». ئەویش بەرێیان دەکات بۆ حوجرەی مزگەوتی شێخ حەسەنی مەولاناوایی سەقز و لە لا موستەعیدێک بەناوی مەلا «صالح»ی سەرتەکەڵتوویی دادەمەزرێن. سەرەتای زستانی ئەو ساڵە دەگەڵ موستەعیدێک دەچنە گوندی «خوردەلووک».

ناوبراو دەڵێت: مەلا عەبدولکەریم هەموو رۆژانی هەینی، بە دەستووری موستەعیدەکان، دەبوویا، لەو دێیەڕا کە رێگای دوو سەعاتی پیادە لە سەقزەوە دوورە، چوویا سەقز، بۆ وەرگرتنی (دوو) قران جومعانە کە حاجییەک بۆی تاعین کردبوین!

لەبەر ئەوە ناخۆشیان لێ‌دەگوزەرێ لە بەهاردا دەگەڕێنەوە بۆ مزگەوتی ناوبراو لە سەقز و پاش ئەوە کە هەوا خۆش دەبێ، سەرێکی ماڵی مامیان دەدەن لە سەرا و دوا

ماوەیەک دەگەڵ کاروانی «بانە» دەگەڕێنەوە بۆ شەمۆڵە.

لەماڵێ‌را دەچن بۆ «سووتوو» (١٣٤٨) دوایە شاری بانە، لە پاییزدا دەگەڵ ماموستاکەیان بە مەبەستی جێ پەیدا کردن بەرەو کوردستانی عەراق دەکەونە رێ، تا لە گوندی «دەلوجە»ی ناوچەی قەرەداغ دادەمەزرێن. بۆ بەهار دێنەوە ناوەندی، قەرەداغ و تا پاییزی ئەو ساڵە (١٣٤٩) بەسەر دەبەن و ئەمجار دەگەڕێنەوە بەرەو ئێران و لە موستەعیدەکەیان هەڵدەبڕێن و دەچنەوە شەمۆڵە و مانگی رەمەزان لە ماڵێ دەبن و ئینجا دەچنە سیسێر، لای قازی عەلی کە هەرچەند ئەودەم «جامی»یان خوێندرە بەلام قازی بە هۆی دۆستایەتی دەگەڵ باوکی ماموستا، بۆ خۆی دەرسیان پێ دەڵێ و لە هەمان کاتدا ئەرکی سوختایەتیش بەرێوە هەر دەبەن.

لە بەهاری ئەو ساڵە (١٣٥٠)دا دەگوێزنەوە بۆ گوندی قالوێ رەسوڵاغای لە ناوچەی سابلاغ و دەست دەکەن بە خوێندنی «السیوطی». ساڵی (٥٢)ی مانگی، دەڕۆن بۆ دێی (بێور)ی سەرێ خزمەت کاکە مەلای موفتی و پاش مانەوەی ساڵێک لێک جیا دەبنەوە و ماموستا خۆی تەنیا دەچێتە (هێرۆ) لە عەراق و دوا ساڵێک لێک دابڕان، سەر لە نوێ لە بێوری ناوبراو یەکتر دەگرنەوە و تا ساڵی (١٣٥٦)ی کۆچی مانگی لە خزمەت ماموستا (کاکە مەلا) دادەمێننەوە و ئەمجار لە رێگای بیژوەوە، دەچنە سولەیمانی و بە هەرجۆر بێ مەلا عەبدولکەریم لە مزگەوتی شێخ مەعروف برای شێخ عومەری ئیبنولقەرەداغی جێ‌گیر دەبێ و ماموستاش کە جێی نابێت بۆ جارێکی دیش لە مەلاعەبدوالکەریم هەڵدەبڕێ و دوا ماوەیەک حەولدان لە ئاخردا دەگەڵ شێخ محەممەد ناوێک، خەڵکی «وان»ی تورکیە ئاشنایەتی پەیدا دەکات و شێخ نامەیەکی بۆ دەنووسێ بۆ خزمەت‌مەلا عەبدوڵلای بێژوەیی مەلای مزگەوتی جامیع لە سولەیمانی و بەلام بەداخەوە واش هەر جێگای پێ نادرێت و لە ئاخردا شێخ محەممەدی وانی بۆ خۆی تەعارفی دەگەڵ دەکا و دەڵێت: لە شاری «قزل رباط» وتاربێژم، دایرەی ئەوقاف بەڵێنی پێ‌داوم بۆ ئەنجامی کار و بار سوختەیەکم بۆ رابگرن و خەرجی بدەنێ؛ جا ئێستا لە باتی سوختە تۆ وەرە بۆ ئەوێ و مانگانەش (٨) (روپیە)ت بۆ وەردەگرم و دەرسیشت پێ‌دەڵێم. ماموستا دەڵێ: لە سەر ئەو قەرارە دەگەڵی چووم بەلام شێخ لە رێگایە کرێی

شەمەندەفەری بۆ نەدام و زانیم پیاوێکی دلاوا نییە.

ئەو بەڕێزە چەند مانگێکان لە کن شێخ دەمێنێتەوە و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و بەلام بە سەر نەخۆشی مەلا عەبدولکەریمدا دێتەوە.

ئەو کات هەوەڵی زستان دەبێ، پێکەوە هەڵدەستن بە دوای جێیەکدا دەگەڕێن کە هەردووکیان لێی دامەزرێن و ئاگایان لە یەکتر بێ. بەلام دوای تەقالایەکی زۆر بە ئاوات هەر ناگەن و دووبارە لێک هەڵدەبڕێنەوە و مەلا عەبدولکەریم لە مزگەوتێکی تازە ساز کراوی پێنجوێن جێ گیر دەبێ و مامۆستاش بە نامەیەکی مامۆستای ئەوێوە بەرەوگوندی (کیلو) دەکەوێتە رێ و لەوێ دادەمەزرێ و دەست دەکا بە دەرس خوێندن.

لە ماوەی مانەوەی لە (کیلو) جارێکیان دەچێتە دیدەنی ئامۆزاکەی و تەماشا دەکا زۆر نەخۆشە و لە پەنا سۆبەی مزگەوت بێ دوکتور و بێ کەس لێی کەوتوە و فەقێیەکانیش چیغێکیان لە گۆشەیەکی مزگەوت گرتۆتەوە و کردوویانە بە حوجرە.

ماوەیەک ئاوا تێپەڕ دەبێ و سەرەنجام بەداخەوە رۆژێک پەیکی هەڵگری هەواڵی جوانەمەرگ بوونی مەلا عەبدولکەریم دەگاتە (کیلو) و مامۆستا هەرچۆنێک بێ خۆی دەگەیەنێتە رێ و رەسمی بە خاک سپاردنی و ماوەی سێ رۆژان تا کۆڕی ماتەمین کۆتایی پێ دێ لەوێ دەبێ و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ (کیلو) و پاش ماوەیەک مانەوە لەوێ دەڕوا و دەچێتە گوندی (نزارە)، بە هاتنی بەهار و خۆش بوونی رێگا و بان دەچێتەوە بۆ شەمۆڵە و هەواڵی مەرگی مەلا کەریمی ئامۆزای دەگەڵ خۆی دەباتەوە!

دوا تەواوبوونی دیدەنی و سەرەخۆشی سەر لە نوێ دەچێتەوە نزارە و تا پاییز لەوێ درێژە بە خوێندن دەدا و ئەمجار یەکجاری دەگەڕێتەوە بۆ ئێران و دوا سەردانی شەمۆڵە دەچێتە (سەرا)ی بۆکان و لە خزمەت مامۆستا مەلا «عصام الدین» شەفیعی، جێ دەخوازێتەوە و کتێبەکانی: (جمع الجوامع، تشریح الافلاک، مقولات عشره) و بەشێک لە (تهذیب الکلام) لە لای ئەو بەڕێزە دەخوێنێت.

لە ماوەی مانەوەیدا لە سەرا، ئافرەتێک لە گوندی (دەرزی وەلی) دەدۆزێتەوە و دەیخوازێت و پاش ماوەیەک، دەیگوێزێتەوە. دوایە خوێندن لە سەرا تەواو دەکات و لە سەروحەدی ئیجازە وەرگرتندا واتە بەهاری ساڵی (١٣٢٠) هەواڵی مەرگی باوکی

پێدەگات و بەرەو ماڵ دەبێتەوە. پاش تەواو بوونی پرسە و سەرەخۆشی دەچێتەوە سەرا و ئیجازە وەردەگرێ و بەلاَم لەبەر ئەوە ئەوکات رووس و ئینگلیس لە ئێراندا بوون و بشێوی هەبووە، بە بێ پێکهێنانی کۆڕ و ڕێ و ڕەسم ئیجازەنامەکە وەردەگرێ و دەگەڕێتەوە بۆ شەمولێ.

ماموّستا، سەرەتا دەست دەکا بەکاروان وکڕین و فرۆشتن و ئەمجار روو دەکاتەوە تەدریس و مەلایەتی و بەلاَم، بێ چاوەڕوانی، لە یارمەتی خەڵک.

بەهاری ساڵی (١٣٢٩)ی هەتاوی کە گرانی دێتە پێشەوە، ماموّستا ناچار دەبێ وێڕای خەڵک بە دوای بژیودا بگەڕێ و بۆیە، بە ناچاری دەڕواتە خوار بەرەو کۆیە و لە لای (تاڵەبان)، باریگایەک و گوێدێژێک گەنم دەکرێ و دەیهێنێتەوە بۆ شەموڵە.

ناوبراو لەبەر ئەوە ناتوانێ بە بێ مووچە و بەرات ژیانی بچەرخێنێ، بەهاری ساڵی (٢٩) بار دەکا بۆ قالوێ بۆ مەلایەتی. بەلاَم چی پێ ناچێ کە حاجی مەولانی (سووتوو) کە خاوەندەسەلاَتی ئاوەدانی دەبێ، بە دوایدا دەنێرێ و ماڵەکەی دێنێتەوە بۆ (سووتوو) و دەبێتە مەلای ئەوێ و تا بەهار لەوێ دەبێ. (ماموّستا، نووسیویەتی: ئەو ساڵە لە جیاتی قەند چاییمان بە گەزۆ، دەخواردەوە!)

بەهاری ساڵی (١٣٣٠) کۆچی هەتاوی لە سەر داوای ئاغاکانی (هەنداوێ) بار دەکا بۆ ئەوێ و مل لە مەلایەتی وێڕای تەدریس دەنێ و ماوەی (٤١) ساڵ لەو دێیە مایەوە و دەگەڵ هەموو گیر وگرفت و کوێرەوەریەک هەڵی کرد تا ئەوەی لە ڕێکەوتی ١٩ی ٧ی ساڵی (١٣٧٠)ی کۆچی هەتاویدا ماڵی چۆ سابلاغ و لە مزگەوتی (ڕۆستەم بەگ) دامەزرا و ئێستاش کە ساڵی (١٣٨٠)یە هەر لەوێیەو لەو ماوەیەشدا کەمکەمە، تەدریسی هەر بووە.(١)

خوای گەورە راوەستاوی کات لە سەر خێر و خۆشی!

---

١ ـ سەرچاوە: ژیاننامەی ماموّستا و باب و باپیرانی بە قەڵەمی خۆی کە، بە فارسی و لە (٦٠) لاپەڕدا نووسیویەتی بەلاَم هێشتا هەر دەستنووسە و چاپ نەکراوە.



**مامۆستا مەلا «حوسەین» کەیوان ناسراو بە «مەلا حوسەین کونەمشکەیی»**

ناوبراو سالّی (١٢٩٤)ی کۆچی هەتاوی لە دێی (کونەمشکە)ی سەردەشت پێی ناوەتە دنیاوە. تەمەنی نیزیکەی (١٩) سالّ بووە کە دەستی داوەتە خوێندنی زانستە دینی یەکان. لە شارەکانی سەردەشت، سابلاغ، بانە و هەروەها لە دێیەکانی وەک: باساوە، وەلّیو، لە سەردەشت و شوێیە لە بانە و لە چەند جێگەی کوردستانی عەراقیش دەرسی خوێندووە. هەندێک لە مامۆستاکانی بریتین لە: مامۆستا مەلا عەبدورڕەحمانی سیسێری، مامۆستا مەلا مصطفی ی شوێیە، مامۆستا مەلا شێخ ئەحمەد باساوەیی، مامۆستا مەلا محەممەد باساوەیی، قاضی عەلی سەردەشت. کۆتایی خوێندنیشی لە هەولێری عەراق بووە لە خزمەت مامۆستا مەلا ئەبوبەکر ناوێک و هەر لە خزمەت ئەو مامۆستایەش پاش

نیزیکەی (١٢) ساڵ گەڕان بە دوا خوێندندا ئیجازەی وەرگرتووە و لە دێیەکانی کونەمشکە، کۆڕبنا و بێوری خوارێ، دەورانی خزمەتی تەدریس و مەلایەتی بەسەر بردووە.

مامۆستا کە پیاوێکی بەدین، خۆ بە کەم گر، لە سەرەخۆ و خۆراگر بوو لە تەمەنی (٧٤) ساڵیدا لە گوندی بێوری خوارێی سەردەشت گیانی بەرەو دنیای هەرمان بەڕێ کرد و لە گۆرستانی قەمتەرێی کونەمشکێ بە خاک ئەسپێردرا.[١]

خوا بیبووری!

١-سەرچاوە: کوری مامۆستا، جەنابی مەلا عەبدوڵڵای کەیوان مەلای ئاوایی بێوری خوارێ.



## مامۆستا مەلا خدر نێژاوی ناسراو بە «مەلا خدری حەمەدەمەری»

ئەو مامۆستایە ساڵی (١٣٠٨ ک. ه) لە دێی نێژاوێی سەردەشت، لەدایک بووە. ساڵی (١٣٢٠) هاتۆتە نەڵاس و لە ماڵی خزمێکی‌ڕا هاموشۆی حوجرەی کردووە و بوەتە فەقێ. لە ماوەی خوێندنەکەی‌دا رێی کەوتۆتە سابلاغ لای مامۆستا مەلا حوسەینی مەجدی و لە ئاخریش‌دا لە لای مامۆستا مەلا صالح نەجیبی لە گەناوی عەراق کۆتایی بە خوێندن هێناوە و ئیجازەی مەلایەتی پێدراوە. دەورانی مەلایەتیشی لە گوندەکانی ئاغەلان، نەڵاس، هەڵوی، سەپێکان، خولیسان، شاتمان و... بەسەر بردووە. لە سی دێی هەوەڵی تەدریسی بووە و پاشان بە هۆی دووچاربوون بە سەر ئێشە دەستی لە تەدریس کێشاوەتە وە. مامۆستا مەلا خدر پیاوێکی بە قنیات، قسەخۆش و نوکتەباز بوو و تەبعی

شێعریشی هەبوو. دەڵێن جارێک لە کۆتایی بەستە شێعرێکی‌دا بە شۆخی تاریفی شاعیری خۆی دەکا و دەڵێ:

«نـــــــیژاوی بــــــێ بــــــەلا بـــێ

شـــــــێعر دەبــــــــێ ئـــــاوا بـــێ»

ناوبراو سەرەنجام یەک دوو ساڵ پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران بە دوای نەخۆشیەکی درێژ خایەندا بای ئەجەلی گەیە سەرێ و ماڵی کاتی پێ بەجێ‌هێشت و بەرەو دنیای هەرمان کەوتە رێ و لە نێو داخ و کەسەرێکی زۆردا لە گۆڕستانی دێی کاژی لە سەرووی گۆڕی مەلا رەسووڵی زەکی نێژرا.[1] خوا لێی خۆش بێت!

---

١ ـ سەرچاوە: حاجی مامۆستا مەلا مەحموود داوی مەلای گوندی نەلاس و خۆیشم لە ئاخر و ئۆخرەکانی ژیانی‌دا بە خزمەتی گەیشتووم.



## مامۆستا مەلا خدر عەبباسی ناسراو بە «مەلا خدری سارتکێ»

مامۆستا مەلا خدر سارتکەیی یان سیسێری لە رێکەوتی خەزەڵوەری ساڵی (۱۳۱۳ک.ھ)دا لەگوندی سیسێر چاوی بە دنیا هەڵێناوە. لە تەمەنی (۵) ساڵیدا نێرراوەتە مزگەوت و هەر لە سیپارارا تا دوو بەش لە سێ بەشی (تصریف ملاعلی) لە لای «فەقێ ئەحمەد ناوێکی خەڵکی ئەوێ کە دوایە بە مەلا ئەحمەدی گەنمانی ناسرا، خوێند و پاشان دەگەڵ مامۆستا مەلا برایم سیسێری دەچێتە گەلاڵەی عێراق و یەکجاری مل لە

خوێندن دەنێ. دوا ئیجازە وەرگرتنی مامۆستا مەلا برایم و دامەزرانی لە نستان، مامۆستا هەر لە لای دەمێنێتەوە و دەبێتە موستەعید.ساڵی دواتر (١٣٢٨) جێ گۆڕ کە دەکا و دەچێتە نەلاس لای مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای واوی و بە کورتی خوێندنەکەی بە شێوەی خوارەوە درێژە پێدەدات: لە نەلاس رادەچێتەوە سیسێر، لای مامۆستا مەلا برایم کە ئەودەم چوٚتەوە وێ. لە گوندی «نورالدین»ی عەراق مامۆستا مەلا حسەین دەشتێوی، لە گەنا و لای مامۆستا مەلا صالح بێژوەیی، (بۆ ماوەی کەمتر لە «٦» مانگ «مطول»ی لەوێ تەواو کردووە) بەهاری (١٣٣١) دیسان سیسێر و لای مامۆستا مەلا برایم. پاییزەکەی گۆندی سوغانلوو لای مامۆستا مەلا رەحمانی سیسێری، بەهاری ساڵی دوایە گوندی بێکۆس، دوایە گوندی دۆڵە توێی گەورکان و پاشان قەلەرەشێ کە لەو دوو دێیانەدا هەر لە خزمەت مامۆستا مەلا رەحمانی ناوبراو دابووە. ئەمجار رەبەت لای مامۆستا مەلا سەید سەلام، دووبارە گەلاڵەی عەراق و خزمەت حاجی مامۆستا مەلا محەممەدی بۆکانی کە هەر لەوێش دوای خوێندنی کتێبگەلێکی وەک: (تشریح الافلاک، اشکال التأسیس، رسالة الحساب، تهذیب الکلام) و چەند بەرگێکی (تحفه)، پاییزی ساڵی (١٣٣٥) ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێ و بە دەستی پڕەوە دەگەڕێتەوە بۆ سیسێر و لە گوندی سارتکێ بە مەلایەتی دادەمەزرێ و لەبەر بێ کابانی دەگەڵ فەقێیەکانی لە دیوێک‌دا ژیان دەباتە سەر تا بەهاری (٣٦) کە ژن دێنێ و دەبێتە خاوەن ماڵ و حاڵ.

ئەو بەرێزە پاش (٣) ساڵ تەدریس دەگاتە ئاخیر ماددان و پلەی ئیجازەدان و لە ماوەی مەلایەتیشی‌دا هەر لە دێی سارتکێ مایەوە و دەیان فەقێی ناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستانی پێ گەیاند و تێ گەیاند و ئیجازەی پێدان.

**پەردەیەکی دیکەی ژیانی مامۆستاکە بۆ خۆی دەڵێ:**

«لە (١١) ساڵ هەڵنەبورد بووم، یەکەم جار گوێی منداڵیم بە باسی دامەزرانی کۆماری کورد لە مەهاباد زرینگایەوە... هەستی ئازادی و سەربەستی وەک دیاردەیەکی پیرۆز و ئامانجێکی سەرەکی ژیان، لە مێشکم‌داگەرای دانا... بەرەبەرە هەڵم‌دەدا و هەوڵم دەدا، ئەو بیرە بلاو بکەمەوە... هەستی نەتەوایەتیم دەگەڵ سۆزی ئیسلامەتی ئاوێتە کرد... و هەموو ماوەی فەقێیەتی و مەلایەتیم لە ئەنجام‌دانی ئەو ئەرکە ئایینی و نەتەوەییە لە ناو توێژی رووناکبیر و هاوالان و جەماوەردا بە پێی دەرفەت بێ‌قسوور بووم».

«ئێوارەی (١٠)ی خەزەڵوەری ساڵی (١٣٣٨)ی ک. هـ لە نەکاوێک گیرام و بەرەو سەردەشت و مەهاباد و دوایە تەورێز بەڕێ کرام. دوای مانگێک ئەشکەنجە دیتن، دەگەڵ نیزیکەی (١٥٠) کەسی دیکە لە بەندیخانەی (قزل قلعه)ی تارانیان توند کردین... (١٠) ساڵم زیندان بۆ بڕایەوە. پاش سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلوولی کوردستانی عێراق و پێک‌هاتنی ئاڵ و گۆڕ لە ناوچەدا، هەل‌رەخسا و خاکەلێوی (١٣٤١) ئازاد کرام و سەر لە نوێ دەستم کردەوە بە مەلایەتی و کاری سیاسیشم هەر دەکرد بەلام بە نهێنی.

کاتێک رژێم هاوینی ساڵی (٤٧) بە شوێن جولانەوەی ئەو ساڵە و ساڵی پێشتردا پەلاماری گرتنی هێنا، منیش بانگ کرامە پایەگا و بەلام ئەو رۆژە لەبەر مەیلە و درەنگی و ناسازی ماشێن بەڕێ‌نەکرام و خستیانەوە بەیانی... شەوێ دەرفەتم هێنا و هەلاتم... دەگەڵ دوو مەلای رەفیق و هاودەردم خۆمان گەیاندە سنووری دەسەلاتی شۆڕش لە کوردستانی عەراق و لە دێی (بۆسکێن) بووم بە مەلا و پۆلێک مەلا و فەقێی هاودەردم لە دەور کۆبوونەوە و کۆڕی دەرس و موتالامان سەر لە نوێ گەرم داهێنا، بە ئاوێتەی سیاسەتەوە... نێوەڕاستی زستانی ئەو ساڵە زەمینەی گەڕانەوە لە بار بوو و گەڕاینەوە و هەر لە سارتکێ درێژەم‌دا بە مەلایەتی و دژایەتی رژێمیشم بەتینتر بوو بەلام وەستایانە.

«دەگەڵ دەرکەوتنی سەرەتای راپەڕینی پڕ شکۆی ساڵی (١٣٥٧) لە دژی رژێمی تاغووتی ئەو هەلەم قۆستەوە و هەموو توانای خۆم بۆ رێکخستن و هاندانی دۆستان و هاوالان و جەماوەری ناوچەی سەردەشت وەکار خست و شانازی بەشداری چالاکانەم

لەو راپەڕینەدا بەرکەوت»

لەمەڕ ژیانی (ئەدەبی) مامۆستاوە دەتوانین بڵێین ئەگەرچی مامۆستا خۆی بە شاعیر نەدەناساند، بەڵام دەستێکی باڵای لە شێعردا هەبوو و بە زۆری بە زمانی کوردی و کەمکەمەش بە زمانی فارسی شیعری نیشتمانی و نەتەوەیی و بڕێکیش شێعری غەرامی وتووە. ئەمما داخیگرانم شێعرەکانی ئەوەندی من بزانم تا ئێستا کۆ نەکراونەوە و بەشێکی زۆریشیان لێرە و لەوێ ونبوون و تەنانەت پاییزی (١٣٣٨) ئەوەندە شێعری هەیبوو لە لایەن ساواکەوە گیراون و شوێنە ونکراون.

ئینجا ئەو مامۆستا بلیمەتە قەڵەمێکی وریای هەبوو و ئەگەرچی لەبەرکوێرە وەری و گرفتاری زۆر، دەرفەتی نووسینی نەبوو واش ئەوەندی بۆی لوابا رانەدەوەستا. لە نووسینەکانی مامۆستا دەتوانین بەو نوسراوانە ئاماژە بکەین:

١ـ درسهایی از اسلام.
٢ـ خداشناسی بر اساس فلسفه.
٣ـ کۆمۆنیزم و رەوتی مێژوو.
٤ـ راپەڕین.
٥ـ وەحدەت. ٦ـ و...

ئەو مامۆستا هێژا و وشیارە کە زانایەکی فرەزان، دەرسبێژێکی کەم وێنە، وتاردە رێکی رەوان بێژ، مەلایەکی مەجلیس خۆش، پیاوێکی بەغیرەت و بەعیززەت بوو دوا پێکهاتنی هەلومەرجی نالەباری کوردستان بە دوای ئاوات و مەبەستی خۆیدا پەریوەی ئەندەران بوو و سەرەنجام لە رێکەوتی ١٣ی ٨ی (١٣٧٦)ی هەتاوی لە وڵاتی نروێژ بە هۆی نەخۆشی شێر پەنجە کۆچی دوایی کرد و گیانی دا دەستی فریشتەکان و لە گۆرستانی (گاملە بیەین)ی شاری ئوسلۆی پێتەختی نروێژ کە تایبەتی مسوڵمانانە، نێژرا.[1] خوا عەفوی کا و جێی بەهەشت بێ!

---

١ ـ سەرچاوە: ئەو باسانەم لە ژیاننامەی مامۆستا وەرگرتووە کە بە قەڵەمی خۆی نوسراوە و بۆ خۆشم چەند مانگێک لەساڵی (٥٧) لە خزمەتیدا بووم و هەروەها ماوەیێکیش بە سوختەیی لە حوجرەی مامۆستا بووم. لێرەدا بە پێویستی دەزانم سپاسی تایبەتی کاک حەسەنی رۆستەمی بکەم کە یارمەتی دام.




## مامۆستا مەلا خەلیل گۆڕەمەری ناسراو بە «مەلا خەلیل»ی میراوێ

کەسایەتی گەورەی ئەم باسەمان ناوی «خەلیل» کوڕی مەلا عەبدوڵلا، کوڕی حاجی مەلا رەسووڵ، کوڕی مەلا ئەحمەدی چەکۆیی یە. مەلا عەبدوڵلای باوکی، مەلایەکی باش بووە و لە گوڕەمەر کە ئەوکات (١٧) ماڵ بووە مەلایەتی و تەدریسی کردووە و جاری وا هەبووە بەو (١٧) ماڵە (٢٤) نەفەر، فەقێیان بەخێو کردووە. ئەو مامۆستایە عەلاقەیەکی زۆری بە شێخی بوڕهانەوە هەبووە و تەنانەت لە سەفەرێکدا کە دەچێتە ئەوێ دەمرێت و هەر لەوێش دەنێژرێت.

حاجی مەلا رەسووڵی باپیری مەلا «خەلیل»یش لە سەفەری حەجدا مردووە و

گۆڕەکەی لە مەککەی پیرۆزە و مەلا ئەحمەدی بابی باپیریشی لەگۆڕەمەڕ مردووە و هەر لەویش بەخاک سپێردراوە.

مەلا خەلیل لە دەورانی منداڵیدا دەستی کردووە بە خوێندن و لە سەرەتای خوێندندا هەتا کتێبی حاشیەی «عبدالله یزدی» هەر لە لای بابی دەرسی خوێندوە و پاشان بە شار و دێیەکانی کوردستاندا گەڕاوە و تەنانەت ڕێی دە «کۆ» و «کەرکووک» و «هەولێر»ان کەوتووە و شاگردیی مەلا گچکەی هەولێریی کردووە. لە سابلاغێ، لە حوجرەی مزگەوتی «ڕۆستەم بەگ» لە خزمەت مەلا «وەسیم»ی سەردەشتی بووە و کۆتایی خوێندنیشی بردۆتەوە خزمەت شێخی بورهان و هەر لە لای ئەو بەڕێزەش پاش (١٤) ساڵ سووڕانەوە بە دوای خوێندندا ئیجازەی وەرگرتووە.

مامۆستا پاش ئیجازە وەرگرتن گەڕاوەتەوە بۆ گۆڕەمەڕ و لە جێی بابی دانیشتووە. وەک دەڵێن ئەوکات میراوێ ئاوەدان نەبووە و خەڵکی لەگۆڕەمەڕڕا بووکار و باری کشت و کاڵ هاموشۆیان کردۆتی و پاش ماوەیەک خانو و بەرەیان لێ ساز کردوون و ماڵیان هێناونێ و مەلا «خەلیل»یش گوازتویتیەوە بۆ ئەوێ و لەوێ درێژەی بە تەدریس و مەلایەتی داوە.

ئەو بەڕێزە کە زۆر بە زەین و باش مەلا بووە و بە یەکێک لە چوار شەرع زانەکان «الفقهاء الاربعة» لە قەڵەم دراوە[1] لە دەورانی مەلایەتیدا فەقێی زۆری پێ گەیاندون و ئیجازەی داون بۆ نموونە: مەلا «ڕەسووڵ»ی کە ڕەمداری، مەلا «سەید حەسەن»ی پارسایی، مەلا «حەسەن»ی مودەرریسی موتڵەق، مەلا «ڕەسووڵ»ی مەعرووفی زێوەیی و مەلا «عبدالله»ی باغ شیرین و...

---

١ ـ سێ شەرعزانە ناودارەکانی تر بریتین لە: شێخ محەممەدی خانەقا، مەلا «عەزیز»ی موفتی سەقزی و مەلا «سەعید»ی سێلەکەیی موکوریانی.

**مەلا خەلیل و هەرا بە دژی رەزا پەهلەوی**

هەرای مەلا خەلیل وەکوو لە تۆش خوێنەری بەرێزا شاراوە نییە سالی (۱۳۰۷)ی کۆچی هەتاوی هاتە پێشەوە و بە دژی فەرمانە دژ بە دین و گەلی یەکەی رەزا شا بوو کە بە پێی ئەو دەبوو تەواوی خەلکی ئێران، بەتایبەت کەمایەسی یە نەتەوەیی یەکان بەرگی ئوروپایی وەک کۆت و شالوار و شەپکە بێ بکەنە بەر و فەرهەنگی خۆیان وەلا بنێن.(۱)

ئەو راپەڕین و راسانەی مەلا خەلیل و بەرەکەی لەبەر ئەوە کە شەڕێکی نا بەرابەر بووە پاش چەند مانگێکان، تووشی شکان هاتووە و مامۆستاش وەک خۆ پەنادانێک چۆتە کوردستانی عەراق و لە گوندی «باقلان»ێ گیرساوەتەوە و بوەتە میوانی مەلای ئاوەدانی کە ناوی مەلا «محەممەد» بوەو ماوەیەک لەوێ ماوەتەوە. تا بە هۆی شێخ محەممەدی بورهان و چەند کەسی دیکە لە دمراستانی ئەوکات کارەکەی بۆ چاک کراوە و گەڕاوەتەوە میراوە!

ناوبراو لەبەر ئەوە کە خاوەن ملک بووە، مووچە و بەراتی لە کەس وەرنەگرتووە و هەر لە میراوەش ماوەتەوە. تا ئەوەی تووشی نەخۆشیەکی درێژخایەن دێت کە چوار سال درێژەی دەبێ و سەرەنجام سالی (۱۳۳۴) فەوت دەکا و لە گۆڕەمەر، کۆنە دێی باب و باپیرانی دەینێژن.(۲)

لە شوێنەوارەکانی مامۆستا دەتوانین بە تۆمار سەعاتەکەی ئاماژە بکەین کە بە پیتەکانی «أبجد، هوز، حطي، كلمن» تەواوی کردووە و بە ئاسۆی شاری سەردەشت و دەوروبەرە. هەروەها دەلێن شەرحێکی زۆر بە کەلکی هەیە لە سەر (ربعین) کە لە زانستی «هەیئەت» دایە.

خوا لێی خۆش بێت!

---

۱ ـ داخی دا خانم ئەورۆ دنەبینین، بێ ئەوەی هیچ دەولەتێک دەستوور بدات یان لایەنێک پڕ و پاگەندەی بۆ بکات زۆر بە ئاسانی بازێک لە گەنجەکان بەتایبەت لە شارەکان بەرگ و لیباسی کوردییان وەلا ناوە و کەوتوونە لاساکردنەوەی رۆژئاوا و هەر رۆژە مۆدێک دەردێنن و رەنگێک دەنوێنن کە ئەرکی سەرشانی هەموو رووناکبیرانە بە پێی توانا بەرگری لەو خۆ دۆراندنە بکەن و ئاکامی زیانباری ئەو خۆ گۆڕینە بۆو جۆرە کەسانە روون بکەنەوە.

۲ ـ سەرچاوە: لێکۆلینەوەی مامۆستا مەلا قادر نێوەژی و کتێبی «قیام ملا خلیل» ابراهیم افخمی. لێرەدا بە ئەرکی سەرشانمی دەزانم سپاسێکی زۆری ماموستا مەلا قادری نێزەیی بکەم کە بە لێکولینەوە لە قەدیمیەکانی میراوە، یارمەتی دام.



## حاجی مامۆستا مەلا شێخ عبدالرئوف نەقشبەندی

کوڕی مەلا محەممەد، کوڕی شێخ محەممەد ئـەمینی بـێژوە، سـاڵی (١٣٥٧)ی کۆچی مانگی لە دێی بێژوەی ئالانی سەردەشت هاتۆتە دنیا. دەگەڵ فامکردنەوەی لە لای باوکی دەستی کردووە بە خوێندن. لە تەمەنی (١٣) ساڵی دا کە باوکی لە دەست دەدات بۆ ماوەی دوو ساڵان لە لای شێخ ئەمینی باپیری (تصریف ملا علی) و (رساله العروض) کە دانراوی خۆیەتی دەخوێنی و پاشان دەچێتە لای مامۆستا مەلا عەلی دولکانی و دوای (٣) ساڵ مانەوە، دەچێتە خزمەت حاجی مامۆستا مەلا محەمەدی بۆکانی لە دێی گەلاڵەی عـەراق و (٥) سـاڵیش لەوێ دەمـێنێتەوە. تـا سـەرەنجام دوای خـوێندنی زانسـتە جۆراوجۆرەکانی سەردەم، ساڵی (١٣٨٠) هەر لە لای ئەو بەڕێزە ئیجازەی مـەلایەتی وەردەگرێ و دەگەڕێتەوە بۆ گوندی بێژوە و مل لە مەلایەتی و دەرسگوتنەوە و خزمەتی دین دەنێ بە بێ چاوەڕوانی لە مووچە و بەراتی خەڵک. پـاش سـەرکەوتنی راپـەڕینی گەلانی ئێران دێتە سەردەشت و دوای ساڵێک بێکاری دەبێتە ئیمام و دەرسبێژی مزگەوتی (محمد رسول الله)، پاش (٣) ساڵ مانەوەی، حاجی مـامۆستا مـەلا عـلی دولکـانی ئیمامی مزگەوتی خانەقای بیارەی سەردەشت کە لەبەر پیری، هێزی مەلایەتی نـامێنی دەگەڵ خەڵک داوای لێدەکەن ببێتە ئیمام و دەرسبێژی ئەوێ کە تا ئێستاش هەر لەوێ ماوەتەوە.

حاجی مامۆستا سەرەڕای باش مەلایی قەڵەمێکی توانای هەیە و تا ئێستا نزیک بە (٤٠) کتێب و نامیلکەی لە بابەتی جۆراوجۆردا، بە زمانەکـانی عـەرەبی و کـوردی و فارسی نووسیوە، لەوانە دەتوانین بە کتێبەکانی (گـنجینەی گـرانـمایە در شـرح کـفایە

بیطوشی) بە فارسی، (باغستانی راستان) بە کوردی و (کتاب الاهـداء الی القـراء) بـە عەرەبی ئاماژە بکەین.

ناوبراو، وەک زەین و بیرێکی بەهێزی هەیە و شتی جۆراوجۆری زۆر لەبەرە و لە بیرە، هەستی شێعریشی هەیە و جار جار بۆ هێورکردنەوەی دەروون و دڵدانەوەی خۆی و بە هۆگەلی ترەوە شێعری گوتوە.(١)

خوای گەورە راوەستاوی کات لە سەر خێران!

---

١ ـ سەرچاوە: ئەو باسانەم لە خۆی وەرگرتووە و ماوەیەکیش شانازی شاگردی مامۆستام بووە.

**مامۆستا مەلا سەید رەشید حوسەینی ناسراو بە «مەلا سەید رەشید»**



خوالێخوشبوو کە کوڕی سەید محەممەدی مەشهور بە (بابی گەورە)یە و لە سەیدەکانی (سەدبار)ی بانەیە. سالّی (١٣٧٠)ی کۆچی هەتاوی لە گوندی شالّگەی ناوچەی گەورکانی سەردەشت هاتۆتە سەر دنیا. سالّی دەستپێکردنی خوێندنی و ناوی ئەو جێگایانەی دەرسی لێ خوێندووە بۆ من زۆر روون نین و بەلاّم سێ کەس لە مامۆستاکانیمان بۆ روون بۆوە کە بریتین لە بەڕێزان: مامۆستا مەلا عەبدوڕڕەحمانی سیسێری، مامۆستا مەلا شێخ ئەحمەد شەریعەتی و قاضی عەلی کە هەرسێکیان خەلّکی سەردەشت و ئەو ناوەن و ئیجازەشی لە دەور و بەری سالّی (١٣٣٣)ی هەتاویدا هەر لە لای قاضی عەلی وەرگرتووە.

مامۆستا سالّێک لە (میر شێخەیدەر) و سالّێک لە (بێور)ی سەرێ و (١٣) سالاّنیش لە (بێور)ی خوارێ لەگوندەکانی سەردەشت مەلایەتی وێڕای تەدریسی بووە و پاشان سالّی (٤٧) دەگەلّ دەیان کەسی تر لە رووناکبیرانی مەلا و غەیرە مەلا دەگیرێ و رەوانەی بەندیخانەی (فەلەکولئەفلاک)ی خورەماباتێ دەکرێت. پاش دوو سالّ زیندان حوکمەکەی دەگۆڕن بە دوور خستنەوە (تبعید) و دەینێرنە شاری (بافت) لە ئوستانی (کرمان) و دوای شەش مانگ مانەوە لە حالّی مەرەخەسیدا رادەکا و تێدەتەقێنێ بەرەو قەلاّدزەی عەراق. چوار سالاّن لەوێ مل دەداتە کار و کاسبی و بە دەستپێکردنی شەڕی بارزانیەکان دەگەلّ حکومەتی عەراق، جێگەی کاسبی دەگوێزێتەوە بۆ (دەشتێو) و پاش ماوەیەک لە رێکەوتی یەکشەممۆ (١)ی (٣)ی (١٩٧٥)ی زایینی سەعاتی حەوت و پازدە دەقیقەی سەر لە بەیانی، لە حەوزی مزگەوت بە دەستی تاوانبارێک ناجوانمێرانە رەشەکووژ (ترۆر) دەکرێ شەهید دەبێ و هەر لەوێش دەنێژرێ. (خوای گەورە لە بەهەشتی خۆیدا جێگەی بکاتەوە!)[1]

---

١ ـ سەرچاوە: کوڕی مامۆستا، کاک سەید «محمد»ی حوسەینی کە ئێستا لە شاری سەردەشتە.

## حاجی مامۆستا مەلا ڕەسووڵی مەعروفی زنیوە



ئەو بەڕێزە ساڵی (١٢٩٤)ی کۆچی هەتاوی واتا ساڵێک پاش گرانی چاوی بە دنیا هەڵێناوە. پێش چوونی بۆ فەقێیەتی، لە لای عەلیاغای باوکی کە میرزا بووە سەوادی نووسین و خوێندنەوەی پەیدا کردووە. ساڵی (١٣٠٩) کە مەدرەسەی ڕەسمی بۆ یەکەمجار لە سەردەشت دانراوە لە لای میرزا ئەحمەدی فتووحی موعەللیمی ئەو مەدرەسەیە دەستی کردووە بە خوێندن. ساڵی (١٣١٣) کە باوکی ویستوویەتی بینێرێتە سنە بۆ مەدرەسەی دەوڵەتی، بەقسەی ناکا و مل پێوەدەنێ بۆ عەراق بۆ فەقێیەتی. ناوبراو سەرەتای خوێندنی لە مزگەوتی «کانیەچاوان»ی مەرگە دەست پێدەکا و پاش ساڵێک دەچێتە خۆشناوەتی و لە دێیەکانی (وەرێ، زێوە و هەرتەل) درێژە بە خوێندن دەدات. ئەمجار دەچێتە شەقلاوێ و لە لای موستەعیدێک بەناوی مەلا صاڵحی ئەختەتەری بۆکانی جێ‌دەخوازێتەوە.

ریز و چۆنیەتی خوێندنی ئەو مامۆستایە تاکۆتایی خوێندنی بە کورتی بە شێوەی خوارەوەیە: پاش شەقلاوێ ڕەواندز ئەمجار دووبارە هەرتەل، دوایە گردمەیتەر و پاشان لە کاتی خوێندنی کتێبی «الاظهار»دا دێتەوە زێوە و باوکی ژنی بۆ دێنێ و پاش مانەوە و دەرس‌خوێندن بۆ ماوەی مانگێک لە زێوە دەچێتە ئەحمەدبریو، لای مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا بە موستەعیدایەتی و تا پاییز دەمێنێتەوە. ئەوجار لەوێش دەڕوا و چەند جێ لە ناوچەی سەردەشت و بانە ڕاوەدەکا و جێی نابێ تا دەچێتە پێنجوێنی عەراق و لە لای مەلا عێزەت ناوێکی مەریوانی بە سوختایەتی دادەمەرزێت و ئەو زستانە لە «پێنجوێن» و «کێلە» و «مەسۆ» تا بەهار ڕادەبوێرێ، پاشان دەچێتە گوندی (وێنە)ی حەمە ڕەشید خانی بانەیی و بە موستەعیدایەتی لە لای مەلا ڕەحیمی گلەیی مەریوانی‌بۆ ماوەی هەژدە مانگ درێژە بە خوێندن دەدات. پاشان دێتە خزمەت مامۆستا مەلا مستەفای شوێنە و سێ چوار

مانگ دەمێنێتەوە و دوایە دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی سەردەشت و لە کاتێکدا کە (گلنبوی شرح)ی خوێندوە لە لای مامۆستا مەلا ئەحمەدی جەریحی لە گوندی باساوێ جێ دەخوازێتەوە و ماوەی ساڵێک لەوێ دەرس دەخوێنێ.

ناوبراو لە سەر ئەوە کە مەشمول بووە و خۆی بە بنکەی سەربازگیری نەناساندوە قاچاغ دەبێ و بەو هۆیەوە باوکی دەگیرێت و ئەویش لە رووی ناچاریەوە دەچێ خۆی دەناسێنێ و باوکی ئازاد دەکەن و خۆشی تا راگەیاندنێکی تر دەنێرنەوە. بەڵام بە هۆی ئەوە کە پێشهاتی خەرمانانی (۱۳۲۰) واتا (قضیە شهریور) بە شوێن روودانی شەڕی دووهەمی جیهانیدا دێتە پێشەوە و دەوڵەت تێکدەچێ، حاجی مامۆستا سەربازی هەر ناکا.

هەر ئەو ساڵە ناوبراو دەچێتە مێراوێی سەردەشت، لە لای مەلا خەلیلی گۆڕەمەری جێ دەخوازێتەوە بەڵام لەبەر ئەوە کەمدەرس بووە و بە مانگێک دوو دەرسی لە کتێبی (گلنبوی برهان) بۆ خوێندراوە، دوای پرس بە بابی دەچێتە بێشاسب و بەهاری ساڵی (۱۳۲۱)یش دەچێتە سابلاغ، مزگەوتی بازاڕ و لە لای مامۆستا مەلا حوسەینی مەجدی دەست دەکا بە خوێندنی (شرح المواقف) و چوار ساڵان لەوێ درێژە بە خوێندن دەدات.

هەر ئەو ساڵە کە کۆمەڵەی (ژ.ک) دادەمەزرێ مامۆستا دەست دەکا بە هاوکاری کۆمەڵە و بە گەرمی دێتە نێو تێکۆشانی سیاسیەوە. هەر بۆیە دوای دامەزرانی کۆماری مەهاباد لە ساڵی (۱۳۲۵)دا مامۆستا لە لایەن کۆمارەوە دەکرێتە بەرپرسی کاروباری سیاسی ناوچەی سەردەشت.

مامۆستا ساڵی (۱۳۲۶) لە کاتی گەڕانەوە لە سابلاغ، لە گەردەنەی «زمزیران» هەواڵی پێدەگات کە تەورێز کەوتۆتەوە دەستی دەوڵەت و مەلا مستەفای بارزانی بەرەی سەقزی بەجێ هێشتووە.

بەڵێ بەو شێوە کۆماری تازە بنیات نراوی مەهاباد دەڕووخێ و مامۆستاش دەست لە تێکۆشانی سیاسی هەڵدەگرێ و بە عینوانی پەنابەر دەچێتە میراوە و چاوەڕوانی گەڕانەوەی مامۆستا مەلا خەلیل دەبێ کە دوای رووخانی کۆماری مەهاباد دەیبەن بۆ تاران. بە هاتنەوەی مامۆستا، دەست دەکاتەوە بە خوێندن و چوار ساڵ لە سەر یەک بە بێ

ئەوە دەرسێکی بچێ خوێندن درێژە پێ دەدات.

ساڵی (١٣٢٨) لە لای مامۆستا مەلا خەلیل ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێ و لە سەر داوای عەولاغای مەنگور مەشهوور بە عەولاغای بایزپاشای دەچێتە گوندی ترکەشی سەر بە ناوچەی پیرانشار و بە مەلایەتی دادەمەزرێ و مل لە تەدریس دەنێت تا ساڵی (١٣٣٢) کە دەگەڕێتەوە دێیەکەی خۆی (زێوە) و تا ئێستاش کە ساڵی (١٣٨٠)یە هەر لەوێیە و لەو ماوەشدا بە بێ چاوەڕوانی لە خەڵک درێژەی بە پێشنوێژی و دەرسبێژی داوە و وەک ریش سپیەکیش لە نێو خزمەکانی‌دا ماوەتەوە و تا ئێستا زیاتر لە (٢٠) فەقێی ئیجازە داوە.[(١)]

خوا بی پارێزێت!

١ ـ سەرچاوە: لە ڕێکەوتی ١٣٨٠/١/١٠ دا چوومە خزمەتی و ئە و باسانەم لە خۆی بیست و هەروەها ماوەی چەند مانگانیش فەقێی حاجی مامۆستا بووم.

## مامۆستا مەلا «سید سلام»ی سەلامی



کوڕی مەلا «سید احمد ابن الکاژاوی»یە و لە ساڵی (١٢٨٢)ی کۆچی هەتاوی‌دا لە گوندی زێوەی مەلکاری سەردەشت پێی نایە ژیانەوە. لە تەمەنی (٨) ساڵی‌دا، دایک و بابی لەدەست داوە و لەو پەڕی هەژاری و بێ کەسیدا خوێندنی سەرەتایی لە حوجرەی «نەلاس» دەست پێکردووە.

ماوەیەک دواتر چوەتە خزمەت مامۆستا مەلا خەلیل لە میراوێی مەنگوڕان و ماوەیەکیش خزمەت جەنابی شێخ محەممەد ئەمینی بێژوەیی بە نەسیب بووە و لەوێش‌را چوەتە شاری «سلێمانی» عەراق و تا دەست‌پێکردنی کتێبی «جمع الجوامع» لەوێ ماوەتەوە و دوایە سەر لە نوێ گەڕاوەتەوە بۆ ئێران و لە گوندی باغچەی موکریان پاش ماوەیەک خوێندن لە لای بەڕێز مامۆستا مەلا سەید عەبدولکەریم، ئیجازەی مەلایەتی وەدەگرێ. جا دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی بانە و لە گوندی نەمەشیر دەست دەکا بە مەلایەتی وێڕای تەدریس. بەڵام دوای دوو ساڵان بە هۆی ناڕازی بوون بە وەزعی مەلایەتی، بەتایبەت بە شێوەی بەڕێچوون و وەرگرتنی مووچە و بەرات لە خەڵک، بۆ ماوەی (٩) ساڵان دەست لە مەلایەتی دەکێشێتەوە و دەچێتە سەر هێڵی بازرگانی و مامەڵە و بەو هۆیەوە دەتوانێ مڵکێکی زۆر لە گوندی «گەنتکێ»ی گەورکانی سەردەشت بکرێ و ئەمجار بە خەیاڵی ئاسوودەوە دەچێتەوە سەر پیشەی پێشووی و بە ئیشتیایەکی زۆرەوە تا دوا ساتەکانی ژیانی لە دێیەکانی: واوان، نەلاس، لیلانە، رەبەت، هەنداوێ، بەسرێ و گەندکە، درێژە بە مەلایەتی هاورێ لەگەڵ تەدریس دەدا، کە دەیان کەسی لە سەردەستی پێگەیشتن و چەند

فەقێشی ئیجازە دان،کە ئێستا لە ناوچەکانی بانە، سەقز و سەردەشت خەریکی خزمەت بە ئاین و گەلن.

ماموستاکە پیاوێکی هەقگۆ، هەقپەزێر، بەعیززەت و ماندوویی نەناس بوو دوای ژیانێکی سەربڵیندانە سەرەنجام ساڵی (١٣٤٨) دنیای بێوەفای بەجێ‌هێشت و بەرەو دنیای هەرمان کەوتە رێ.(١)

خودا لێی خۆش بێت!

١ ـ سەرچاوە: کوری گەورەی ماموستا، کاک سەید «مەحمود»ی سەلامی، کە ئێستا لە سەردەشتە.



## مامۆستا مەلا صالح نەجیبی ناسراو بە مەلا صالحی گەناو

ئەو پیاوە گەورە سالی (۱۲۷۹)ی کۆچی هەتاوی لە بێژوەی ئالان چاوی بە دنیا هەڵێناوە. خوێندنی سەرەتایی ئەوددەمی لە لای باوکی خوێندوە. دواتر لە خزمەتی شێخەمینی بێژوە هەر لەوێ ماوەیەک فەقێیەتی کردووە. ئەمجار دەستی داوەتە گەڕان و لە ماوەی خوێندندا ڕێی کەوتۆتە لای مامۆستا دەڵگەیی، جەنابی مەلای کۆیە، مەلا «بهاءالدین»ی کۆیی و... لە ئاخریش‌دا هەر لە لای ئەو بەڕێزە ئیجازە وەردەگرێ و ئەگەرچی لە کۆیە داوای مانەوەی لێدەکەن بۆ مەلایەتی بەڵام دەگەڕێتەوە بۆ بێژوێ و لە شوێنی باب و باپیرانی دەست دەکا بە مەلایەتی.

مامۆستا کە زوڵم و زۆری ڕژیمی شایەتی دەبینێ، تێکۆشانی سیاسی ئاوێتەی مەلایەتی دەکا و بە هاتنە پێشی هەرای «مەلا خەلیل» (۱۳۰۷) بەشداری تێدا دەکا و بۆ و مەبەستە مەلاکانی دەوروبەری لە خۆی کۆدەکاتەوە و مەلا صالحی ئەختەتەری کە فەقێی دەبێت، دەکاتە ئاڵاهەڵگر و ناوەندێکی بەرگری لە دێی «مارەغانی» سەردەشت دەکاتەوە. جا بەو هۆیانە دوای سەرکەوتنەوەی دووبارەی دەوڵەت، دەگەڵ مەلا عەبدوڵڵای گەناوی مەلای ئەو کاتی دێی «نەلاس» کە ئەویش بەشداری ڕاپەڕینەکە بووە فەرمانی گرتنیان دەردەچێ و لە ئەنجامدا هەردووکیان باردەکەن بۆ پشدەر و مامۆستا مەلا صالح لە گەناو دەمێنێتەوە و دەست دەکاتەوە بە مەلایەتی و تەدریس و لە ناوچەکانی جۆراوجۆری کوردستانڕا فەقێ، دێنە لای و کەڵکی لێ وەردەگرن.

ئەو بەڕێزە سالی (۱۳۴۲) بەدوای فەوتی خەلیفە «مەلا مەحمود» ئیمامی بێژوەدا، لە سەر داوای خەڵک و خزمەکانی دێتەوە بێژوە و سەنگەری خزمەت بۆ جارێکی دیش دێنێتەوە شوێنی لەدایکبوونی. تا لە ئاخر و ئۆخرەکانی تەمەنی‌دا بینایی لە دەست دەدا و

بە ناچاری دەست لە تەدریس هەڵدەگرێت و بەڵام ئیمامەتی هەینی تا کۆتایی تەمەنی درێژە هەر پێدەدات.

مامۆستا پیاوێکی پارێزگار، بە ویقار، رێزگر و نیشتمانپەروەر بوو و سەرەنجام لە رێکەوتی (٨ی ١١ی ١٣٦٨) لە تەمەنی (٨٩) ساڵیدا دنیای بەجێهێشت و هەر لە دێی بێژوێ لە گۆرستانێک کە بە ناوی خۆی کرایەوە ئەسپاردە کرا. جێی بەهەشت بێ[1]!

---

١ ـ سەرچاوە: کورەکەی خۆی کاک عومەر و نوسراوەیەکی مامۆستا مەلا سابیر رەزگەیی لەبارەی ژیان و بەسەرهاتی مامۆستاوە.



**ماموستا مەلا «عەبدوڕڕەحمان»ی رەحمانی ناسراو بە «مەلا رەحمانی سیسێری»**

ئەو باش مەلایە سالی (١٣٣٧)یکۆچی مانگی ریکەوتی دەوروبەری سالی (١٢٩٦)ی کۆچی هەتاوی لە دێی سیسێری سەردەشت پێی ناوەتە دنیا. لە تەمەنی حەوت سالی‌دا هەر لەوێ لە مەدرسەی دینی ماموستا مەلا سەید حسەین دەستی کرد بە خوێندن. پاشان کە قاضی عەلی سەردەشتی دێتە سیسێر لە لای ئەو درێژە بە خوێندن دەدا و پاش گەڕانەوەی قاضی بۆ سەردەشتیش دەگەلی دەچێ و تا دەگاتە کتێبی (جامی) لە لای دەمێنێتەوە. ئەمجار دەڕواتە کوردستانی عەراق و لە لای باش مەلایانی وەک ماموستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس لە بیارە، شێخ بابەعەلی لە زانایانی سلێمانی، مەلا عارفی بانەیی لە پێنجوێن و... کەلکی وەرگرتووە. ئەمجار گەڕاوەتەوە بۆ مەریوان و ماوەیەکیش لە لای مەلا مەحموودی جوانڕۆیی لە (دەرەتفێ) و ماموستا مەلا باقر لە (بالک) دەخوێنێ و دوایە دەگەڕێتەوە ناوچەی موکریان و لە لای ماموستا مەلا عەلی

وەلزی لە دێی حەمامیانی بۆکان دەگریسێتەوە و وێرای دەرس‌خوێندن، کتێبانێکی زۆری وەک: (تشریح الافلاک، ربع، اسطرلاب و...) دەنوسێتەوە و لە کۆتایی خوێندنەکەشی‌دا دەچێتە خانەقای بورهان و نیزیکەی دوو سـاڵیش لەوێ دەبـێ و دوای تـەواو کـردنی زانستەکانی وەک: (کلام، حکمت، اصول و فقه) لە بەهاری ساڵی (١٣٢٢)ی کـۆچی هەتاوی‌دا لە لای شێخ محەممەد کە یـەکـێکە لە (فـقهای اربـعة) ئـیجازەی مـەلایەتی وەردەگرێ.

مامۆستا لە دەورانی مەلایەتی‌دا لە دێیەکانی: سوغانلوو لە نـاوچەی پـیرانشـار، ئاتابلاغی و بێکۆس لە ناوچەی سابلاغ، سیسێر، رەبەت، قەڵەڕەشێ، دۆڵەتوو، وەڵـیو، زمزیران لە مەڵبەندی سەردەشت، درێژەی بە تەدریس و مەلایەتی داوە و سەرەتای ساڵی (١٣٤٧) چۆتە مزگەوتی سەرچاوەی سەردەشت و تا ساڵی (١٣٧٤) هەر لەوێ لە سەر ئەو پیشە پیرۆزە دەڕوات. بەڵام بە داخەوە ماوەی پێنج‌شەش ساڵێکە بـە هـۆی پـیری بڕستی لێبڕاوە و دەستی لە مەلایەتی هەڵگرتووە و ئێستا گردەنشینە.

مامۆستا مەلا عەبدووڕڕەحمان لە تەمەنی پڕبایەخی مەلایەتییەکەی‌دا سەرەڕای کوێرەوەری و نەداری، رەنجێکی زۆری لە پێناوی رێنوێنی خەڵک و دەرس‌گوتنەوەدا داوە. کەم کەس هەیە لە فەقێیەکانی سەردەشت، بانە، پیرانشار، سابلاغ، بۆکان و... لە لای خۆی یان لە حوجرەی ئەو دەرسی نەخوێندبێ و کەڵکی وەرنەگرتبێ. لە فەقێیەکانی ئەو بەرێزە دەتوانین ئاماژە بکەین بە مامۆستایان: لە سیسێریەکان: مەلا برایم ئیسماعیل‌زادە، مەلا خدری سارتکەیی، مەلا حەسەنی نستانی، مـەلا کـەریم فـیدایـی، مـەلا رەحـیم شەریفپوور، مەلا ئەحمەد گەنمانی و مەلا حەسەن گۆڵەیی و لە غەیری ئەوان مەلا شێخ رەئوفی بێژوەیی، مەلا ئەحمەدی دافیعی، مەلا ئیسماعیل شەمسەددینی، مەلا سـەعید کامەمی و هەروەها مەلا محەممەدی عەزیزی و مەلا ساحێب یوسفی و مەلا ئـەحمەدی دۆنەخۆر لە پیرانشار و مەلا شەفیعی کوڕی و مەلا حسەینی فیردوەوسی و دەیان کەسی دیش.

لە تایبەتمەندییە خدەییەکانی مامۆستا دەتوانین بەوانە ئـاماژە بکـەین: راسـتی، خیرەت، قنیات، لە دنیا گوزەران (زهد)، تا رادەیەکی زۆر، خۆ بە کەم گری بەتایبەت لە

حاند ماموستاکانی و کەسانی پیرتر لە خۆی و دووری لە نارەوا (حەرام).

هەروا ماموستا زۆر هۆگری مەلایەتی و ئەرکەکانی بوو. هەر بۆیەش هەر سێک کورەکەی نایە بەر خوێندنی مەلایەتی و تا ئەوەی بۆ کورە چوکترەکەی (مەلا شەفیع) سجیلی وەرنەدەگرت، مبادا لە قوتابخانەی رەسمی نێونووسی بکا و خوێندنی دینی لە کیس بچێت.

دیسان ئەو بەرێزە زۆر ئەرکناس و بە بەڵێن بوو و سەبارەت بە ئیشێکی کە هەیبوو یا پێی دەسپێردرا هیچ قسوور و کوتاهیەکی نەدە کرد و لە فتواداندا خۆی بە کتێبە باوەرپێکراوەکانەوە بەستبۆوە و زۆر بە پارێز و خاوەن تێبینی بوو.

هەروا لە سفەتە باشەکانی ماموستا ئەوە بوو کە سیلەی رەحمی زۆر بوو و بۆ دۆستان و ئاشنایان و بەتایبەت بۆ ئەو ماموستایانەی دەرزی لە لا خوێندبوون زۆر بە وەفا بوو و رێزی زۆری لێ دەگرتن و قەت بە خراپە باسی نەدەکردن و تێکرا لە پاشە ملەکوتن بەتایبەت سەبارەت بە ماموستاکانی زۆری خۆ دەپاراست و تێدەکۆشا هەڵە و پەڵەکانیان بۆ بپۆشی و بۆیان جێ بکا.(١)

خوای گەورە پایەدار و بێ وەی کات!

---

١ ـ سەرچاوە: حاجی ماموستا مەلا شەفیعی کوڕی و خۆیشم زۆری بە خزمەت گەیشتووم و ماوەیەکیش دەرسم لە خزمەتی خوێندوە.

## قاضی عەلی سەردەشت



قاضی عەلی کوڕی ئەحمەد ساڵی (١٢٨٣)ی کۆچی هەتاوی لە شاری سەردەشت هاتۆتە دنیاوە. لە دەوروبەری (١٠) ساڵیڕا دەبەر خوێندن نراوە و بە باوی فەقێیەتی بە شێوەی خوارێ جێگۆڕکەی کردووە تا بە ئاواتی سەرەتایی گەیشتووە: لەبەرەوە سەردەشت پاشان جستانی ساڵی قاتی واتە ساڵی (١٣٣٦)ی کۆچی مانگی گوندی (دولکان)ی ئالان، بەهاری ئەو ساڵە دووبارە سەردەشت کە پێش ڕەمەزان دەست دەکا بە کتێبی (سەعدینی)، ئەمجار میراوە و دوایەش لە حوجرەکانی واشامەزین، بیژوە، قەلاتە، کۆیە، سابلاغ، خانەقا، پەسوێ گەڕاوە و لەو نێوەش‌دا جارجار، هاتۆتەوە سەردەشت و لە ئاخر و ئۆخری خوێندنەکەشی‌دا دەچێتەوە کۆیە و هەر لەوێش لە ساڵی (١٣٤٧)ی کۆچی مانگی، بەرابەری ساڵی (١٣٠٧)ی کۆچی هەتاوی ئیجازە وەردەگرێ و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەشت. زستانی ئەو ساڵە بە مەلایەتی دەچێتە سیسێر و دوای ساڵێک دێتەوە سەردەشت و تاکۆتایی ژیانی هەر لەوێ خەریکی دەرس‌گوتنەوە، مەلایەتی و قەزاوەت، دەبێ و دوای عومرێک زەحمەت و خزمەت لە تەمەنی (٦٠) ساڵی‌دا لە ڕێکەوتی ٥ی ٣ی (١٣٤٧)ی کۆچی مانگی، بەرابەری ٤ی ٥ی (١٣٤٢)ی کۆچی هەتاوی، ئەمری خوای بەجێ‌هێنا و هەر لە سەردەشتیش ئەسپاردە کرا.[1]

خوا لێی ببوورێت!

١ ـ سەرچاوە: نوسراوەیەکی جەنابی قاضی و کوڕێکی بەناوی حاجی محەمەدی قاضی لە سەردەشت.



## مامۆستا مەلا عەزیز واعیظی ناسراو بە مەلا «عەزیز»ی کۆیی

ناوبراو کوڕی «محمد» کوڕی «اویس» کوڕی «قَرَنی» کوڕی «محمد» کوڕی «شیخە»یە و ساڵی (١٣١٣)ی کۆچی مانگی بەرابەری (١٢٧٢)ی هەتاوی لە شاری کۆیە، گەڕەکی قەڵات لەدایک بووە. تا تەمەنی دە ساڵی لە فێرگەی شێخ مەلا حسەین و مامۆستایانیتر خەریکی فێر بوونی قورئان و نووسین و بڕێک وردە کتێبی ئارەوی و فارسی دەبێ و تا دەگاتە تەمەنی (٢٠) ساڵی لە کۆیە، کەرکوک و حوجرەکانی دیکەی شار و دێی ئەمدیو و ئەودیو بە خوێندنی زانستە جۆراوجۆرەکانی ئایینیەوە کاتی خۆی دەباتە سەر و لە مامۆستایانی وەک: شێخ محەممەد ئەمینی بێژوە، حاجی بابەشێخ، مەلا خەلیل میراوەیی، مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە، شێخ عەلی حیسامووددین و زۆرێکیتر لە مامۆستایانی ناوداری گەرمێن و کوێستان کەڵک وەردەگرێ.

مامۆستا بە شوێن شەڕی یەکەمی جیهانی (١٩١٨-١٩١٤ز) و ڕوخانی ئیمپراتۆری عوسمانیدا دێتە سەردەشت و ساڵی (١٣٧١)ی کۆچی مانگی دەبێتە ئیمام و سەر خەتمی خانەقای بیارە و ساڵی (٧٣)ش دەچێتە سەفەری حەج.

### تێکۆشانی سیاسی

ڕەزاشا کە ساڵی (١٣٠٤)ی هەتاوی چۆە سەر تەخت، چەند فەرمانی دژ بە دینی دەرکردن کە یەکێک لەوان نەهێشتنی خۆ داپۆشینی ژنان (حجاب) بوو، یەکێکیش بە زۆر دەبەرکردنی کۆت و شەڵواری ڕۆژئاوایی و لەسەرنانی شەپکە. کە مامۆستا یەکێک لەو مەلا تێکۆشەرانە بوو، دژی ئەو فەرمانە وێستا و بۆ ئەوەش کە نەکەوێتە بەردەستی ڕژێم

ماوەی (٥) مانگان لە کوردستانی عەراق خۆی حەشاردا. بەڵام لەبەر پێداگرتنی خێزانی لە سەر هاتنەوەی، بە ناچاری هاتەوە سەردەشت و هەر لە یەکەم شەوی هاتنەوەشیدا کە ڕێکەوتی (١٢ی ٤ی ١٣١٧) بوو گیرا و ڕەوانەی تاران کرا و پاش مانەوەی (٣١) مانگ لەوێ و ماوەی چەند مانگێکان لە سنە و ماوەیەکیش دوور خرانەوە (تبعید)، بۆ یەزد، گەڕایەوە نێو ماڵ و منداڵی!

مامۆستای تێکۆشەر و کوڵنەدەر وەک زۆر زانا و لە خواترس بوو، شاعیرێکی بە هەست و نووسەرێکی تواناش بوو. شێعرەکانی مامۆستا کە بە (٣) زمانی کوردی، عەرەبی و فارسی هۆنراونەوە، بابەتی جۆراوجۆر دەگرنە بەر خۆ و خۆیان لە (٥٠٠٠) تاک شێعر دەدەن.

بەرهەمەکانی قەڵەمی مامۆستاش کە بە (٣) زمانی ناوبراون و لە بابەتی زانستەکانی: (قورئانی، حەدیسی، فیقهی، ژیناوەر و مێژوو، ئاقیدە، کەلام، پزیشکی) و چەند زانستی دیکەش دەدوێن، پتر لە (٦٧) کتێب و نوسراوەن.

ناوبراو کە لە ئاخری ژیانیدا مەلای مزگەوتی «دارالسلام»ی سەردەشت بوو دوای یەک عومر تێکۆشان و کوێرەوەری سەرەنجام سەعاتی دوازدە و چارەکی نیوەڕۆی ڕۆژی سێشەممۆ ڕێکەوتی ١٧ی ڕێبەندانی ساڵی (١٣٥٧) بە دەستی بە دەستنوێژەوە لە کاتێکدا کە چاوەڕوانی هاتنی کاتی نوێژ و جەماعەت کردن بوو، لە سەر بەرماڵ و لە پەنا کۆڵەکەیەکی مزگەوت بەرە و قیبلە ڕاکشا و گیانی دەرچوو.[1]

خودا بیبەخشێت!

---

١ سەرچاوە: پێشەکی کتێبی «فتوح سواد العراق»ی مامۆستای ناوبراو بە قەڵەمی نادر کریمیان.

## حاجی مامۆستا مەلا عەلی مەحمودی دولکانی



ناو براو سـاڵی (١٣٣٠) کـۆچی مـانگی لە دولکانی ئالان هاتۆتە دنیا. لە تەمەنی (١٥) ساڵی‌دا چۆتە کۆڕی فەقێیانەوە و سـەرەتای خـوێندنی لە (دەروێنە)ی عەراق لە لای مەلا مـحمد گـروێسی دەست پێ کردووە. لە دەورانـی خـوێندنەکـەی‌دا کـەڵکی زانســتی و پـەروەردەیی و... لە گـەورە پیاوانێکی وەک: مەلا سەید عەبدوڵلای پشدەری، مەلا ئەسعدی مەحوی، مەلا ئەحمەدی دێلیژەیی، حاجی مەلا عەبدوڵلای دێـلیژەیی، حاجی مەلا عەبدوڵلای بێژوەیی لە سلێمانی، مەلا عەبدولحەمیدی بانەیی لە تورجان، مەلا حەسەنی دەشتێوی، کاکە مەلای بێوران، مەلا صاڵحی گەناوی و مەلا شێخ عومەری واشەمەزین وەرگرتووە و لە ئـاخیریش نـەسیبی کـەوتۆتە لای حـاجی مـامۆستا مـەلا محمدی گەلاڵە و ساڵی (١٣٥٩)ی کۆچی مانگی ئیجازەی مەلایەتی پێدراوە.

ئەو بەڕێزە بۆ یەکەمجار سفرەی مـەلایەتی، لە (سـەفرە)ی شـینکایەتی عـەراق دەکاتەوە و دوای دوو ساڵ دەگەڕێتەوە شوێنی لەدایکبوونی و تا (١٤) سـاڵان لە دولکان درێژە بە خزمەتی دینی دەدات، تا ساڵی (١٣٧٥)ی کۆچی مانگی کە لەو کاتەرا دێـتە خانەقای سەردەشت و تا پیری بـڕستی لێ‌دەبـڕێ سـاتێک لە تـێکۆشان نـاکـەوێت و شێلگیرانە لە سەر پێشنوێژی و ڕێنوێنی و دەرس‌گوتنەوە دەڕوات.

حاجی مامۆستا کە زانایەکی دڵسۆز، پارێزکار، لەخواترس، بە قنیات و بێ‌زیان و ڕێزدار و ڕێزدانەر بوو سەرەنجام ساڵی (١٤١٦ک.ما) بەرابەری (١٩ی ١٠ی ١٣٧٤ی ک.ﻫ) وەڵامی پەیکی ئەجەلی دایەوە و بە پێی وەسـیەتی خـۆی ڕەوانـەی گـۆڕستانی (حەوت پیر)ی بێژوە کراو لە پەنای گۆڕی شێخەمین جێی گرتەوە.[١] خوا بیبەخشێ!

---

١ - سەرچاوە: نوسراوەیەکی فارسی مامۆستا مەلا شێخ عەبدوڕڕەئوف نەقشبەندی سەردەشت.



## ماموستا مەلا محەممەدی باساوێ

ساڵی (١٣٣٨)ی کۆچی، لەگوندی (کونەمشکە) هاتۆتە دنیاوە. لە تەمەنی (١٠) ساڵی ڕا پێی خوێندراوە. (١٢) ساڵان لە خوێندن گەڕاوە. لەو ماوەدا چەند جێی پشکنیون و چەند ماموستای ئاڵ و گۆڕ کردوون بۆ نموونە: ڕێی کەوتۆتە باساوە، ئەحمەدبریو، واوان، بێشاسپ لە ناوچەی سەردەشت و لە لای بەڕێزان ماموستا مەلا ئەحمەدی حیکمەتی (جریحی)، ماموستا مەلا عەبدوڵڵای ئەحمەد بریو، ماموستا مەلا عەلی بێشاسپی و لە کۆتاییش دا لە گەناوی عەراق لە خزمەت ماموستا مەلا صالح بێژوەیی دەرسی خوێندووە و هەر لە لای ئەو بەڕێزەش دوای (١٢) ساڵ حەول و تەقالا بە دوای زانست و پەروەردەدا، ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێ و دەگەڕێتەوە بۆگوندی باساوەی سەردەشت و بە مەلایەتی دادەمەزرێ و مل لە تەدریس و ڕێنوێنی خەڵک دەنێت و تا تەمەنی لە (٦٠) تێپەڕ دەکا، لە سەر ئەو پیشە پیرۆزە دەڕوات و پاشان بە هۆی پیری و نەخۆشی دەست لە مەلایەتی هەڵدەگرێ و دەچێتەوە گوندی (کونەمشکە) و دوای ساڵێک مانەوە، دەگوێزێتەوە بۆ شاری سەردەشت و دوای شەش مانگ مانەوە بە نەخۆشی، سەرەنجام وەڵامی پەیکی ئەجەل دەداتەوە و هەر لەوێش تەسلیم دەکرێ.

ماموستا پیاوێکی بە دین، ڕەزا سووک، ژیر، خۆ ڕاگر و قسەخۆش بوو و ئێستاش قسەکانی لە مەجلیسان دەگێڕنەوە.[1]

خوا لێی خۆش بێت!

١ ـ سەرچاوە: ماموستا مەلا شێخ ئەحمەدی شەریعەتی ئیمامی مزگەوتی «دارالسلام»ی سەردەشت.



## خوالێخۆشبوو حاجی مامۆستا مەلا «محمد عظیمی»

کوڕی ڕەسووڵ، کوڕی حسین (ئەسێن)، کوڕی خدر، کوڕی فەقێ ئاڵی کە هەموویان خەڵکی «بە نوو خەڵەف»ی سەربەشاری سەردەشتن. دایکی نێوی فاطمە (فات)ە و خەڵکی گوندی پاشبەردی گەورکانە.

ناوبراو ساڵی (١٣٠٠)ی هەتاوی لە بنەماڵەیەکی هەژاردا چاوی بە دونیا هەڵیناو هەرکە فامی کردەوە نرایە بەر خوێندن بەڵام لە سەرەتادا لە بەر دەست تەنگی باوکی هەلی چوونە ئێرە و ئەوێی بۆ نەرەخسا و نەیتوانی یەکجاری روو بکاتە خوێندن بۆیە هەموو ساڵێک دەگەڵ تەواو بوونی کار وکوێرەوەری رووی دەکردە مزگەوت و لە لای ماموستای ئاوەدانی دەرسی دەخوێند و تەنانەت لە فەسڵی کاریشدا، ئەگەر هەلی بۆ هەڵکەوتبا دەرسی دەخوێند و بە دەم کارکردنەوە دەرسەکانی رەوان دەکرد.

مامۆستا، سێ ـ چوار ساڵ بەم شێوە درێژەی بە خوێندن داو دوایە بە رەسمی رووی کردە حوجرەکان، بەڵام لە بەر نەداری و نەبوونی بەرگ و پیڵاو وکتیب دەگەڵ زۆر گیر و گرفت رووبەروو بوو و واهە بوو لە سەر ئەوە لە حوجرەیەک دەنگیان دەدا و ئەویش کە زۆر تامەزرۆی خوێندن بوو کۆڵی نەدەدا و رووی دەکردە جێیەکی تر و هەر بوویەش ناچار بوو لە مانگی رەمەزاندا بچێتە مەلایەتی و شتێک بۆ خۆی پەیدا بکات.

ئەو بەڕێزە لە کوردستانی ئێران لە سوێسنایەتی و گەورک و ئالانی ناوچەی سەردەشت و لە کوردستانی گەرمێن لە مەرگە و شینکایەتی بە دوای زانست و ئەزموون داگەڕاوە.

**هەندێک لە مامۆستاکانی:**

مامۆستا بە سوختایەتی کەڵکی لەو بەڕێزانە وەرگرتووە: ماموستا مەلا (محرم) مەرگەیی لە لە گوندی بێوری سەرێی سەردەشت و مەلا شێخ ئەمین ئاکۆیی لە دێی «گربداغ»ی ناوچەی پشدەری عەراق کە لە لای ئەو دوو ماموستایە کتێبی (عوامل)ی خوێندوە. ماموستا مەلا موسی لە مەرگەی عێراق و ماموستا مەلا حەسەن گەزنەیی لە بێوری سەروی سەردەشت بو کتێبی (انموذج)، ماموستا مەلا حوسەین کەیوان (کونەمشکەیی) لە گوندی (گەرمکان)ی پشدەر بۆ کتێبی (اظهار).

هەندیک لە ماموستاکانی سەردەمی موستەعیدایەتی مامۆستا بریتین لە: ماموستا مەلا «محمد» مەرگەیی لە گوندی «بنگرد»ی عێراق بو «جامی»، ماموستا مەلا «عبدالله» واوی لە «نەلاس» و ماموستا مەلا رەحیم عەبباسی بۆ «سیوطی و گەلەنبەوی شەرح»، ماموستا مەلا ئیبراهیم سیسیری لە گوندی نستان بو «سیوطی» ماموستا مەلا ئەحمەد تووژەڵی، لە گوندی «شیوەسەڵ بۆ کتێبی «جامی»، مامۆستا مەلا عەلی بێشاسپی و مامۆستا مەلا «محمد» کونە مشکەیی و مامۆستا مەلا حسین دەشتێوی بۆ «حاشیە عبدالله یزدی»، ماموستا مەلا ئەحمەد شەریعەتی، بۆ «شرح العقاید»، ماموستا مەلا «محمد چکە» لە گوندی هێرۆی عیراق بۆ کتێبی «سید عبدالله صرفی» ماموستا مەلا عەلی دولکانی بۆ «گەلەنبەوی ئاداب» و مامۆستا مەلا «صالح» نەجیبی لە «گەناو»ی عێراق.

شایانی باسە کە ناو براو دوای گەرانێگی زۆر لە شار و گوندەکانی ئەم دیو و ئەو دیوی کوردستان بە دوای خوێندن و زانیاری دا سەرەنجام لە خزمەت بەڕێز جەنابی ماموستا مەلا «صالح» نەجیبی کۆتایی بە خوێندنی باوی ئەو سەردەم هێناو هەر لە لای ئەویش ئیجازەی مەلایەتی و تەدریسی وەرگرت و بۆ خزمەتی دین گەرایەوە بۆ زاگەی خۆی گوندی «بەنوخەڵەف» و ماوەی ساڵێک درێژەی بە مەلایەتی و تەدریس دا و پاشان کۆچا بۆ گوندی «قرووچا»ی ناوچەی لاجان و ساڵێکیش لەوێ خزمەتی کرد و ئەمجار بۆ ماوەی دوو ساڵان هاتەوە دێی «شیوەسەڵ» لە مەڵبەندی سەردەشت و دوایە گەڕایەوە بۆ «بەنوخەڵەف» و هەتا ساڵی (١٣٥٨)ی کۆچی هەتاوی لەوێ بە ئیشی پێشنوێژی و

رێنوینی و دەرس گوتنەوە رایبورد و لەو ساڵەش‌دا گوێزتیەوە بۆ گەڕەکی مزگەوتی «دارالسلام»ی سەردەشت و ساڵی (٥٩) لە سەر داوای خەڵک بە پێشنوێژی هەینی (ئیمامی جومعە) شاری سەردەشت دیاری کرا و دەگەڵ هەموو کوێرەوەری و گوشارێک کە لە هەل‌ومەرجی ئەو دەمدا هەبوو درێژەی بە خزمەت دا تا سەرەنجام بە داخێکی زۆرەوە لە سەرەتای شەوی جێژنی رەمەزانی ساڵی (١٣٦٦) دوای گەرانەوە لە جەماعەتی نوێژی شێوان لە بەردەرکی حەوشەی ماڵی خۆی درایە بەرگولله و شەهید کرا.

جێی باسە کە مامۆستای شەهیدمان پیاوێکی هەڵکەوتوو و بە غیرەت بوو، هۆگریەکی زۆری بە خزمەتی دین و زانستە دینی‌یەکانەوە بوو. لێبراوانە بۆ کەم کردنەوەی دەرد و مەینەتەکانی خەڵک بە تایبەت چینی هەژار هەوڵی دەدا و لەو رێیانەشدا زۆری کوێرەوەری و دووری و فەقیری و تاڵی چێشت و لە سەر بە جێ‌گەیاندنی ئەرکی دینی دەستوور بە چاکە و گێرانەوە لە خراپە زۆر سوور بوو و هەر لەو رێیەش دا گیانی بەخت کرد.[1] خودای گەورە عەفووی کات

١ ـ سەرچاوە: لێکۆڵینەوەی کاک «محمد سلیمانی» و رۆژمێری کوردستان لە هاوکاری جەنابی مەلا «محمد»ی حەفیدی کە سپاسی زۆری هەر دوو لایان دەکەم.



## حاجی مامۆستا مەلا مەحموود واوی، نەلاس

ئـەو بـەڕێزە کـە کـوڕی مـەلا «مـحەممەد» لە مەلازادەکانی واوانی سەردەشتە سـاڵی (۱۳۱۷ک.ه) لە گوندی بناوێی سەردەشت هاتۆتە دنیا. سێ ساڵانە بووە کە بـابی لە دەست داوە. دەرسـی رەسـمی تـا شـەشی سەرەتایی لە سەردەشت خوێندووە. پووشپەڕی (۱۳۳۲) دەستی کردووە بە فەقێیەتی و بە هاوڕێیەتی مامۆستا مەلا نجم‌الدین کوکبی، مامۆستا مەلا عبدالکـریم شـاریکەندی، مامۆستا مەلا سەید سەلام سەلامی و مامۆستا مەلا صالح نەجیبی، بەڕیز، لە دێیەکـانی آلواتانی سەردەشت، خەلیفە لیانی نەغەدە، نـەلاس و گـەناوی عـەراق خـوێندویەتی. ناوبراو کە بە فەقێیەکی ناوازە ناسراوە دوای (۹) ساڵ خوێندن واتا سـاڵی (۱۳۴۱) لە گەلاڵە لە لای حاجی مامۆستا مەلا محمد بۆکانی ناسراو بـە مـەلا مـحمدی رەئـیس، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە و لە گوندی مامەزینە دەسـتی کـردووە بـە مـەلایەتی و تەدریس. ناوبراو ساڵی (۱۳۵۷) دەگوێزێتەوە بۆ گوندی نەلاس و ساڵی (۷۲) دەچێتە سەفەری حەج و لەو سەفەرەدا دەگەڵ (بن‌باز) و بەرپرسانی (دارالتوجیه) و (دارالافتاء) دیدار دەکا. حاجی مامۆستا بە مەلایەکی وردبین، بیر تیژ و زانا ناسراوە و بەتایبەت لە مێژوو و فیقەدا دەستێکی باڵای هەیە و ئێستاش هەر لە نەلاس پێشنوێژ و دەرس‌بێژ و خوتبەخوێنە.[۱]

خوا ئاگاداری بێت!

---

۱ - سەرچاوە: بەشێک لە پێناسەکە خودی حاجی مامۆستا لە سەر داوای خۆم بۆی نووسیبووم و بۆ خۆشم



## مامۆستا مەلا «نجم‌الدین» کەوکەبی

ئەو بەڕێزە لە دێی «دیوالان»ی سەردەشت چاوی بە دنیا هەڵێناوە. پاش فامکردنەوە دەستی داوەتە خوێندن و دوا گەڕانێکی کوڵنەدەرانە لە شار و دێیەکانی کوردستان و پشکنینی گەرمێن و کوێستان ئاخرەکەی لە ساڵی (١٣٢٩)ی هەتاوی‌دا لە خزمەت مامۆستا مەلا عەبدوڵلای گەناوی لە گوندی «میرزا رۆستەم»ی کوردستانی گەرمیان ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێ و دەگەڕێتەوە بۆ ئێران و لە «بیۆر»ی خوارێ دادەمەزرێت و مل لە مەلایەتی هاورێ دەگەڵ تەدریس دەنێ. ساڵی (٣٤) دەچێتە «کەوپەڕ»ی پیرانان و پاش چەند، مانگێکان دەچێتە «ئالوەتان» و تا ساڵی (٤٧) کە ئەودەم دەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە رووناکبیرانی پێشکەوتن‌خواز لە مەلا و خەڵکی‌تر، دەگیرێ و راپێچی بەندیخانەی ورمێ دەکرێ و ماوەی نۆ ساڵ و چەند مانگان لەوێ‌دا دەمێنێتەوە. مامۆستا لە زیندانیش‌دا هەدا هەر نادا و لە لایەکەوە بۆ خۆی خەریکی موتالا و خوێندنی زمانی ئینگلیزی دەبێ و لە لایەکی‌تریشەوە دەرسی فەقێ دەڵێت، تەنانەت بە یەکێک لە فەقێکانی بە ناوی «مەلا محەممەد» نیوچوانی خوێندن تەواو دەکا و هەر لە زیندان‌دا وێرای پێک‌هێنانی رێی و رەسمی تایبەت ئیجازەی مەلایەتی پێ‌دەدات.

ناوبراو دوو ساڵ بەر لە سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە زیندان ئازاد بوو و لە گوندی قەڵاتی مەنگوڕان، دەستی کردەوە بە ئیش و کاری مەلایەتی و دوای دوو ساڵ مانەوە،کەوتە ژیانی ئاوارەیی و بە خۆی و ماڵ و منداڵیەوە دایقەڵاشتە خوار بەرەو عەراق و پاش ماوەیەک بردیانە ئوردوگای (رومادیە) و تێکڕا چوار ساڵان لە عەراق مایەوە و ئەمجار گوێزتیەوە بۆ وڵاتی «نروێژ» و لەوێ بە شێوەی کاتی نیشتەجێ بوو. ئەمما داخیگرانم دوای ساڵێک مانەوە، کۆتایی بە ژیانی هات و خۆشبەختانەش لە حاڵی نوێژکردندا لە سەر بەرماڵێ گیانی لێ سەندرایەوە و بۆ لای پەروەردگار گەڕایەوە و هەر لەوێش تەسلیم بە خاک کرا.

خوا بیبەخشێ!

مامۆستاکە مەلایەکی زۆرزان، نەترس و لە خوا ترس بوو ئەهلی قەڵەم و شاعیریش بوو. شێعرەکانی بڵاون و تا ئێستا کۆ نەکراونەوە. یەکێک لە بەرهەمەکانیشی کتێبێکە بە ناوی «رووناکی چاوان» کە وەگێردراوی غەزاوەتنامەی «شێخ ئیبنولحەجەر»ە کە لە فارسیرا وەریگێڕاوەتەوە سەر کوردی و ئێستا چاپ نەکراوە.(١)

---

١ ـ سەرچاوە: جەنابی مامۆستا مەلا عەبدورڕەحمانی فاتیحی مەلای «گردئاشەوان»ی لاجان کە فەقێ و

## سەرنجێک

بێگومان، زانایانی، ناوچەی سەردەشت وەکوو زانایانی هەموو هەرێمەکانی کوردستان، زۆر لەوە زیاترن کە لە چەندین کتێبی ئاوادا ژیاننامەیان بنوسرێ و جێیبێتەوە و تەنانەت هەر لەم چەرخی بیستەمەدا سەتان مەلای زانا و توانا و بەکەڵک بۆ خەڵک بوون و ژیاون و کەس نەبووە لە سەریان بنوسێ و بیانخاتە نێو لاپەڕەکانی مێژوو و بە وەچەکانی دوای خۆیان بناسێنی. وەک ئەوە کە بۆ خۆشیان هەر نەیانویستووە ئەو کارە بکەن!

خۆ هەندێکیان خۆشبەختانە ناسراون و لە کتێبە مێژووییەکان و ئاسەوارەکانی خۆیاندا تۆمار کراون وەکی: «شیخەمین»ی بێژوەیی، مەلا «ئەلیاس»ی گەورە، ناسراو بە (شێخە سوور) کە گۆیا گۆرانگەیی بووە، «یوسف»ی ئەسەمم، شێخ مەولانای سەردەشت، مەلا عەبدوڵلای بێتوشی، مەلا «ڕەسووڵ»ی زەکی، مەلا «کەریم»ی فیدایی، مەلا «محمد ابن الحاج»ی سنجوەیی ئالانی، مەلا «عومەر»ی واشەمەزین، مەلا مەحموود مەزناوەیی، مەلا ئەحمەد جەریحی مەلای غەزایی ڕەبەتی، مەلا ڕەسووڵ عەتووفی بێشاسپی، مەلا ئەحمەد شلْماشی (مەلا ئاوارە)، مەلا محەممەد شلْماشی و... کە ئەوانە بە هەستی شێعر و دەستی قەڵەم و بڕستی بیر و جەستە لە بوارەکانی جۆراوجۆری ڕاژە و خزمەت بە دین و دنیای گەلەکەیاندا وەک پەروەردەی دینی، تێکۆشانی سیاسی، ئەدەبیات و زمان، مێژوو، تەفسیر و زۆر بواری دیکەی، زانستیدا ڕەنجیان بردووە و نێوی خۆیان کردووە.

ناوچەی سەردەشت وەکوو زۆربەی ناوچەکانی تری کوردستان تێیدا هەیە کە هەر بە بنەماڵە و تایفە لە سەر زنجیرەیەکی خزمەت ڕۆیشتون و بەو خزمەتەوە ناسراون وەکی بنەماڵەی: مەلازادەکانی واوان، مەلازادەکانی واشەمەزین، مەلازادەکانی کاژێ، مەلازادەکانی شەمۆڵە، بنەماڵەی بێژوێ، «قاضی»یەکانی سەردەشت، مەلا نێودارەکانی بێتووش، سیسێر و گەلێکی تر لە باش مەلا و بنەماڵە گەورەکان.

کۆتایی

بێگومان فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستاندا کەلەپوورێکی مێژوویی لەمێژینەی گەلی موسوڵمانی کوردەکە بەداخەوە تا ئێستا کەس لە سەری بە ئەسڵی نەدواوە و نەهاتۆتە سەر پەڕەی قاقەزەوە. ئاشکراشە کە جەستەی ئەم گەلە موسوڵمانە، مانەوەی بە خوداناسی و عیرفان و زمان و ئەدەب و جل و بەرگ و رامیاری و شۆڕشگێرییەوەیە.

راستی‌یەکی حاشاهەڵنەگرە کە بەردی بناغەی خوداناسی و عیرفان و ئەدەبی کوردی و شۆڕشگێڕی لەو چوار دیوارە دووکەڵاوییە، تورماوە قوڕینەدا کە بە حوجرە ناودەبرێ دامەزراوە و لەوێوە هاتۆتە دنیای ژینەوە و فرچکی گرتووە و کەوتۆتە گڕوگاڵ و لە خەم رەخسیوە و هەتا دوا رۆژی ژیانی ئەم گەلە لە عاسمانی کوردەواری‌دا وەک ئەستێرەیێکی پڕشنگدار دەدرەوشێتەوە و بێ ئاوابوون لە کەلی ئاسۆی گەلی کورددا شۆق دەداتەوە. ئەگەر وا هەڵکەوتبێ ئەدەبی کوردی لە دەم زاری نەخوێندەواری دوور لە شارستانییەت هاتبێتە دەر، یان بە دەم بەیت‌بێژانەوە گوترابێ، ئەو کەسانەی رەنگاندوویانە و بە جل و بەرگ‌و بەرموور و خشڵ رازاندوویانەتەوە، ئەو مامۆستا و نووسەر و ئەدیبانە بوون کە لە حوجرەی فەقێیان سەریان هەڵداوە و لەوێڕا تیشوویان هێناوە.

پێم بەجێیە وەک سەنەدێکی مێژوویی ئەو چەند دێرە لە خوداڵێخۆشبوو، مامۆستا علاءالدین سەججادی لە مێژووی ئەدەبی کورد لاپەڕەی (۴۰۱) بگوێزمەوە: «لە ناو چواردیواری شڕرو دووکەڵاوی حوجرەی مزگەوتی شارستان و لادێیەکانا بە ژیانێکی زۆر سادە و کوڵەمەرگی بەخێو ئەکران؛ علما و ئودەبا و شاعیری زۆر گەورە گەورەیان لێ‌دەرچووە. وە ئەگەر عالەمی کوردی تا سەرەتای سەدەی بیستەم لە ئاسمانی خوێندەواریدا، لە عالەمەکانی ترەوە دیار بێ ئەستێرەی گەشی ئەو ئاسمانە تەنها ئەم تیرەیە بوون. جا بەم بۆنەوە هەموو پیاوێکی گەورە و بەگزادە لە کوردەواریدا شانازی بەوەوە کردووە کە تێکەڵاوی ئەم تیرەیە بێ وە بە پێی دەسەڵات خۆی و کوڕەکەی فێری ئەو خوێندنە بکات....»


ISBN 964-356-121-6



نشر احسان

فروشگاه مرکزی: تهران، خیابان ناصر خسرو، کوچه حاج نائب، تلفن: ۳۹۰۲۷۵۰
فروشگاه: تهران، خیابان انقلاب، روبروی دانشگاه تهران، مجتمع فروزنده، طبقه اول، شماره ٤٠٦، تلفن: ۶۹۵۴۴۰۴